**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

## جوگرافیای دانیشتوان

- نووسینی: د. فەوزی عەبد سهاونە — د. موسا عەبودە سمحە
- وەرگێڕانی: هیوا ئەمین شوانی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: چیمەن حەسەنی
- ژمارەی سپاردن: ٩٢٥
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠٠٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٣٨٤)**



**هەموو مافێکی بۆ دەزگای موکریانی پارێزراوە**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com




## ناوەڕۆک

## پێرستی خشتەکان

## پێشەکی

ئەگەر بتەوێ ڕۆمانێك وەربگێڕیتە سەر زمانی کوردی بەدەگمەن ڕووبەڕووی وشەیەك دەبیتەوە کە لەزمانی کوردیدا نەبێ، چونکە کورد کولتوور و کەلەپوورێکی دێرین و دەوڵەمەندی هەیە و لە وەرگێڕانی بابەتە ئەدەبییەکاندا دەستەودامان نابی، وەرگێڕانی بابەتی زانستی بۆ زمانی کوردی بە پێچەوانەی بابەتی ئەدەبییەوە کارێکی دژوارترە، چونکە زمانی کوردی لە ڕووی چەمکە زانستییەکانەوە بەو ڕادەیە نییە کە بتوانی حەقی تەواو بە بابەتێکی زانستی بدەی لەکاتی وەرگێڕانیدا، بۆیە بێشك و گومان لە کاتی وەرگێڕانی بابەتی زانستی ڕووبەڕووی ئەم گرفتە دەبیتەوە، هەر ئەو هۆکارەش وای کردووە کە تەوژمی وەرگێڕان لە کوردستان کەمتر خۆی لەقەرەی بابەتە زانستییەکان بدا، ئەمەش بەدیوێکی دیکەدا دیسان وای کردووە زمانی کوردی لە ڕووی چەمکە زانستییەکانەوە لەشوێنی خۆی بوەستێ و پێشکەوتن بەخۆوە نەبینێ، باشترین نموونەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەموو کۆلیژە زانستییەکانی کوردستان هەر بەزمانی ئینگلیزی دەخوێنن.

لەماوەی چوار ساڵ خوێندنم لەبەشی جوگرافیای زانکۆی سەلاحەددین و دوو ساڵیش خوێندنی ماستەر دەتوانم بڵێم بابەتی وەرگێڕدراو لەبواری جوگرافیا بەهەموو لقەکانیەوە نەبوو، هەڵبەتە مەبەستم نوسین نییە، چونکە کاری نوسین لەبواری جوگرافیا هەبوون هەرچەندە کەمیش بوون، بەلاّم تەواوی سەرچاوە سەرەکییەکانی ئەم بوارە عەرەبی بوون.

هەستی بەرپرسیارێتی سەبارەت بە کەموکوڕی لە پسپۆڕییەتییەکەی خۆم و ئەو دەردەسەریانەی کە قوتابیانی بەشی جوگرافیا لەکاتی نوسینی لێکۆڵینەوەکانیاندا دەیانچەشت، هاندەری سەرەکیم بوون لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە،



هەڵبەتە گرنگی و پڕبایەخی کتێبەکەش جێگەی باسن، چونکە ئەم بەشەی جوگرافیا کە جوگرافیای دانیشتوانە دەتوانم بڵێم ڕووحی ئەم زانستەیە، بەتایبەت لە بەشە مرۆییەکەی.

وێڕای ئەوانەش نووسەرانی ئەم کتێبە کەسانی پسپۆڕ و ناسراون لە بواری زانستی جوگرافیادا و نووسین و لێکۆڵینەوەکانیان جێگەی گرنگ و بایەخپێدانی قوتابیان و پسپۆڕانی ئەم زانستەن.

دواجار دەبێ ئەوە بڵێم ئەم کتێبە بە شێوەیەکی زۆر زانستیانە و تێروتەسەل و لە ڕوانگەیەکی جوگرافیایانەی زانستییەوە مەسەلەی دانیشتوانی خستۆتە بەر باس، جاروباریش لایەنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی دانیشتوانیشی بەسەر کردۆتەوە، بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی سەرچاوەیەکی زۆر بە پێز و دەوڵەمەندە بۆ بەشی جوگرافیا.

**وەرگێڕ**
**شوان- کوردستان**
**٢٠٠٨/٨/١٥**

# دەروازە

لێکۆڵینەوەی زانستیانەی دانیشتوان بە زانستگەلی پێکبەستە و تێکچڕژاو لەگەڵ بابەتە هاوشێوەکان دادەنرێ، کە دیموگرافیستەکان و جوگرافیناسان و کۆمەڵناسان و زانایانی رگەزناسی مرۆیی و دەروونناسان و سیاسەتوانان و ئابووریناسان و زیندەوەرناسی و تەنانەت فەیلەسووفانیش دەگرێتەوە.

لە پشت ئەم هەوڵەوە ئامانجمان فەراهەمکردنی پێشەکییەکە لە بارەی جوگرافیای دانیشتوان بۆ قوتابیان، هەروەها لە پێناو فەراهەمبوونی ئەم جۆرە هەوڵە دەبێ پرس و راوێژ بە زانستە جیاوازەکان بکەین و کۆیانبکەینەوە تا ببێتە کتێبێك و ئاسان مامەڵەی لەگەڵ بکرێ. سەرەتا بە لێکۆڵینەوەی گەشەی دانیشتوان دەستمان پێکرد تا گرنگیدان بە دیراسەکردنی دانیشتوان لە دایك ببێ، پاشان باسمان لەو داتا دانیشتوانیانە کردووە کە بە شتگەلی پێویست دادەنرێن بۆ تێگەیشتن لە پرۆسەکانی دانیشتوان. ئینجا باسمان لە دابەشکردنی دانیشتوان و پێکهاتەی دانیشتوان کردووە، دوای ئەوانە تیۆرەکانی گەشە و گۆڕانی دانیشتوانمان خستۆتە بەرباس، بەوەش رێگامان بۆ خۆشبوو تا بچینە سەر پرۆسە سەرەکییەکانی دانیشتوان: مردن و پیتداری و کۆچ. لەبەشەکانی کۆتاییشدا باسمان لە پەیوەندی نێوان دانیشتوان و ژینگە و دەرامەتەکان و فەراهەمکردنی خۆراك کردووە.

هیوادارین بەم هەوڵە ئامانجەکەمان پێکابێ لە خزمەتکردن لە توێژەران و لێکۆڵەرانی ئەم بوارەی مەعریفەی مرۆیی.



# پێشەکی

ساڵی ٢٠٠٢ ژمارەی دانیشتوانی جیهان گەیشتە (٦,٢) بلیۆن کەس، ئەم ژمارە بەرزەش لەسەرەتای سەدەی نوێدا کار دەکاتە سەر چەند بارەکردنەوەی توانای زەوی لەفەراهەمکردنی پێویستی بۆ ئەو ژمارە زۆرەی خەڵك.

رۆژانە (٢٣٠٠٠٠) کەس سەرباری دانشتوانی جیهان دەبن، بۆیە پێویستە جوگرافیناسان هۆکار و ئەنجامەکانی ئەم گەشەکردنە بگەیەننە تەواوی خەڵك، روانگەی جوگرافیایی گرنگییەکی زۆری هەیە لە روونکردنەوە و تەفسیرکردنی جیاوازی گەورەی نێوان شوێنێك و شوێنێکی تر، بەتایبەت ئەو جیاوازییانەی پەیوەستن بە رێژەی لەدایکبوون و مردن و جۆرەکانی جووڵەی دانیشتوان، زۆرترین رێژەی زیادبوونی دانیشتوان دەچێتە سەر دانیشتوانی وڵاتانی دواکەوتوو، کەچی لە وڵاتانی پێشکەوتوو ئەو زیادبوونەی دانیشتوان نییە، هەروەها ئەگەری زۆری هەیە ئەو جیاوازییە کار بکاتە سەر فاکتەرەکانی تر، بەتایبەت کۆچی نێودەوڵەتی، کە بۆتە گەورەترین گرفتی سەدەی بیست و یەك.

## جوگرافیای دانیشتوان

ئاسان نییە جوگرافیای دانیشتوان لە لقەکانی تری جوگرافیا جیا بکەینەوە، ئەوەش بەهۆی سروشتی لێکۆڵینەوە دانیشتوانییەکان کە هاوبەشە لەگەڵ زانستەکانی تر.

جوگرافیای دانیشتوان تارادەیەك لقێکی تازەیە لە لقەکانی جوگرافیا، وێرای بایەخدانی جوگرافیناسان بە تایبەتمەندییە دانیشتوانییەکان، وەکو بەشێك لە لێکۆڵینەوە هەرێمیەکان، لە ساڵی (١٩٦٦) (زیلنسکی) جوگرافیناس ئەم پێناسەیەی سەبارەت بە جوگرافیای دانیشتوان خستەروو: "دەتوانین بڵێین جوگرافیای دانیشتوان ئەو زانستەیە لەو رێگایانە دەکۆڵێتەوە کە بەهۆیانەوە تایبەتمەندی جوگرافی شوێنەکان پێکدەهێنێ، هەروەها لە شوێن و کاتدا لەگەڵ دیاردە دانیشتوانییەکان کارلێك دەکا. هەروەها (زیلنسکی) دەڵێ: جوگرافیای دانیشتوان گرنگی بە سێ ئاستی جیاواز دەدات کە ئەمانەن:

١- وەسفکردنێکی سادەی شوێنەکە و ژمارەی دانیشتوان و تایبەتمەندییەکانی.

٢- راڤەکردنی شوێنجێی ئەو ژمارانە و تایبەتمەندییەکانی.

٣- شیکردنەوەیەکی جوگرافی بۆ دیاردەی دانیشتوان.

(بۆگوار کارنبر) بەم شێوەیە رای خۆی لەبارەی جوگرافیاوە دەربڕیوە: "ئەگەر دیموگرافیا حەقیقەتە دیموگرافییەکان بپێوێ و لێکیان بداتەوە، ئەگەر مێژوونووس شوێن پێی پێشکەوتنی مێژوویی حەقیقەتە دیموگرافییەکان هەڵبگرێ، ئەگەر کۆمەڵناس لە رێگای چاودێریکردنی کۆمەڵگای مرۆییەوە، بەدوای هۆکار و ئەنجامەکانی حەقیقەتە دیموگرافییەکانەوە بگەڕێ، ئەوە ئەرکی جوگرافیایە حەقیقەتەکان وەکو ئەوەی لە ژینگەکانیاندا هەن وەسفدەکات، هەروەها هۆکار و تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی و ئەنجامە کەڵەکەبووەکانی سەری دیراسە دەکات".



لە روانگەی ئەوەوە دیراسەکردنێکی جوگرافیانەی دانیشتوان جەخت دەکاتە سەر سێ لایەن:

١- دابەشکردنی دانیشتوان لەسەر رووی زەوی.

٢- پەرەسەندنی کۆمەڵگا مرۆییەکان.

٣- مەودای ئەو سەرکەوتنەی کە جوگرافیا لەو کۆمەڵگایانەدا بەدەستی هێناوە.

لە ساڵی (١٩٧٢) (جۆن کلارك)ی جوگرافیناس پێناسەیەکی سەبارەت بە جوگرافیای دانیشتوان خستەروو کە دەڵێ: جوگرافیای دانیشتوان لە دابەشکردن و پێکهاتە و کۆچ و گەشەی دانیشتوان و پەیوەندی ئەوانە بە جیاوازییە شوێنییەکان لە سروشتی شوێنەکان، گرنگی بەدەرکەوتنی جیاوازییە شوێنییەکان دەدات. لە ساڵی (١٩٧٦) (کۆرگۆ)ی جوگرافیناس شتێکی زیاتری خستەسەر ئەو پێناسەیە و وتی: دیموگرافیا و جوگرافیای دانیشتوان گرنگی بە یەك بابەت دەدەن، ئەویش دیراسەکردنی مرۆڤە، ئەو دوو زانستە لە بنەرەتدا زانستگەلی چەندێتین و داتای ئاماری بەکاردەهێنن و روانگەی بابەتیانە بونیاد دەنێن. جیاوازی بنچینەیی نێوان ئەم دوو زانستە ئەوەیە: دیموگرافیا جەخت دەکاتە سەر (کات)، بەڵام جوگرافیا جەخت دەکاتە سەر (شوێن).

دەستپێك: ئەم بەشە ئامانجی هەڵوەستەكردنە لەسەر رەوشی دانیشتوانی جیهان، هەروەها رەوشی دانیشتوان لە چوارچێوەیەكی مێژوویی فراوان و گرتنەبەری ئاراستەی دانیشتوانییە هەنوویی‌یەكەیی و داهاتووییەكان. ئەگەر زانیمان ئێمە لە كوێداین و چۆن گەیشتووین بەم رەوشەی ئێستای دانیشتوان، ئەوە پەی بە ئادگارەكانی داهاتووی دیموگرافی خۆمان دەبەین، شەش ملیار دانیشتوان كە ئێستا لەسەر رووی زەوی نیشتەجێن، رووبەرووی ئەگەری بەشداریكردنی چوار ملیار كەسی تریش دەبنەوە (لەماوەیەكی زەمەنی كورت بەر لەوەی كۆنترۆڵكردنی گەشەكردنی دانیشتوان تەواو بكرێ) ئەگەر گۆڕانێكی دراماتیكی روو نەدات ئەوە كارەساتەكە لەناومان دەبا.

## پێوانەی گەشەسەندن و گۆڕانی دانیشتوان

هەر تێگەیشتنێك لەو رێگایەی كە پرۆسە دانیشتوانییەكان دەیگرنەبەر بۆ دروستكردن و چاكسازیكردنی قەبارە و پێكهاتەی دانیشتوان لە هەرێمێكی دیاریكراو، پێویستە پێوەرە جیاوازییەكانی گەشەكردن و پێكهاتەی دانیشتوان بناسێنرێن:

### هاوكێشە دیموگرافییە بنەرەتییەكان

قەبارە بە یەكەم سیفەتی بنەرەتی بۆ هەر كۆمەڵەیەكی دانیشتوانی دادەنرێ، دانیشتوانی هەموو ناوچەیەك ئەگەری زیادبوونی هەیە، ئەوەش یا بەهۆی لە دایكبوونە لە هەمان ناوچە یا بەهۆی كۆچەوە لە ناوچەكانی ترەوە بۆ ئەم ناوچەیە، بەهەمان شێوە ئەگەری كەمبوونەوەی دانیشتوان لە هەموو ناوچەیەك هەیە ئەوەش یا بەهۆی مردنی كەسانی ناوچەكەیە یا بەهۆی كۆچی خەڵكی ئەو ناوچەیەیە بۆ ناوچەكانی تر، پرۆسە سەرەكییەكانی دانیشتوان بریتین لە لەدایكبوون و مردن و كۆچ، ئەو پرۆسە دیموگرافییە بنەڕەتیانەش دەكرێ پێكەوە رێك بخرێن تا ئەم هاوكێشەیە دروستببێ:

FP=SP+B-D+I-O

**کەوایە:**

FP: ژمارەی دانیشتوان لە کۆتایی ماوەی زەمەنی

SP: ژمارەی دانیشتوان لە سەرەتای ماوەی زەمەنی

B: ژمارەی لەدایکبوون لەماوەی زەمەنی

D: ژمارەی مردن لە ماوەی زەمەنی

I: کۆچی ناوخۆیی لەماوەی زەمەنی

O: کۆچی دەرەکی لە ماوەی زەمەنی.

## تێکرای زیادبوونی سروشتی

تێکرای زیادبوونی سروشتی دانیشتوانی هەر کۆمەڵگایەك یەکسانە بە رێژەی لەدایکبوونی گشتی دەرهێنانی رێژەی مردن، واتە: رێژەی زیادبوونی سروشتی = رێژەی لەدایکبوونی گشتی – رێژەی مردنی گشتی.

بەڵام رێژەی لەدایکبوونی گشتی دەکرێ بەم شێوەیە هەژمار بکرێ:

ژمارەی لەدایکبوون لە ساڵێکی دیاریکراو
———————————— ×١٠٠٠
ژمارەی دانیشتوان لە ناوەراستی ساڵ

رێژەی لەدایکبوونی گشتی جیهان (٢٣) کەس بووە بۆ هەر هەزار کەس لە ساڵی (١٩٩٨) هەروەها رێژەی لەدایکبوونی خاو تا ئاستێکی بەرز کاریگەرە بە پێکهاتەی تەمەنی و جۆری دانیشتوان.

دەکرێ رێژەی مردنی گشتی بەمشێوەیە هەژمار بکرێ:

ژمارەی مردن لە ساڵێکی دیاری کراو
———————————— ×١٠٠٠
ژمارەی دانیشتوان لە ناوەڕاستی ساڵ



رێژەی مردنی گشتی جیهان (٩) کەس بووە بۆ هەر هەزار کەسێك لە ساڵی (١٩٩٨)، رێژەی لەدایکبوون بەشێوەیەکی فراوانتر کاریگەرە لە رێژەی لەدایکبوون بە پێکهاتەی دانیپشتوان، بۆیە بەراوردکردنی نێوان وڵاتان دەبێ بە وریاییەکی زۆرەوە ئەنجامبدرێ، هەروەها رێژەی لەدایکبوون و رێژەی مردن و رێژەی زیادبوونی سروشتی بۆ هەر هەزار کەسێك لەدانیشتوان حیساب دەکرێ، لە ژێر تیشکی ئەوەی پێشتر، ئەگەر رێژەی لەدایکبوونی گشتی جیهانی (٢٣) کەس بێت بۆ هەر هەزار کەسێك و رێژەی مردنی گشتی (٩) کەس بێت بۆ هەر هەزار کەسێك، ئەوە رێژەی زیادبوونی سروشتی لە جیهان یەکسانە بە (٢٣-٩ = ١٤ بەهەزار)، بەهەمان شێوە دەکرێ رێژەی زیادبوونی سروشتی هەر وڵاتێك لە جیهان هەژمار بکرێ، شایانی ئاماژە پێکردنە رێژەی زیادبوونی سروشتی لە هەر وڵاتێك یەکسان نییە بە رێژەی گەشەی دانیشتوان، چونکە کاریگەری کۆچ ناچێتە ناو حیسابی رێژەی زیادبوونی سروشتی، لە راستیدا لەسەر ئاستی جیهان بەگشتی رێژەی گەشەسەندنی دانیشتوان یەکسانە بە رێژەی زیادبوونی سروشتی، چونکە تاکو ئێستا لەسەر گۆی زەوییەوە کۆچ بۆ هەسارەکانی تر یا بە پێچەوانەوە رووی نەداوە.

## رێژەی گەشەی دانیشتوان

رێژەی گەشەی دانیشتوان بریتییە لە پێوانەی رێژەی زیادبوونی دانیشتوانی ساڵانە، ئەگەر توخمی کۆچ وەلا بنێین ئەوە رێژەی زیادبوونی سروشتی خۆی رێژەی گەشەی سروشتی دانیشتوانە، ئەمەش بەرێژەی سەدی پێوانە دەکرێ، واتە رێژەی زیادبوونی سروشتی دانیشتوانی جیهان کە دەگاتە (١٤) بە هەزار، دەتوانین بڵێین ئەوە رێژەی سروشتی دانیشتوانی جیهانە بە رێژەی (١,٤٪) ساڵانە. هەڵبەت دەبێ رەگەزی کۆچ لەبەر چاو بگرین و لەزۆربەی حاڵەتەکاندا، بەشێوەیەك رێژەی گەشەی دانیشتوان جیاواز دەبێ لە رێژەی زیادبوونی سروشتی، تارادەیەکیش کاریگەرییە رێژەییەکانی زیادبوونی سروشتی و کۆچ بەشێوەیەکی پێچەوانە پەیوەستە بە قەبارەی

دانیشتوان لەناوچەی لێکۆڵینەوە، کاتێك کە کۆچ هیچ ڕۆڵێکی نییە ئەگەر جیهان وەکو یەك یەکە لەبەرچاو بگرین، کەچی کۆچ ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕێ لەسەرئاستی هەرێمایەتی بەگوێرەی کیشوەر و وڵاتان، دەشێ ڕۆڵی کۆچ زۆر گەورەتر بێ لە ڕۆڵی زیادبوونی سروشتی لە ڕێژەی گەشەکردنی دانیشتوان. بۆ وێنە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕێژەی زیادبوونی سروشتی دەگاتە (٠,٦٪)، کەچی لە ساڵی (١٩٩٨) ڕێژەی گەشەی دانیشتوان گەیشتە (١٪) و جیاوازی نێوان ئەو دوو ڕێژەیە ئەنجامی کۆچی ناوخۆیی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٩٨) و بەشێوەیەکی تر (٦٠٪)ی گەشەی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەتەواوەتی زیادبوونێکی سروشتییە و (٤٠٪)یش بەتەواوەتی پوختەی کۆچ.

چەندبارەبوونەوەی کاتی دانیشتوان (ماوەی چەندبارەبوو) بریتییە لە ژمارەی ئەو چەند ساڵانەی کە پێویستە بۆ چەند بارە بوونەوەی قەبارەی دانیشتوان، بەو گریمانەیەی کە دەڵێ: دانیشتوان لەگەشەکردن بەرێژەی گەشەی ساڵانەی دیاریکراو بەردەوام بێت، ئەو گەشەسەندنە هاوشێوەی زیادبوونی ئەو پارەیەیە کە لە بانك لە حیسابی سوود هەڵگیراوە. لەهەردوو حاڵەتەکەدا سوودەکە پێکهاتە دەبێت و بە ئاسانی ماوەی پێویست دەخەملێنرێ بۆ چەند بارەکردنەوەی هەر کۆمەڵگایەکی دانیشتوانی بەدابەشکردنی (٧٠) بەسەر ڕێژەی گەشەی ساڵانەی دانیشتوان، کەوایە ڕێژەی گەشەی ساڵانەی دانیشتوانی جیهان کە دەگاتە (١,٤٪) واتە کاتی پێویست بۆ چەندبارەکردنەوەی ژمارەی دانیشتوانی ئێستای جیهان (٥٠) ساڵە، ئەوەش بەگریمانەی ئەوەی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان (١,٤٪) بەدرێژایی ماوەی داهاتوو بەردەوام دەبێ.

## گەشەی دانیشتوان لە جیهان

لەم بەشەدا تیشك دەخەینە سەر گەشەی دانیشتوان هەر لەسەردەمی پێش مێژووەوە تا دەگاتە سەردەمی ئێستا. پاشان گەشەی دانیشتوان لە جیهان بەگشتی دەخەینە بەر باس تا دەگاتە سەرەتای سەدەی بیستەم و دواتر قسە لەسەر گەشەی



دانیشتوان دەکەین لە کیشوەر و وڵاتان و هەرێمەکان. هەروەها گەشە لە وڵاتە دواکەوتوو و پێشکەوتووەکان، ئینجا جیاوازی گەشەی دانیشتوان لە نێوان ئەو هەرێمانە، لەڕاستیدا ئێمە چەمکی وڵاتانی پێشکەوتوو و دواکەوتوو بەپشت بەستن بە ئاستی پەرەسەندنی ئابووری بەکار دەهێنین.

## کورتەیەك لەبارەی گەشەی دانیشتوانی جیهان

سەرەتا جێی خۆیەتی تیشك بخەینە سەر ئەوەی کە چۆن دانیشتوانی جیهان گەیشتە ئەم ڕەوشەی ئێستای (٦,٢) ملیار کەس، بە ڕێژەی گەشەی ساڵانە (١,٤٪)، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانین لەرەوشی ئێستای دانیشتوان تێبگەین، هەروەها بۆ ئەوەی بتوانین پێشبینی بۆ داهاتووی ئەو زیادبوونەی دانیشتوان بکەین. ئەو ژمارانەی سەرەوە ئاماژە بە ژمارەی دانیشتوانی جیهان بەرێژەی (٨٤) ملیۆن کەس زیاد دەکا، سەرباری ئەو ژمارەیەی ئێستا کە گۆی زەوی بە دەستیەوە دەناڵێنێ، ئەو ژمارەیە یەکسانە بە دوو ئەوەندەی دانیشتوانی باشووری ئەفریقیای هەموو ساڵێك. هەر سێ ساڵ جارێك نزیکەی ژمارەی دانیشتوانی جیهان هێندەی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکان زیاد دەکات. زۆربەی جوگرافیناسان و دیموگرافیناسەکان پێیان وایە ناکرێ ئەو ڕێژەیەی گەشەکردن بە شێوەیەکی هاوشێوە لەسەرجەم هەرێمەکانی جیهان بەردەوام دەبێ.

هەروەك (freedman-1974) ئاماژەی بەوەدا ئەو ڕێژە گەشەکردنەی کە دانیشتوانی جیهانی پێ وەسفدەکرێ بریتییە لە لادانێکی کاتی لەڕێژەی گەشەی ساڵانە کە لەماوەی مێژوویی مرۆڤایەتیدا باوبووە، پێویستە جارێکی تر لە داهاتوودا وەکو جارانی لێبێتەوە. دۆخی هەنووکەی گەشەی خێرایی دانیشتوان لەمێژوویی دیموگرافیادا دەگمەن بووە، چ لەرووی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان و چ لەرووی قەبارەی ڕەهای دانیشتوانی جیهان. لەمیانی زۆربەی ماوە مێژووییەکانی دیموگرافیای مرۆیی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان زۆر لەسەرەخۆ بووە، بۆ وێنە ڕێژەی

زیادبوونی ساڵانە ڕەنگە نەگەیشتبێتە (٠,١٪) ، واتە هەر (٧٠٠) ساڵ جارێك ژمارەی دانیشتوان دووجا بۆتەوە، تا ناوەڕاستی سەدەی هەڤدە، دوای ئەوە گەشەی خێرایی دانیشتوان دەستیپێکرد. ئەو خێراییەش سەرەتا لەسەرخۆ بوو پاشان لەناوەڕاستی سەدەی دوانزە بەشێوەیەکی سەرنجراکێش خێراتر بووە.

ئێستا زانیارییەکانی ئێمە سەبارەت بە کۆی دانیشتوان بەدرێژایی مێژوو تەنها خەملاندنە، توێژەرانی دیموگرافی سەرجەم بەڵگە شیاوەکانیان بۆ دۆزینەوە بەکارهێناوە وەك (هەڵکۆڵینی شوێنەواری و پرۆسەی پشت بەستن بە کلێساکان و تۆماری هاوسەرگیری و مردنەکان)، ئەوەش لەپێناو چینەوەی چیرۆکی فراوانبوون و هێرشی مرۆیی لەسەرخۆ و فراوانبوون لەرووی ژمارە و ئەو زەوییانەی کە داگیرییان کردوون.زانیارییەکانی ئێمە سەبارەت بە قەبارەی دانیشتوان و ڕێژەی گەشەکردنی دانیشتوان تەنها خەملاندن و بیروبۆچوونە، چونکە سەرژمێری و کۆی ڕێکخستنی داتا دانیشتوانییە ڕێکخراوەکان تا بەر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە نەبووە. یەکەم سەرژمێری تەنها لەهەندێ شوێنی کەم ئەنجامدەدرا، بەڵام زانیارییەکانیان جێگای مشتومڕە، تەنانەت لەکاتی ئێستاشدا زانیاری پشت پێ بەستراو لەبارەی نیوەی دانیشتوانی جیهانەوە نییە.

خەملاندنی ژمارەی دانیشتوانی سەدەکانی پێش مێژوو ناتەبایی و بیروڕای جیاواز لەخۆ دەگرێ، بەشێوەیەکی گشتی لەسەر گریمانە لەبارەی توانای وەرگرتنی زەوی و توانای دابەشکردنی دانیشتوان بونیادنراون (واتە توانای زەوی لە گرتنەخۆی ژمارەیەکی دیاریکراوی دانیشتوان لە ئاستێکی تەکنەلۆژی دیاریکراو)، (١٩٦٠-Deevery) ژمارەی دانیشتوانی پێش ملیۆنێك ساڵ بەنزیکەی (١٢٥٠٠٠) کەس داناوە، بەگوێرەی خەملاندنەکانی ئەو گەشەی ئەو ڕێژە دانیشتوانە زۆر لەسەرخۆ بووە، بەشێوەیەك بەر لە (٢٥٠٠٠) ساڵ گەیشتووەتە (٣,٣) ملیۆن کەس، پاشان زیادی کردووە و گەیشتووەتە (٥,٣) ملیۆن کەس پێش هەزار ساڵ، لەگەڵ سەرەتای ساڵی زایینی (Deevery) خەملاندنی تری خستۆتە روو، کە دەڵێ ژمارەی



دانیشتوانی جیهان لە (٢٥٠-٣٠٠) ملیۆن کەس نزیکبۆتەوە، هاوکات ڕێژەی زیادبوونی گەشەی دانیشتوانی لە سنووری (٠,٠٥) بووە (واتە نیو لەسەدا).

دانیشتوان لەو ڕێژەیە بۆ گەشەکردن پێویستیان بە (١٤٠٠) ساڵ بووە تا ژمارەیان دووجا بێتەوە بەبەراورد بە دانیشتوانی ئێستای جیهان کە پێویستیان بە (٥٠) ساڵە تا دوو جا دەبێتەوە.

ساڵی (١٨٢٠) ژمارەی دانیشتوانی جیهان نەگەیشتبووە یەك ملیار خەڵك، دوای ئەوە ڕێژەی گەشەی ساڵانەی بەرادەی دە بەرامبەر زیادی کردووە واتە نزیکەی (٠,٥٪)، ئەمەش مانای ئەوەیە گەیشتنی ژمارەی دانیشتوان بەیەك بلیۆن پێویستی بەو هەموو مێژووە درێژە بوو لە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە تا ساڵی (١٨٢٠)، بەڵام دانیشتوانی جیهان دوای ساڵی (١٨٢٠) پێویستی بە (١١٠) ساڵ بووە (واتە ساڵی ١٩٣٠) تا ژمارەیان بگاتە دوو ملیار، دوای ئەوە دانیشتوانی جیهان پێویستیان بە (٤٥) ساڵی تر بووە (واتە ١٩٧٥) تا ژمارەیان دووجا بێتەوە لە (٢) ملیارەوە بۆ (٤) ملیار، لە ساڵی (١٩٨٧) ژمارەیان بووە (٥) ملیار کەس.

بە گوێرەی ئەو ئامارانەی لەبەردەستن ژمارەی دانیشتوانی جیهان لە ساڵی (١٩٩٩) گەیشتووەتە شەش ملیار کەس، وەکو ڕەگەزی مرۆیی.

بەڵام کاتمان ماوە تا بیری لێ بکەینەوە تا جڵەوی هەوا و ئارەزووەکانی خۆمان بگرین بەر لەوەی ڕێگای داڕووخانی ژینگەکەمان بگرینەبەر، (شێوەی (١-١)).

هەندێ لە جوگرافیناسانی هاوچەرخی وەك (TICKELL-1993) دەڵێ: سەرجەم شارستانییە کۆنەکان لەناوچوون، لەگەڵ ئەوەی دانی بەجیاوازی ئەو شارستانیەتانە ناوە، بەڵام پێی وایە هەر شارستانیەتییەك لەشارستانییە کۆنەکان بەدەست ئەو گۆڕانە دانیشتوانی و دەرامەت و ژینگانەوە ناڵاندوویانە کە لەناکاو سەراوێژ بوونەتەوە

شێوەی ژمارە (١-١) ئەو گەشە لەسەرخۆیە ڕووندەکاتەوە کە دانیشتوانی جیهانی لە زۆرێك لەماوەکانی بەر لەمێژوویی پێ وەسفدەکرێ. پاشان ڕێژەی گەشەی

دانیشتوان دەستی بەخێراتربوون کردووە، هاوکات لەگەڵ ئەو گۆڕانانە لە ڕێژەی گەشەی دانیشتوان گۆڕان لە ڕێژەی مردن و لەدایکبوونیش روویداوە، لەگەڵ جەختکردن لەسەر ئەو مردنانەی کە پەیوەستن بە گۆڕانە بەهێزەکانی رایەڵەی کۆمەلآیەتی ئابووری کۆمەڵگاکان، دەکرێ سێ ماوەی گەشەی دیموگرافی تارادەیەك خێرا لە یەکتر جیابکەینەوە، هەموو ئەو ماوانەش بە ڕێژەی گەشەی خاو وەسف دەکرێن.

(Deevery-1960) روونی کردەوە هەر یەك لەو ماوانەی گەشەی خێرایی دانیشتوان وەلاّمدانەوەی شۆڕشێك بوون کە تیایدا توانستی وەرگرتنی زەوی بەشێوەیەکی خەیاڵی زیادی کردووە، دەکرێ هەر یەك لەو شۆڕشانە و وزەی وەرگرتنیان وەك پرۆسەیەکی بلاّوبوونەوە چاو لێبکەین کە لە سەنتەر یا مەکۆیەکی دیاریکراوەوە یا چەند سەنتەرێکەوە دەستپێدەکات تا بەشێوەیەکی پلە بە پلە جیهانی ئاوەدان دەگرێتەوە. ئەو شۆڕشانە بریتین لە:

**یەکەم: شارستانییە (کلتووری) و داهێنانی کەل و پەلەکان.**

**دووەم: شۆڕشی کشتوکاڵی.**

**سێیەم: شۆڕشی پیشەسازی زانستی کە حاڵی حازر لە ئارادایە.**

تەفسیرەکەی پێشوو سەبارەت بە گەشەی دانیشتوانی بەدرێژایی مێژوو ئاماژەیە بە گەشەی دانیشتوان لە جیهان بەگشتی، کە لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیست گەشەی دانیشتوان گەیشتە لوتکە، واتە (٢,١٪)، لەو کاتە بەدواوە بەرەو نزمبوونەوە هات تا بەم دواییە گەیشتە (١,٤٪) لەگەڵ ئەوەی ئاراستەی گۆڕان برەوی پێ دەدرێ، واتە دانیشتوانی جیهان دوای (٥٠) ساڵی تر دووجا دەبێتەوە لە جیاتی (٣٣) ساڵ جارێك.

لێرە بەدواوە بەتێروتەسەلی سێ سەردەمە سەرەکییەکەی گەشەی دانیشتوان دەخەینەروو:



## قۆناغی یەکەم: شۆڕشی کلتووری و گەشەی دانیشتوان

شۆڕشی کلتووری و پیشەسازی کەل و پەلەکان لەسەردەمی بەر لەمێژوو دەرکەوت، سەرجەم ئەو زانیارییانەی لەبارەی رووداوەکانی ئەو سەردەمە لەبەردەستدان تەنها لەتۆمارە شوێنەوارییەکان بەردەست کەوتوون. لێکۆڵینەوە لەبنچینە و پەرەسەندنی دانیشتوان سەرجەم توێژەرانی سەرقاڵکردووە بەتایبەت مرۆڤناسەکان. دۆزینەوە تازەکانی ئێسکەپەیکەرە گۆشتخۆرەکان سنووری زانیارییەکانی فراوانترکردووە بۆ سەرەتای زووی پەرەسەندنی مرۆڤ. لێکۆڵینەوە جوگرافییەکان جەختدەکەن کە نیشتیمانی رەسەنی مرۆڤ ئەفریقیایە، دۆزینەوەکانی دەگەڕێنەوە بۆ (٤) ملیار ساڵ، ئەو کاتەی کە مرۆڤ لە رووی تایبەتمەندییەوە لە شامپازیا و گۆریلا جیاکرایەوە، لەگەڵ گەورەبوونی قەبارەی مێشك وەك سەرەکیترین جیاکەرەوەی کۆمەڵە مرۆییەکان، مرۆڤیش بەشێوەیەکی خێرا پێشکەوت، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ناهاوڕایی نێو زانایان لەبارەی بنچینەی مرۆڤ، بەلاّم سەرجەم زانایان تەبان لەسەر ئەوەی رەچەڵەکی مرۆڤ لە ئەفریقیا بووە و وردە وردە ئەو کۆمەڵەیە (بەهۆی جیناتی بۆماوە) و بە ئاراستەی (homo sapiens) (کۆمەڵە کرێکارەکان) پێشکەوتووە، کە پێش یەك ملیۆن ساڵ و نیو لە ئەفریقیاوە کۆچیان کردووە، دواتر کۆچی تریش بەرەو ناوچەی تریش بەدواداهاتووە، ئەم تەفسیرە لەلایەن زانایانەوە گرنگییەکی زۆری پێدرا و ئاماژەیان بەوەدا کە زنجیرەی بنچینەی دایکی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ یەك ژنی ئەفریقی کە بەر لە (٢٥٠٠٠٠) ساڵ ژیاوە.

لێکۆڵینەوە هاوچەرخەکان وای دەبینن باشترین تیۆرە ئەوەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ تاك بنچینەی کۆمەڵە کرێکارییەکان (homo spieus) کە جەخت دەکات تاك بنچینەی مرۆڤ و لانکەکەی ئەفریقیایە، ئەو لێکۆڵینەوانە روونیان کردۆتەوە بەر لە یەك ملیۆن ساڵ ژمارەیەکی کەمی مرۆڤ هەبوون، ئەو کۆمەڵە کرێکارییانە زۆر بەهێواشی پەرەیان دەسەند، لە نێو ئەوانیشدا ژیان زۆر سادە و ساکار بووە، چڕی دانیشتوان لەماوەی پێش شۆڕشی کشتوکاڵی زۆر نزم بووە، کۆمەڵە دانیشتوانییەکان

رووبەرووی گۆڕانکاری ژینگەیی هەمەجۆر بوونەتەوە، هەڵبەت بە گۆڕانکاری کەش و هەواییشەوە، خەملاندنەکانی قەبارەی دانیشتوان دەشێ هەڵەبن بۆیە دەبێ بە وریاییەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکەین.

هەندێ لێکۆڵینەوەی (deevery – 1960) ژمارەی دانیشتوان لە جیهان بە (٥) ملیۆن خەملاندووە هەڵبەت بەر لە (١٠٠٠٠) ساڵ.

## قۆناغی دووەم: قۆناغی شۆڕشی کشتوکاڵی

ئەستەمە مێژوییەکی ورد بۆ سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی کشتوکاڵی دیاریبکەین، بەلام دەتوانین بڵێین کشتوکاڵی سەرەتایی و ماڵیکردنی ئاژەڵ (١٠) هەزار ساڵە زانراوە، ئەوەش لە ولاتی میسۆپۆتۆمیا (مابین النهرین) کە یەکەم ناوچەی جیهانە لەرووی پەرەسەندنی کشتوکاڵەوە، لەو ناوچانە کشتوکاڵ وردە وردە بە شێوەی شۆڕشێکی سەرەکی سەرەتایی پراکتیزەکردنی کشتوکاڵ و بەگوێرەی پێداویستییەکانی مرۆڤ دەستپێکرد، ژیانی مرۆڤ لە پەرتەوازەیی و پەرش و بلاوی گۆڕا بە ژیانێکی جێگیر لەناوچەیەکی ئارام و دیاریکراو.

زانایان پێیان وایە نیشتەجێبوونی مرۆڤ لە باشووری رۆژئاوای ئاسیا لە عێراق لە نێوان هەردوو سەدەی نۆیەم و حەوتەمی بەر لە زایین دەستپێکردووە، ئەو نیشتەجێبوونەش وردە وردە بووە، سەرەتا بەکۆکردنەوەی خۆراك دەستپێکردووە و پاشان گۆڕانکاری ژینگەیی مرۆڤی گواستۆتەوە بەرەو ئەو ناوچانەی کە ژینگەی باش و دەرامەتی باشیان لێ هەبووە. زانایان ئاماژە بەوە دەدەن شارستانیەتی مرۆیی درێژ دەبێتەوە بۆ رۆژهەلات بۆ ولات (سند) و پاشان (چین) ئەو ناوچانەی کە کەش و هەوای هاوشێوەیان هەیە، پێشکەوتنی کشتوکاڵی لە هەموو ناوچەیەك رێگا بە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان دەدات کە لە شوێنە جیاوازەکانی جیهان کۆببنەوە، پاشان بەشێوەیەکی ئاسایی بەرهەم لە پێداویستییە خۆراکییەکانی دانیشتوانی کۆمەڵگا زیاد دەبێت و دوای ئەوەش چەندێتی کالای کشتوکاڵی بەرهەمهاتوو



کەڵەکە دەبێ، لەپاڵ ئەوەشدا هەندێ لە دانیشتوان بێ توانان لە دابینکردنی هەندێ پێداویستی وەك دەرهێنانی کانزا و پیشەسازی کانزا، ئەوەش لە باشترکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی رۆڵێکی زۆری هەیە و دواجار پەرەسەندنی گوندەکان و ئامرازەکانی ئاودێری و پیشەوەری و بازرگانی بەدوادا دێ. ئەو داهێنانانە توانا و وزەی مرۆڤیان زیاتر کرد، تاکو پێداویستییەکانی خۆیان دابینبکەن و توانی زەویش لەبەرهەمهێنان زیاتر بکەن. بازرگانی و دەرکەوتنی رێگا بازرگانییەکان کاریکردە سەر دابەشبوونی دانیشتوان و هاوکاربوو لە دەرکەوتنی زووی شارەکان. وەلآمدانەوە دیموگرافییەکانی کشتوکاڵ و ئەو گۆڕانکارییانەی لەگەڵ خۆی هێنانی لە خێراترکردنی رێژەی گەشەی دانیشتوان دەرکەوت، لەو کاتەی کە تیایدا شۆڕشی کشتوکاڵی لە ناوچە جیاوازەکانی جیهان بلاوبوەوە، کاریگەرییەکی روونی بەسەر گەشەکردنی دانیشتواندا دەرکەوت، وێرای ئەوەش هەندێ لە توێژەران پێیان وایە کاتێك شۆڕشی کشتوکاڵی توانای زەوی لە بەرهەمهێنان زیاتر کرد و بەتەواوەتی لە جیهان بلاوبووەوە، جارێکی تر گەشەی دانیشتوان هێواش بووەوە، و دانیشتوان بەقۆناغێکی جێگیر لە ئاستێکی تازەدا تێپەڕین.

لەسەرەتای دەرکەوتنی مەسیحییەت ژمارەی دانیشتوانی جیهان دەگەیشتە نزیکەی (٣٠٠) ملیۆن کەس، لەگەڵ ئەوەی دانیشتوان لەگەشەکردن بەردەوامبوون بەلام پەرەسەندنی ژمارەیی زۆر هێواش بوو، هەروەها دابەشکردنی هەرێمایەتی دانیشتوان جیاواز بوو، لە چوارچێوەی جۆری گشتی گەشەی دانیشتوان گۆڕانە بازنەییەکان شتێکی ئاسایی بوو، رێژەی گەشەی بەهۆی کەمی خۆراکەوە (زۆر جاریش قات و قڕی و برسیەتی) و بەهۆی جەنگ و نەخۆشییە تەشەنەسەندووە زۆر و هەمەجۆرەکان گەشەی دانیشتوان جلەوگیر کرا بوو واتە وەستێنرابوو.

لە زۆربەی ناوچەکان برسیەتی ناوخۆیی و کاریگەری بەسەر رێژەی مردنەوە پشتی بە قەبارەی برسیەتییەکە و پەیوەندی نێوان ئەو ناوچانەی کە تووشی برسیەتی و قاتوقڕی بووبوون و ناوچەکانی تر دەبەست. لەگەڵ ئەوەشدا برسیەتی و قاتوقڕی

لەناوبەری رگەزی مرۆییە، بۆیە باشتربوونی ئامرازەکان و رێگای گواستنەوە، مرۆڤی لە کاریگەری داروخانی بەرهەمی هەندێ بەروبوومی ناوخۆیی رزگارکرد.

جەنگەکان کاریگەرییەکی راستەوخۆیان لەسەر رێژەکانی گەشەی دانیشتوانەوە هەیە، هەرچەندە ئەستەمە ئەو کاریگەرییە دیاریبکەین، کوشت و کوشتاری جەنگەکان و کەمی خۆراك و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی هەموو فاکتەرن ناتوانن ژمارەی مردووان دیاریبکەین، دەرد و نەخۆشییە تەشەنەسەندووەکانیش رگەزی مرۆیی لەناو دەبەن، لەم بارەشەوە نموونەی زۆر هەن وەك کۆکەرەشە (تاعون) کە لەماوەی نێوان ساڵانی (٥٤١-٥٤٤) زایینی و مردنی رەش لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٣٤٦-١٣٤٨)زایینی لە ئەوروپا. ئەو نەخۆشیانە ژمارەی دانیشتوانیان بەرێژەی (٢٥٪) کەمکردەوە. دوای ئەوە گەشەی دانیشتوان لە ئەوروپا خاوبووەوە، هەورەها دوای ئەو مێژووە بەهۆی جەنگی سەد ساڵە دیسان گەشەی دانیشتوان لە کورتی دا. لەسەدەی شانزە ئەوروپا ئەو کەمبوونەوەیەی کە بەسەر ژمارەی دانیشتوانەکانیدا هات گەڕاندەوە و وردە وردە رێژەی گەشەی دانیشتوان بەرز بووەوە، وێرای بوونی هەندێ قات و قڕی و جەنگ و نەخۆشی، پەرەسەندن و بڵاوبونەوەی خێرای نەخۆشی ئایدز لەکاتی ئێستادا تاکو ئێستاش وەکو دەرد و نەخۆشی هەر ماوە و لە ئارادایە.

دوای ساڵی (١٤٩٢) ژمارەی دانیشتوان لە جیهانی نوێش بەشێوەیەکی بەردەوام پاشەکشەی کرد، خەمڵاندنەکان ئاماژە بەوە دەدەن (٥٠) ملیۆن مرۆڤ لە ئەمریکای باکور و باشوور دەژیان کاتێك کۆڵمبس ئەمریکای دۆزییەوە.

### قۆناغی سێیەم: قۆناغی شۆڕشی پیشەسازی

ئینگلتەرا بێشکەی شۆڕشی پیشەسازییە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدە دەستیپێکرد، هەرچەندە رەگ و ریشەکەی بۆ ماوەیەکی پێشتر دەگەڕێتەوە. شۆڕشی پیشەسازی بەشێوەیەکی خێرا لە ئینگلتەراوە بەرەو وڵاتانی تری ئەوروپا و پاشان بەرەو ویلایەتە یەکگرتووەکان بڵاوبووەوە، لەگەڵ سەرەتای سەدەی بیست گەیشتە روسیا و



باکووری ئیتاڵیا، ژاپۆن یەکەم وڵاتی ئاسیایی بوو کە ئەو شۆڕشەی بەخۆوە بینی، لەگەڵ قۆناغی دروستکردنی پیشەسازی جێگای کشتوکاڵی گرتەوە، کشتوکاڵ سەرەکیترین کەرتی ئابووری بوو لەسەرجەم وڵاتان، تاکو ئێستاش شۆڕشی پیشەسازی هەر بەردەوامە و بەشێوەیەکی دیاریکراو و بەشەکی لە وڵاتانی دواکەوتوو بڵاوبووەتەوە.

لەگەڵ هاتنی ساڵی (١٧٥٠) ژمارەی دانیشتوانی ئینگلتەرا و وێلز پەرەی سەند، دوای ئەوەش راستەوخۆ گەشەی دانیشتوان لە وڵاتانی تازە بەپیشەسازیبوو دەستیپێکرد، لە راستیدا پێش ئەو مێژووە رێژەکانی مردن و لەدایکبوون لەو وڵاتانە بەرزبوو.

لە ساڵانی ئاسایی رێژەی لە دایکبوون لە رێژەی مردن زیاترە، بەڵام لە ساڵانی خراپ رەوشدا تەواو پێچەوانەیە. رێژەی مردن زیاتر، لە رێژەی لەدایکبوون کەم و زیادی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا رێژەی لەدایکبوون بەهۆی چەند فاکتەرێکی کۆمەڵایەتییەوە زیاد لە پێویست بوو.

لەماوەی هەردوو قۆناغی یەکەم و دووەم (شۆڕشی کلتووری و شۆڕشی کشتوکاڵی) دانیشتوان زیاتر دەیانتوانی پێداویستی خۆیان لە زەوی بەدەستبهێنن، بەڵام ئەو رەوشە لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازی زانستی وەکو خۆی نەمایەوە و بۆ یەکەمجار خەڵك مردنیان کۆنترۆڵ کرد. ئەنجامی ئەو کۆنترۆڵکردنەی مردنیش گۆڕانکاری زۆر هاتە ئارا، گرنگترینیان گۆڕان لە رێژەی بەرزی مردن و زیاد و کەمی لە رێژەی مردن. کاری کشتوکاڵی باشتر و پەرەسەندنی سیستەمی دابەشکردن کاریگەری قات و قڕیان کەمکردەوە، هەروەها باشتربوونی خزمەتگوزاری و ئامرازەکانی ئاو و ئاودێری و هاوکار بوو لە نزمبوونەوەی مردن کە بەهۆی نەخۆشییەوە دروستدەبوون، هەروەها داهێنانە پزیشکییەکان رۆڵێکی بەرچاویان لە نزمکردنەوەی رێژەی مردنیان لە سەدەی نۆزدە گێڕا.

ئەو داهێنان و دروستکردنانەی کە لەگەڵ شۆڕشی کشتوکاڵی و پیشەسازی هاتنە ئاراوە تەنها بەسەر ئەو ناوچانەدا کورت ناکرێنەوە کە شۆڕشەکانی تیادا رووداوە، بەڵکو بۆ دەرەوەش بڵاوەی کرد، لە ساڵی (٦٠٠٠) بەر لە زایین کشتوکاڵ لە هەندێ

ناوچەی دیاریکراوی ئەوروپا هەبوو وەك ناوچەکانی دەریای (ئیجە)، بەلاّم لەماوەی (٥٠٠٠) ساڵی بەر لەزایین بەرەو باکووری ئاوزێڵی رووباری دانووب درێژەی کێشا، لەگەڵ هاتنی ساڵی (٤٠٠٠) ساڵی بەر لە زایین کشتوکاڵ گەیشتە باکووری ئەوروپا، لەراستیدا بلاّوبونەوەی پیشەسازی زۆر خێراتربوو لە بلاّوبونەوەی کشتوکاڵی ئەوروپییەکان ئەو داهێنانەیان گواستەوە بۆ ئەو ناوچانەی کە داگیریان دەکرد. لە کۆتایی سەدەی بیست هیچ شوێنێك نەما هەندێ روخساری شۆڕشی پیشەسازی پێ نەگەیشتبێ، تەنها هەندێ ناوچەی کەم نەبێ.

خێرایی بلاّوبونەوە و ئاراستەی دانیشتوان بەچەند فاکتەرێك کاریگەربوون وەکو مەودا و بەربەستەکان و سروشتی ژینگە و جیاوازی پێکهاتە کۆمەلاّیەتییەکان. یەکێك لە گرنگترین مەسەلەکان بلاّوبوونەوەی نایەکسانی داهێنان بوو، کاتێك ئەو داهێنراوانە دەگەیشتە هەر کۆمەڵگایەك کاریگەرییەکی دروستدەکرد و شێوەی تازەی رێکخستن و سەرکردایەتی دەهێنایە ئارا و دەبووە هۆی لێهاتوویی نوێ، زۆرجار گەشەی خێرای دانیشتوان گۆڕانکاری لەهەلومەرجی ئابووری و کۆمەلاّیەتی لەگەڵ خۆی دەهێنا.

خاڵێکی تر هەیە دەبێ ئاماژەی پێ بدەین، ئەویش ئەوەیە لە هەموو سەردەمێکدا گەشەی دانیشتوان بە لێشاوە، ئەو رێژەی گەشەی دانیشتوان لەخێرایی خۆی کە لە لوتکەی لێشاوبوونەکە پێی گەیشتبوو خاو دەبووەوە، لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی مرۆیی هەندێ بەربەستی گەشەی دانیشتوان جوولاّوە، بەلاّم لەگەڵ بوونی هەندێ رێ و شوێن، ئەو رێوشوێنانەش ئێستا زۆر گرنگن، وەکو وەلاّمدانەوەیەك بۆ شۆڕشی پیشەسازی دانیشتوانی جیهان، چوونە ناو قۆناغێکی خێرا و نەپساوەی گەشەی دانیشتوان، لەماوەی سەدەی نۆزدە گەشەکردن لە ولاّتە پێشکەوتووەکان چڕبووبۆوە، بەلاّم لە ناوەڕاستی سەدەی بیست گەشەی دانیشتوان لە ولاّتە پێشکەوتووەکان وەستا، لە ولاّتە دواکەوتووەکان خێراتربوو و بنەمایەکی دیموگرافی بۆ هەزارەی سێیەم دارِشت.



## دانیشتوانی ئێستای جیهان

رەوشی هەنووکەیی دانیشتوانی جیهان بەدرێژایی مێژوویی مرۆڤ رەوشێکی دەگمەنە، نەك تەنها لەبەرئەوەی رێژەی زیادبوونی ئێستای دانیشتوان بە بەرزترین رێژە دادەنرێ لە مێژووی مرۆڤایەتی، بەلّکو قەبارەی دانیشتوان (٦,٢ ملیار کەس)ە ئەو گەورەترین رێژەیە، تۆمارە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەدەن گەشەکردنی خێرای دانیشتوان لە ولاّتە ئەوروپییەکان دەستیپێکرد. هەروەها لەو زەوییانەش کە لەو دیو دەریاوە داگیریان کردبوو بەتایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا و ئوسترالیا. لەگەڵ ئەوەشدا خێراترین ناوچەی گەشەکردنی دانیشتوانی ئەفریقیا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین (یا ولاّتە تازەپێگەیشتووەکان) ئەم ناوچانە سێ چارەگی دانیشتوانی گۆی زەوی لەخۆ دەگرن. زیاتر لە (٩٠٪) گەشەی دانیشتوان لەو سێ کیشوەرەدا روودەدات. ماوەی هەردوو دەیەی کۆتاییەکانی سەدەی بیست رێژەی مردن لە ولاّتە تازەپێگەیشتووەکان کەمبۆوە، بەلاّم رێژەی لەدایکبوون دوو هێندەی ولاّتە پێشکەووتوەکانی لێهات.

لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٨٧) ژمارەی دانیشتوانی جیهان لە (٢,٥) ملیار کەسەوە دووجا بۆوە بۆ (٥) ملیار کەس. جەنگی سارد و گەشەی دانیشتوان و چڕی دانیشتوان لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی وەلانا. لەو ماوەیەدا دابەشبوونی دانیشتوان لەجیهان لەرووی جوگرافییەوە یەکسان و هاوسەنگ نەبوو، (٨٥٪) گەشەی دانیشتوان لە ولاّتە تازەپێگەیشتووەکان روویدەدا. لە زۆربەی ولاّتانی پێشکەوتووی ئەمرۆ پیتاندن گەیشتووەتە قۆناغی نەمان و لەناوچوون، جگە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەرزترین رێژەی سەدی گەشەی دانیشتوان لە دەییەکانی داهاتوو لە ولاّتە تازەپێگەیشتووەکان کە ناتوانن ژمارەی زیاتری دنیشتوان وەربگرن.

بەهاتنی ساڵی (٢٠٠٠) رێژەی (٨٠٪) دانیشتوانی جیهان لە ولاّتە تازەپێگەیشتووەکان نیشتەجێ دەبن، و نیووی ئەو رێژەیەش لە هیند و چین دەبن، ئاسانە پێشبینی بکەین پەرەسەندن و زۆربوونی قەبارەی کۆچی نێودەوڵەتی لە

دەیەکانی داهاتوودا رووبدەن، چونکە کۆبوونەوەی سەروەت و سامان لە ژێر سایەی جیهانگیری و چڕبوونەوەی لە وڵاتە پێشگەوتوو و دەوڵەمەندەکانە، بۆیە چاوەروان دەکرێ گەنجان لە وڵاتە هەژارەکانی خۆیانەوە بۆ ئەو وڵاتانە کۆچبکەن.

لێرەدا دەکرێ بەراوردێك لە نێوان وڵاتە پێشکەوتووەکان و وڵاتە دواکەوتووەکان بکەین، ئەگەر جیاوازی پێکهاتەی تەمەنی دانیشتوانی نێوان ئەو دوو گرووپە لەبەرچاو بگرین. ئەو وڵاتانەی کە گەشەکردنێکی دانیشتوانی بەرزیان بەخۆوە بینیوە، رێژەی بەرزی دانیشتوانەکانیان لە گرووپی تەمەن بچووکدان، وڵاتە رێژە خێراکان: ئەفریقیا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین، رێژەی (٣٠-٤٥٪)ی دانیشتوان لە ژێر تەمەنی (١٥) سالیدان، بەڵام لە ئەمریکای باکوور و ئەوروپا و ئوسترالیا رێژەی کەمی ژێر تەمەن (١٥) ساڵی هەیە (٢٠٪ یا کەمتر).

پێداویستی و خزمەتگوزاری ئەو وڵاتانەی کە رێژەیەکی بەرزی تەمە گەورەیان هەیە جیاوازە لە پێداویستی و خزمەتگوزاری ئەو کۆمەڵگایانەی کە رێژەی تەمەنی گەنجیان بەرزە.

## داشکاندنەکانی دانیشتوان

بەپشت بەستن بەو پەرەسەندنەی کە لەرابردوودا روویداوە رەوشی ئێستای دانیشتوانمان دەخەینەڕوو، بەڵام ئەو شتە چییە کە دوارۆژ لە دانیشتوانی جیهانی شاردۆتەوە، بۆ ئەو پرسیارە یەك وەڵام هەیە کە پشت بە کۆمەڵێك گریمانە دەبەستێ سەبارەت بە گۆڕاوە دانیشتوانییەکان لە ماوەیەکی کاتی دیاریکراودا: خەملاندنی گریمانەیی دوارۆژی ژمارەی دانیشتوانی جیهان. لە ژێر تیشکی ئەمەدا هۆشداری هەمەجۆر هاتووە کەلەمیانی چاوخشاندن بە رێژەی مناڵ و گەنجان دەچنە سەری، هەروەها پێویستە ئەم خالانە بخەینەروو:

١- خەملاندنی گریمانەی دوارۆژی دانیشتوان لەسەر رێژەی ئێستای دانیشتوان بونیاد دەنرێ.



٢- رێژەی ئێستای گەشەی دانیشتوان لەسەر چەند فاکتەرێکی هەمە جۆر وکارلێککەر بونیاد دەنرێ، بەجۆرێك کاریگەرییەکی بچووکی هەر فاکتەرێك کاریگەرییەکی دیاریکراوی دەبێ لەسەر ماوەیەك کە دەگاتە (٢٠٠) ساڵی داهاتوو.

دیموگرافیستەکان هۆشداریان داوە لەبارەی جیاکردنەوەی نێوان گریمانەکانی دوارۆژی دانیشتوان و پێشبینییەکانی دوارۆژ. خەملاندنی گریمانەیی پشت بەکۆمەڵێك گریمانە دەبەستێ سەبارەت بەو پرۆسە دیموگرافییانەی کە کاردەکەنە سەر گەشەی دانیشتوان لەماوەیەکی کاتی دیاریکراو.

گریمانەی پێشنیارکراو لەمەدا ئەوەیە کە رێژەی گەشەی دانیشتوان هاوشێوەی ئەوەی ئێستایە، لەلایەکی ترەوە گریمانەکان لە شێوەی گشتیاندا پەی پێ بردنیان دژوارە، لێرەوە دەکرێ گریمانە ئایندەییەکان دابەشی سەر چەند فاکتەرێك بکەین: رێژەی زیادکردنی سروشتی، لەدایکبوون، مردن و کۆچ، ئەو فاکتەرانە لەیەك هاوکێشەی گەشەی دانیشتوان کۆ دەبنەوە. ئەگەر گریمانەکان بەدی هاتن ئەوە پێشبینییەکان راست دەبن، لێرەوە پێویستە دیموگرافیستەکان ئەو بەرپرسیاریەتییە پەردەپۆش نەکەن، ئەگەر گریمانەکان دروست نەبوون بەڵکو پێویستی روونی بکەنەوە، لەراستیدا گریمانە دانیشتوانییەکان هەمیشە گۆڕانی رەفتاری مرۆیی و هەڵسوکەوتی تاکەکەسی مرۆڤی فەرامۆش دەکەن. هەروەها ئێمە گریمانە دانیشتوانییەکان لەسەر زنجیرەیەك گریمانەی بونیادنراو لەسەر رێژەی لەدایکبوون و مردن و کۆچ بونیاد دەنێین.

پێویستە دیموگرافیستەکان و جوگرافیناسەکان خەملاندن و پێشبینی لە یەکتر جیا بکەنەوە، خەملاندن بریتییە لە وێنەیەکی ژمارەیی قەبارەی دانیشتوان لە مێژوییەکی دیاریکراودا، هەروەها خەملاندن لەسەر گریمانەی رێژەی لەدایکبوون لەنێوان ئەو مێژووە و مێژوویەکی دیاریکراوی دوارۆژ، بونیادەنرێ. گریمانەکان لەپێناسەدا راستن، چونکە ئاماژەن بەو قەبارە دانیشتوانییەی کە ئەگەر زانیارییە سەرەکییەکان دروست بن ئەو قەبارەیەش راست دەبێ، هەڵبەت دەبێ ئەو گریمانانەی سەبارەت بە گۆڕانە داهاتووییەکان راست بن، ئەوەش پشت بە شێوازی کاری گریمانەکان و چۆنیەتی

تۆمارکردنی رووداو و بەها راستییەکان دەبەستێ، چونکە لە خەملاندن گریمانەکانی رێژەی لەدایکبوون و مردن و کۆچ تەنگوچەڵەمەی زۆر هەیە، بۆیە دیموگرافیستەکان هەمیشە پەنا دەبەنە بەر دارشتنی زنجیرەیەك خەملاندنی گریمانەیی رۆنراو لەسەر کۆمەڵێك گریمانەی جیاواز، باشتر وایە دیموگرافیستەکان خۆیان لەبەکارهێنانی چەمکی پێشبینی بەدوور بگرن، چونکە خەملاندنە گریمانەییەکان لوتکەی راستییە لە رێژەیەکی بەرزدا بەدەستهاتوون، لێرەوە خەملاندنە گریمانییەکان لە رووپێوکردنی رووبەرێکی فراوانی زەوی شکست دەخۆن بۆیە دیموگرافیست فاکتەرێکی گریمانەیی بەهێز بۆ ماوەیەکی کورت و نزیك لە واقیع هەڵدەبژێرێ، شایانی باسە دوو جۆری گەورەی گریمانی دانیشتوان هەیە یەکەمیان: رێژەییە، دووەمیان: پشت بە توخمە پێکهاتووەکان (عناصر المرکبە) دەبەستێ. شێوازە بیرکارییەکان سادە و ساکارن بۆ تێگەیشتن و وەڵامدانەوە، بەڵام شێوازی توخمە پێکهاتووەکان زیاتر بە کاردێن و بەماوەیەکی کورتیش (پێنج ساڵ و کەمتر)، بەڵام شێوازە بیرکارییەکان شێوازێك بۆ رێسا بەکارهێنراوەکانی دانیشتوان دەخەنە کار وەك: رێژەی زیادبوونی سروشتی، رێژەی لەدایکبوون، رێژەی مردن و رێژەی کۆچ، ئەم رێژانە پێکەوە ببەستێتەوە تا نموونەیەکی پێشبینییە دانیشتوانییەکان دروستبکات.

هەردوو جۆری بیرکاری و توخمە پێکهاتووەکان کۆمەڵێك نموونە لەخۆ دەگرن، بەکارهێنانی هەر نمونەیەکیش پشت بە چەند فاکتەرێك دەبەستێ وەك: قەبارەی ناوچە، پێشبینییە دانیشتوانییەکانی ئەو ناوچەیە، و گریمانە پێشنیارکراوەکان، هەروەها جۆر و چەشنی داتا و زانیارییە بەدەستهاتووەکان، هەروەها رێژەی ماوەی نێوان پێشبینییەکان، بۆ وێنە: پێشبینییە نەتەوەییەکان پێویستی بە گرینگیدانی جیاوازە لە پێویستییەکانی ناوچەیەکی لۆکاڵی، تێگەیشتن و پێشبینیکردنی پرۆسەکانی کۆچ زۆر جیاوازە لەوانەی پەیوەستن بە لەدایکبوون و مردن لەناوچەیەکی لۆکاڵی، بەڵام ئاماژەکردن بە کۆچی هاتووەکان (ناوخۆیی) بۆ دەوڵەتێك زۆر ئاسانترە لە پێشبینیکردنی لەدایکبوون، چونکە پرۆسەی کۆچی هاتوو رێك و پێك و لەرێگای



سنوورەوەیە، هەروەها داتا و زانیارییەکانی ناوچەکە لۆکاڵییەکان هەمیشە بەشێوەیەکی تەواو لەبەردەستدا نییە بۆ بەکارهێنانی رێگای توخمە پێکهاتووەکان، هەروەکو دەبینین نموونە بیرکارییەکان بۆ ماوەی کورت زیاتر جێگای سەرنجی توێژەرانن.

## پێشبینییە دانیشتوانییەکانی جیهان و هەرێمە سەرەکییەکان:

وێرای ئەو ئاستەنگانەی کە رووبەرووی پێشبینییە دانیشتوانییەکان دەبنەوە بەڵام بەشتێکی پێویست و سەرەکی دادەنرێ، چونکە بیرکردنەوەکانمان فراوانتر بکات سەبارەت بەشوێنەواری ئاراستە دانیشتوانییەکان لەنێو ئەو گریمانە سەرەکیانەش کە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پێشبینییە دانیشتوانییەکان دایرشتووە، ئەمانەن:

١- هێنانەدی نزمترین ئاستی رێکخستن و کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی.

٢- هەوڵەکان بۆ هێنانەدی جۆرێگی باشتر بۆ ژیان بەردەوامە و لە سنوورێکی دیاریکراو ناوەستێ.

٣- رێژە ژیانییەکان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر جیاواز دەبێ، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی و لەهەموو شوێنێك مردن و پیتداری بەپلەیەکی کەمتر لە رێژەی نزمی ئێستا نزم دەبێتەوە.

پێشبینییە دانیشتوانییەکانی دوارۆژی لەجیهان بەروونی ئاماژە بەوە دەدەن کە رێژەی گەشەی دانیشتوان لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان زۆر زیاترە لە وڵاتە پێشکەتووەکان، هەڵبەت پێشتر ئاماژە بەوە کراوە کە رێژەی گەشەی دانیشتوان لەوڵاتەتازەپێگەیشتووەکان، بەرزترە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان، بەڵام دەبێ زۆر بە وریاییەوە سەرجەم پێشبینییە دانیشتوانییەکانی ئاییندە بەکار بهێنین، چونکە هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی دانیشتوانی جیهانی لەگۆڕاندایە واتە جێگیر نییە، خشتەی (١-١) دابەشکردنی جوگرافی دانیشتوانی جیهان لە ساڵی (٤٠٠ پ.ز) بۆ ساڵی (٢٠٠٠) رووندەکاتەوە.

## خشتەی (١-١) دابەشكردنی جوگرافی دانیشتوانی جیهان لە ساڵی (٤٠٠پ.ز)ەوە بۆ ساڵی (٢٠٠٠ز)

| هەرێمەكان | ٤٠٠- | سفر | ٥٠٠ | ١٠٠٠ | ١٥٠٠ | ١٧٥٠ | ١٨٥٠ | ١٩٠٠ | ١٩٥٠ | ٢٠٠٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| چین | ١٩ | ٧٠ | ٣٢ | ٥٦ | ٨٤ | ٢٢٠ | ٤٣٥ | ٤١٥ | ٥٥٨ | ١,٢٦٢ |
| هیند، پاكستان، بەنگلادیش | ٣٠ | ٤٦ | ٣٣ | ٤٠ | ٩٥ | ١٦٥ | ٢١٦ | ٢٩٠ | ٤٣١ | ١,٢٨٥ |
| ژاپۆن | ١ | ٢ | ٥ | ٤ | ١٠ | ٢٦ | ٣٠ | ٤٥ | ٨٤ | ١٢٦ |
| باقی ئاسیا | ٤٥ | ٥٢ | ٤٩ | ٥٢ | ٥٦ | ٨٩ | ١٠٩ | ١٥٣ | ٣٢٠ | ٩٤٢ |
| ئەوروپا بەبێ یەكێتی سۆڤیەت | ١٩ | ٣١ | ٣٠ | ٣٠ | ١١١ | ٢٠٩ | ٢٩٥ | ٣٩٥ | ٣٩٥ | ٥١٩ |
| روسیا | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٣ | ١٧ | ٣٥ | ٧٩ | ١٢٧ | ١٨٠ | ٢٨٣ |
| باكووری ئەفریقیا | ١٠ | ١٤ | ١١ | ٩ | ٩ | ١٠ | ١٢ | ٤٣ | ٥٢ | ١٤٥ |
| ئەفریقیای باشووری بیابان | ٧ | ١٢ | ٢٠ | ٣٠ | ٧٨ | ٩٤ | ٩٠ | ٩٥ | ١٦٧ | ٦٦١ |
| ئەمریكای باكوور | ١ | ٢ | ٢ | ٢ | ٣ | ٣ | ٢٥ | ٩٠ | ١٦٦ | ٣٠٧ |
| ئەمریكای ناوەراست و باشوور | ٧ | ١٠ | ١٣ | ١٦ | ٣٩ | ١٥ | ٣٤ | ٧٥ | ١٦٤ | ٥٢٠ |
| ئۆقیانۆسیا | ١ | ١ | ١ | ١ | ٣ | ٣ | ٢ | ٦ | ١٣ | ٣١ |
| كۆی گشتی | ١٥٣ | ٢٥٢ | ٢٠٧ | ٤٦١ | ٤٦١ | ٧٧١ | ١٢٤١ | ١٦٣٤ | ٢٥٣٠ | ٦,٠٨١ |



### ڕێـــــژە

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| چین | ١٢,٤ | ٢٧,٨ | ١٥,٥ | ٢٢,١ | ١٨,٢ | ٢٨,٥ | ٣٥,١ | ٢٥,٤ | ٢٢,١ | ٢٠,٨ |
| هیند، پاكستان، بەنگلادیش | ١٩,٧ | ١٨,٣ | ١٥,٩ | ١٥,٨ | ٢٠,٦ | -٢١,٤ | ١٧,٤ | ١٧,٧ | ١٧ | ٢١,١ |
| ژاپۆن | ٠,٧ | ٠,٨ | ٢,٤ | ١,٦ | ٢,٢ | ٣,٤ | ٢,٤ | ٢,٨ | ٣,٣ | ٢,١ |
| باقی ئاسیا | ٢٩,٤ | ٢٠,٦ | ٢٣,٧ | ٢٩,٦ | ١٢,١ | ١١,٥ | ٨,٨ | ٩,٤ | ١٢,٦ | ١٥,٨ |
| ئەوروپا بەبێ یەكێتی سۆڤیەت | ١٢,٤ | ١٢,٣ | ١٤,٥ | ١١,٩ | ١٤,٥ | ١٤,٤ | ١٦,٨ | ١٨,١ | ١٥,٦ | ٨,٥ |
| روسیا | ٨,٤ | ٤,٨ | ٥,٣ | ٥,١ | ٣,٧ | ٤٠٥ | ٦,٤ | ٧,٨ | ٧,١ | ٤,٧ |
| باكوری ئەفریقیا | ٦,٥ | ٥,٦ | ٥,٣ | ٣,٦ | ٢ | ١,٣ | ١ | ٢,٦ | ٢,١ | ٢,٤ |
| ئەفریقیای باشووری بیابان | ٤,٦ | ٤,٨ | ٩,٧ | ١١,٩ | ١٦,٩ | ١٢,٢ | ٧,٣ | ٥,٨ | ٦,٦ | ١٠,٩ |
| ئەمریكای باكوور | ٠,٧ | ٠,٨ | ١ | ٠,٨ | ٠,٧ | ٠,٤ | ٢ | ٥,٥ | ٦,٦ | ٥ |
| ئەمریكای ناوەراست و باشوور | ٤,٦ | ٤ | ٦,٣ | ٦,٣ | ٨,٥ | ١,٩ | ٢,٧ | ٤,٦ | ٦,٥ | ٨,٦ |
| ئۆقیانۆسیا | ٠,٧ | ٠,٤ | ٠,٥ | ٠,٤ | ٠,٧ | ٠,٤ | ٠,٢ | ٠,٤ | ٠,٥ | ٠,٥ |
| كۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |

## خەمڵاندنە دانیشتوانییە ناوچە رووبەڕوو بچووكەكان

لەگەڵ ئەوەی پێشبینییە دانیشتوانییەكان گرنگی زۆری پێدەدرێ، بەڵام تاكە شت نییە كە گرنگی پێدەدرێ، یەكە سیاسییەكانی وەك دەوڵەت یا كەرتەكان و پارێزگاكان و شارەكان پێویستی بەزانینی هەندێ شت هەیە لەبارەی دوارۆژی دیموگرافیاوە، هەروەك ڕێژەی بەڕێوبەرایەتییەكانی فێركردن، پلانرێژی ڕێگا سەرەكییەكان، دامودەزگاكانی پلانرێژی هەرێمی و شارستانییەتەكان، سەرباری ئەوەش چەندین دامەزراوەی تایبەت هەیە گرنگی بە گۆڕانكارییە دیموگرافییەكانی ناوچە لۆكاڵییەكان دەدات، تا بتوانێ گۆڕانە هەرێمی و لۆكاڵییە داواكراوەكان و

ئیستراتیژیەتی بازاڕیش پێوانە بکات، تەنانەت گۆڕان بە سەلیقە و بەرزکردنەوەی کالاّکان بەسەر یەکێکی تردا، بۆیە پێشبینییە دانیشتوانییەکانی ناوچەیەکی بچووك زۆر دژوارە، چونکە جیاوازییە لۆکاڵییەکان لە پیتداری و مردن و کۆچ زۆر زیاترە لەسەر ئاستی نەتەوەیی.

پێشبینییەکانی کۆچ بە گرانترین و پێشبینی دادەنرێ، بەشێوەیەکی تایبەت بۆ ناوچە بچووکەکان، چونکە گۆڕان لە تایبەتمەندییە ئابووری و کۆمەلاّیەتییەکانی ئەو ناوچانە دەبێتە هۆی گۆڕانێکی خێرا لە جۆرەکانی کۆچی هەنووکەیی.

گرنگیدانی جیهانی بەدانیشتوان لەلایەن حکومەتەکان یا ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، هەروەها نەتەوە یەکگرتووەکان، بەهۆی ئەو نیگەرانییەوە کە ئەو ڕێکخراو و حکومەتانەی سەرقاڵکردووە سەبارەت بە کێشەی دانیشتوان، ئەو نیگەرانییەش لەبەستنی چەندین کۆنگرەی جیهانی دەردەکەوێ بۆ تاوتوێکردنی مەسەلەی دانیشتوان دەبەسترێ، سەرەتا بە کۆنگرەی (بوخارست) لە ساڵی ١٩٦٤ و کۆنگرەی (ڕۆما) ساڵی ١٩٧٤ و کۆنگرەی (مەکسیك) ساڵی ١٩٨٤ وکۆنگرەی (قاهیرە) ساڵی ١٩٩٤ دەستیپێکرد، ئەو کۆنگرانە چەندین دۆز و گرفتی دیموگرافی و کۆمەلاّیەتی و ئابووری دانیشتوانیان خستە بەرباس، دیارترینیان زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و ڕێکخستنی خێزان و گرفتی دابەشکردنی جوگرافی نا هاوسەنگی دانیشتوان و کۆچی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی، هەروەها هەژاری و بێ کاری و گرفتەکانی گەنجان و منالاّن و بەسالاّچوان و سیاسەتە دانیشتوانییەکان.



# بەشی دووەم

# داتاکانی دانیشتوان

گومانی لەوەدا نییە لێکۆڵینەوەکانی ئێستای دانیشتوان پێویستیان بە کۆمەڵێك زانیاری هەمەجۆر هەیە، ئێمەش بۆ ئەوەی باشتر لـە گۆڕانکارییـەکانی دانیـشتوان و ئەو شێوازانە تێبگەین کە ئەو گۆڕانکارییانە بە فاکتـەرە ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و ژینگەییـەکان دەبەسـتێتەوە، پێویـستمان بـە ژمـارە و ڕێـژە هەیـە، لەراسـتیدا گۆڕانکارییە دیموگرافییەکان لـە بۆشـاییدا روونـادەن، تێبینـی دەکـرێ دانیـشتوان و تایبەتمەندییەکانی بەشێوەیەکی بەردەوام دەگۆڕێن، بۆیە پێویستە بـەو پـەڕی توانـاوە پارێزگاری لەو ئاماژانەی ئێستا بکەین، هەروەها بەهۆی سروشتی دینـامیکی بزۆڵـی دانیشتوان باشتروایە هەتا دەکرێ زنجیرەی مێژوویی زانیارییەکان بە شێوەیەکی تـەواو بخەینەروو، لە ژێر تیشکی ئەمەشدا توێژەری بـواری جوگرافیـای دانیـشتوان بـەهۆی ئەوەی پێویستی بـە بڕێکـی زۆری زانیـاری هەیـە لـە مـاوەی زەمـەنی جیـاوازدا، هەمیشە تەواوی ئەم زانیارییانەی لە دامودەزگا حکومییەکان بەدەست ناکـەوێ وەك بەڕێوبەرایەتی ئاماری گشتی، لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا توێژەری ئاسایی خـەرجی و کاتی تەواوی نییە بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان.

### سێ بەکارهێنانی سەرەکی داتا دیموگرافییەکان هەیە:

١- پلانرێژی، ئاماژە ئیستراتیژییەکان، داشکاندنەکانی دانیـشتوان بـۆ مـاوەی کورت مەودا (٥) ساڵ یا درێژ مەودا.

٢- بەدواداچوون و چاودێری ئاراستە دیموگرافییەکانی ئێستا و ئەو پرۆگرامانەی لەبواری جێبەجێکردندان

٣- لێکۆڵینەوە زانـستییەکان لەسـەر ئاسـتی بەشـەکی و ئاسـتی گـشتی بـۆ پێکبەستنەوەی دیاردە دیموگرافییەکان و پەرەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان.

هەر یەك لەو بەکارهێنانـە پێداویـستی دیـاریکراوی خـۆی هەیـە لـەرووی وردی زانیارییەکان، راستگۆیی، تێروتەسـەلی جـوگرافی و بـەگوێرەی جۆرەکـان و متمانـەی بەکارهێنەر بەو زانیارییانـە پەیوەنـدی هەمبـەری نێـوان ئـەو پێداویـستیانە و هـەر

بەکارهێنانێکیش پەیوەندییەکی ئالۆز و تێکچڕژاوە، دەتوانین بڵێین ئاستەنگی سەخت هەیە کە رووبەرووی توێژەران دەبێتەوە بە بەکارهێنانی دووەمدا، واتە بەدواداچوون و چاودێریکردنی ئاراستە و پرۆگرامە دیموگرافییەکانی ئێستا.

## سەرچاوەی داتا زانیارییەکان

زانیارییە دیموگرافییەکان بەمەبەستی شیکردنەوە لە سێ سەرچاوەوە چنگ دەکەون:

١- سەرژمێرییەکانی دانیشتوان.
٢- تۆمارە ژیانییەکان و تۆمارەکانی کۆچ
٣- رووپێو بەنموونە.

ئەو سەرچاوانە هەمەلایەنەترین و گشتگیرترین سەرچاوەن لەناو سەرچاوە بەردەستەکانی تر لەکاتی ئێستا، هەڵبەت ئەو سەرچاوانە لە دامودەزگا حکومییەکان چنگدەکەون.

کۆمەڵێك داتای دیموگرافی راستەوخۆی هەمەجۆری تریش هەیە کە دەکرێ هەندێ جار بۆ هەندێ مەبەستی بەکەڵك بەکاربهێنرێن، بەلاّم بۆ کۆمەڵەی بچووك و دیاریکراوەکانی دانیشتوان کۆدەکرێنەوە. نموونەش بۆ ئەمە ئامارەکانی پەروەردە و فێرکردن، تۆماری کلێساکان، تۆماری لە دایکبوون و مردن لە نەخۆشخانە و شارەوانییەکانی شار و گرێبەستە هاوسەرگیرییەکان و ....هتد، زۆرینەی جار ئەو داتایانە بەردەستن ، بەلاّم دەبێ بە وریاییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، لەبەر ئەوەی ئەو زانیارییانەی کە هەیە لەو بارەیەوە کەمترین وردبینیان تیادا بەدیدەکرێ لەو داتایانەی کە لەسەرچاوە سەرەکییەکانی زانیارییە دیموگرافییەکانی چنگ دەکەوێت.



## ١- سەرژمێرییەکانی دانیشتوان:

سەرژمێری دانیشتوان بریتییە لە ژماردنێکی گشتگیری دانیشتوان لە ناوچەیەکی دیاریکراو (زۆرجار دەوڵەت) سەرژمێری دانیشتوان وێنەیەکی نەگۆڕی قەبارە و تایبەتمەندییەکانی دانیشتوانە لە کاتێکی دیاریکراو کە بەژمارە گوزارشتی لێدەکرد، سەرباری ژماردنی دانیشتوان زۆربەی سەرژمێرییەکان داتای دیکە کۆدەکەنەوە وەك تەمەن، جۆر، شوێنی نیشتەجێبوون و شوێنی لەدایکبوون، داهات، پیشە، ئاستی رۆشنبیری، ئایین، ئەو زانیارییانەی لەسەرژمێری کۆدەکرێنەوە پشت بە مەودای فەراهەمبوونی لایەنی ماددی بۆ ئەنجامدانی سەرژمێرییەکە دەبەستێ، چونکە سەرژمێری پرۆسەیەکی سەرەکییە و خەرجیەکی زۆری دەوێ و پێویستی بە ئەزموونی بالاّ و پلانرێژی هەیە تا سەر بکەوێ، بۆیە سەرژمێری بەهۆی دەوڵەتەوە ئەنجامدەدرێ، یەکەم دەرکەوتنی سەرژمێری دانیشتوان لەولاّتانی نێوان دوو زێ لە عێراق لە شارستانیەتی سۆمەری و بابل دەرکەوت، دواجار لەمیسر زۆربەی پرۆسەکانی سەرژمێری دانیشتوان لەچاخە یەکەمینەکانی مێژوو بەمەبەستی خزمەتکردنی سەربازی و هێزی کار و وەرگرتنی باج بووە، جێگای سەرسوڕمانە وشەی سەرژمێری بە لاتینی واتە خەملاّندن یا قەبلاّندن یا سەپاندنی باج، یەکەم سەرژمێری رەسمی لە ولاّتە ئەسکەندەناڤییەکان دەرکەوت، بۆ یەکەم جاریش لە سوید لە ساڵی ١٧٤٩ و بەشێوەیەکی رێك و پێك، بەلاّم لە ساڵی ١٧٦٩ بە نەرویژ و دانیمارك دەستپێکرد. یەکەم سەرژمێری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٧٩٠ ئەنجامدرا، هەڵبەتە ویلایەتە یەکگرتووەکان یەکەم ولاّت بوو یاسایەکی بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری بەشێوەیەکی خولاوەیی و بەردەوام دارشت.

ناکرێ بڵێین دەوڵەت سەرژمێری دانیشتوانی تەواو ئەنجامداوە، بەڵکو دەبێ بزانین ئەگەر ئەو سەرژمێرییە بەشێوەیەکی بازنەیی بوو یا هەر دە (١٠) ساڵ جارێك بووە یان نا، زۆرێك لە ولاّتان بە شێوەیەکی رێك و پێك سەرژمێری ئەنجامنادەن، بۆ یەکەمجار لە چین لە ساڵی ١٩٥٣ سەرژمێری کرا، بەلاّم دووەمجار لە ساڵی ١٩٨٣ بوو،

زۆربەی هەموارکردن و چاکسازیکردنەکان تا ئێستاش  پێویستن بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری و دانانی زانیاری، ئەمە لەگەڵ ئەوەی تەنها (٢٪)ی دانیشتوانی جیهان لەو وڵاتانە دەژین کە بەشێوەیەکی رێك و پێك سەرژمێری دانیشتوانیان ئەنجامدەدرێ.

## ٢- تۆمارە ژیانییەکان (الاحصاءات الحيوية):

تۆمارە ژیانییەکان بە سەرچاوەیەکی سەرەکی دادەنرێن بۆ زانیارییە دیموگرافییەکان، چونکە ئامارە ژیانییەکان لەکاتی روودانیان یا نزیك لە کاتی روودانیان تۆمار دەکرێن، تۆمارە ژیانییەکان: مردن، مردنی کۆرپە، لەدایکبوون، هاوسەرگیری، تەلاق، نەخۆشی و دەرد و پەتاکان دەگرێتەوە. بە پێچەوانەی سەرژمێرییەوە (کەزانیارییەکانی لەبارەی دانیشتوانەوە جێگیرە) کەچی سیستەمی تۆمارکردنی ژیانی سیستەمێکی دینامیکی رووداوە ژیانییەکانە کە بەشێوەیەکی خێرا و بەردەوام لەگۆڕاندان، بەرپرسیارەتی سەرەکی لە کۆمەککردن بە رووداوە ژیانییەکان دادەنرێت بۆ بەرپرسان، لە باری شارستانیش دەوڵەت پشتی پێ دەبەستێت، هەڵبەت دەبێ ئەو رووداوانە لە نوسینگەی باری شارستانی لۆکاڵی لەلایەن دایك و باوك یا خزمەکان یا لایەن دکتۆر یا لەلایەن مامانی یاساییەوە یا لەلایەن بەرپرسانی دادوەری شەرعی یا کلێساوە بە بەرپرسان دەگەیەنرێن. (seltzer-1973) دەڵێ: سیستەمی تۆماری ژیانی نموونەی ئەمانە دەگرێتەوە: پێڕاگەیاندنی حاڵەتی مردن و لەدایکبوون  دەست بەجێ. گەیاندنی ئەم زانیاریانە لە پوختەیەکی ئاماریدا کۆمەك بە ئێمە دەکەن، دەکرێ لە هەژمارکردنی رێژەی ژیانی خەملاندنی دانیشتوان ئەنجامبدەین، ئەگەر سیستەمی تۆماری ژیانی بە چالاکی کاری کرد ئەوە دەتوانێ زۆر بەوردی رێژەی مردن و لەدایکبوون بخەملێنرێ.

سیستەمی تۆماری ژیانی لە وڵاتانی باکووری ئەوروپا: بەلجیکا و هۆڵەندا و فینلەندا و وڵاتانی ئەسکەندەناڤی بەسیستەمێکی تەواوکار دادەنرێ کەنوسینگەی



باری شارستانی محەلی فایلێکی تایبەت بۆ هەر تاکێکی ناوچەکە تەرخاندەکات، رووداوە دیموگرافییە سەرەکییەکان لەو فایلەدا تۆمار دەکەن، وەك: هاوسەرگیری، تەلاق، گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوون، دەکرێ بەشێوەیەکی دەستەو بەجێ ئەو زانیاریانە بەدەست بهێنرێن.

راستییەکەی پرۆسەی کۆکردنەوە و تۆماری ژمارە ژیانییەکان لەرووی مێژووییەوە ئەرکی پیاوانی ئایینی و کلێساکان بووە، زۆربەی شارستانییەتەکان هەندێ شێوەی ئاهەنگیری بەبۆنەی ئەو رووداوە ژیانیانەوە بەخۆوە بینیوە: وەك ئاهەنگی لەدایکبوون و مارەکردن و هاوسەرگیری و مردن، سیستەمی ئامارەکان لە ساڵی ٧١٠ ی پێش زایین لەهەندێ بەشی ژاپۆن دەستیپێکرد، بەلام لە ساڵی ١٤٩٧ لە (تۆکیۆ) بە شێوەیەکی رەسمی دەستیپێکرد.

لە سەردەمی هنری سێیەم لە ئینگلتەرا بڕیارێك دەرکرا بۆ تۆمارکردنی ژمارەی ئەو منالانەی کە تەعمید کران هەروەها تۆمارکردنی حاڵەتەکانی هاوسەرگیری و ژمارەی بەخاکسپاردن، لە ساڵی ١٥٦٣ پرۆسەی تۆمارکردنی بەخاکسپاردن  و تەعمید لە کلێسا کاسۆلیکییەکانی رۆمانی بوون بە پرۆسەیەکی زۆرەملێ، زۆربەی تۆمارە ساڵانەییەکانی سەرەتا لەلای قەشە و دێر و کلێساکان بەدەستدەکەوتن، ئەوەش بەهۆی بلاوبونەوەی نەخۆشی تاعونی ترسناك لەو کاتەدا، زۆربەی ئەوتۆمارە کۆنانە بە تێپەربوونی کات یا سوتان یا بەهۆی لافاو و دەرد و بەلا  لەناوچوون، دەزگا حکومییەکان (تا کۆتایی سەدەی هەژدە) وردە وردە شوێنی کلێساکانیان گرتەوە (تۆمارکردنی رووداوە ژیانییەکان) بۆ وێنە: لە ساڵی ١٧٥٦ تۆماری ژیانی لە سوید دەستیپێکرد، پاشان لە فەرەنسا لە ساڵی ١٧٩٢، لە ئینگلتەراش لە ساڵی ١٨٣٧ لە ئیرلەندا ساڵی ١٨٦٤، لە ژێر رۆشنایی ئەمەدا داتاکانی تۆماری ژیانی لەو کاتەدا فەراهەمبوو کە تیایدا سەرژمێری دانیشتوان دەرکەوت.

تۆمارکردنی لە دایکبوون و مردن لەکاتی ئێستادا لەزۆربەی وڵاتانی وەك ئەمریکای باکوور و ئەمریکای باشوور، بەتۆمارێکی تەواو دادەنرێن، لەگەڵ ئەوەشدا

بەهۆی لێپرسینەوە ئیدارییەکان و هەستی زۆرینەی خەڵك کە تۆمارکردنی رووداوە ژیانییەکان دوا دەخەن سەیر نییە سیستەمی تۆماری ژیانی فەرمییەکانی نزیکەی (٦٪) لەدایکبووانی زیندوو لە ئەندەنوسیا و باکستان و هیند و کۆریای باشوور و فلیپین تۆماری دەکەن (SELTZER-1973).

بەشێوەیەکی روون تۆمارکردنی مردوان نارێك و پێکترە لە لەدایکبون لە ئاسیادا، رەوشەکە لە ئەفریقیای باشووری بیابان زۆر خراپترە لە ئاسیاش، بۆیە مامەڵەکردن لە گەڵ ورد و دروستی زانیارییەکان لە سیستەمی تۆماری وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان زۆر شت لەبەرچاو دەگیرێ.

لێرەدا دوو گرفتی سەرەکی هەیە سەبارەت بە تۆمارە ژیانییەکان لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان:

١- ژمارەیەکی زۆری مردوان و لەدایکبووان تۆمار ناکرێن.

٢- زۆربەی کەرت و ناوچەکان لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ سیستەمی کۆکردنەوەی زانیارییەکان لەوڵاتدا نییە، بۆیە جێ بەجێکردن لە توێژینەوەی دانیشتوانی جۆگرافی دیموگرافی روونە: رێژەیەکی زۆری کەموکورتی و ناو ورد و دروستی لەناو زانیارییەکانی پیتداری ومردوان لە وڵاتە دواکەوتووەکان هەیە. راستییەکەی ئەم شتە تەنها بەسەر وڵاتە دواکەوتووەکاندا ناچەسپێ، بەڵکو لەوڵاتە پێشکەوتووەکانیش بەرچاو دەکەوێ، ئەمەش حاڵەتە نا شەرعییەکانی هاوسەرگیری و لەدایکبوون و مردن لە بەرچاو بگرین، کە ناوی مناڵە نەویستراوەکان تۆمار ناکرێن، هەروەها تاوانێکیش تۆمار ناکرێ ئەگەر ئاشکرا نەبێ.

### ٣- رووپێوەکانی دانیشتوان بە نموونە:

بەهۆی فاکتەری کات و خەرجی زۆر لەکاتی ئەنجامدانی سەرژمێری زۆرجار رووپێوەکانی دانیشتوان بەنموونە بەکار دەهێنرێن بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پەیوەست بە



دانیشتوان، ئەو رووپێوە بۆیە ئێستا بلاوە چونکە شێوازێکی باشە و پشت بە بنەمای زانستی دەبەستێ و خەرجیشی کەمە، هەروەها ئەم جۆرە رووپێوانە پشت بە بەرزترین پلەی نواندنی کۆمەڵگا دەبەستێ، زۆربەی رووپێوە نموونەییەکان کە بابەتە دیموگرافییەکان دەخەنە بەر باس لەلایەن دامودەزگاکانی ئامارەگشتییەکان و دامەزراوە حکوومی و تایبەتییەکانی ترەوە ئەنجامدەدرێن، دەکرێ لایەنە پۆزەتیڤەکانی رووپێو بە نموونە بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

١- رووپێو بەنموونە کاتێکی زۆر کەمتری دەوێ لە سەرژمێری، ئەگەر کات زۆر گرنگ بێت لێکۆڵینەوەیەکی دیاریکراو ئەو رووپێوە بەنموونە تاکە ئامرازە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێویست.

٢- رووپێو بەنموونە خەرجی کەمتری تێدەچێ لە سەرژمێری گشتگیر.

٣- جۆر و دروستی زانیارییەکان لەرووپێوی نموونەیی باشتر و وردترە لەسەرژمێری گشتگیر، بەتایبەت ژمارەیەکی کەمی توێژەری راهاتوو بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری هەیە.

٤- رووپێو بەنموونە پێویستی بە هەوڵێکی کەمتر و پرۆسەیەکی کەمتر هەیە لە رێکخستنی زانیارییەکان، رووپێو بەنموونە بە ئامرازێکی کەم خەرجی دادەنرێ بۆ کۆکردنەوەی زانیاری ورد.

وەسف و شیکاری دابەشبوونی شوێنجێی لەو بابەتانە دادەنرێ کە بەردەوام لە جوگرافیادا دووبارە دەبنەوە، دیاردەکە دەکەوێتە کوێیەوە؟ هۆکار چییە کەوتۆتە ئەو شوێنە؟ ئەوەش جەوهەری لێکۆڵینەوەی جوگرافییەکانە، لە ژێر تیشکی ئەوەشدا لەم بەشەدا هەوڵدەدەین مەسەلەگەلێکی گرنگ بخەینە روو، وەك: دانیشتوان لە کوێ دابەش دەبن؟ هەورەها شیکردنەوەی هەندێ لەو هۆکارانەی کە لە پشت دابەشبوونی شوێنی دانیشتوانی جیهانەوەن، هەروەها پێکهاتەی تەمەن و جۆری دانیشتوان، نموونەی دابەشبوونی بەسالاّچووان، هەورەها پێکهاتەی نەژادی و ئیتنی دانیشتوان، لە هەندێ ولاّتدا.

تێبینی دەکرێ گۆڕانی کاتی لە دانیشتوانی جیهان هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئاراستەی گەشەکردنی دانیشتوان وردە وردە بەرەو زیادبوونی دەچوو، تاکو (٣٠٠) ساڵی رابردوو کە رێژەکە بە شێوەیەکی خێراتر دەرکەوت.

بەلاّم لە مێژووی مرۆڤایەتی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی ژمارەکان لە هەندێ ناوچەی دیاریکراو دەرکەوت (وەك چین و ئەوروپا) بەدرێژایی مێژووی گەشەکردن ناهاوسەنگبووە لەگەڵێشیدا گەشەکردنی شوێن جێیی ناهاوسەنگبووە، واتە گەشەکردنەکە لەرووی جوگرافیاوە بێ وێنە بووە، ئەوەش بەهۆی ئەوەی گەشەکردنی دانیشتوانی هەندێ ولاّت یا کیشوەر لەوانی تر خێراتر بووە.

ژمارەی دانیشتوان لەناوچەیەکی دیاریکراو شار، دەوڵەت، کەرت، ویلایەتێك ، نەتەوەیەك، پارێزگایەك، یەکەیەکی سیاسی، یەکەم حەقیقەتە کە دەبێ پێش شیکاری بیزانین، ژمارەی دانیشتوان لەیەکەیەکی جوگرافی دیاریکراو بریتییە لە توخمێکی گشتی کە ئێمە بەمەبەستی ئیداری و توێژینەوە پێویستمان پێی دەبێ، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، حوکمی یەکەمین بەسەر دەوڵەت یا هەرێمێك پشت بەستن بە هاوکێشەی رووبەری جوگرافی دەوڵەت و قەبارەی دانیشتوانەکەی دەدرێ، وێڕای ئەوەی ئەو زانیارییانە گرنگییەکی جوگرافیان نییە، دەتوانین ئەوەش بڵێین کە گرنگە پلانرێژان و کۆمەڵناسان، زانیاری دروستیان سەبارەت بە ژمارەی دانیشتوان لە ناوچە جیاوازەکان

هەبێ بەر لەوەی لە ڕێژەی تاوان و هاوسەرگیری و تاوانی نەوجەوانان بکۆڵنەوە، هەروەها ئیدارییەکانیش پێویستیان بەو زانیارییانەیە، ئەمەش لەکاتی دابەشکردنی کەل و پەلی پێویستی وەك کەلوپەلەکانی خوێندن و کشتوکاڵ بۆ پارێزگا و کەرت و شارەوانییەکان، دروستکردنی ڕێگاوبان و دابەشکردنی کارگێڕی.

چەندین لقی مەعریفە و زانستەکان لە ئابووری و زانستە سیاسییەکانیشەوە هەروەها چەندین دامەزراوەی گشتی و تایبەت و پلانڕێژانی هەرێمی و پلاندانەرانی شار، پێویستیان بە زانیاری ورد هەیە سەبارەت بە قەبارەی دانیشتوان.

## تەرزەکانی دابەشبوونی دانیشتوانی جیهان

**شیکردنەوەی دابەشبوونی دانیشتوانی جیهان وەکو لە شێوەی ژمارە (١-٣) دەردەکەوێ، پەردە لەرووی چەندین جۆری تر لادەدا:**

**یەکەم:** ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوانی گۆی زەوی لەسەر رووبەرێکی بچووك و بە چڕییەکی بەرزەوە دەژین. واتە نزیکەی (٩٠٪)ی دانیشتوانی جیهان لەسەرووی (١٠٪) رووبەری زەوی دەژین.

**دووەم:** نزیکەی (٩٠٪) دانیشتوانی جیهان لە باکووری هێڵی کەمەری زەوی دەژین، کەچی لە (١٠٪) کەمتر لە باشووری ئەو هێڵە دەژین، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بڵێین (٨٠٪) رووبەری وشکانی دەکەوێتە لای سەرووی زەوی.

**سێیەم:** دانیشتوانی زەوی لە لێواری کیشوەرەکان کۆبوونەتەوە، خەملاندنەکان ئاماژە بەوە دەدەن (٧٠٪) دانیشتوانی جیهان لە چوارچێوەی (١٠٠٠کم) لەکەناری دەریاکان دەژین و نزیکەی (٦٧٪) یشیان لە چوارچێوەی (٥٠٠کم) دەژین.

**چوارەم:** هەرچەند بەرەو باکوور یا بەرەو باشوور بکشێین ژمارەی دانیشتوانی لەگەڵ هێڵێ پانیدا دژییێك دەبێتەوە، جگە لەو ناوچانەی کە بەهۆی بوونی کانزا و



سووتەمەنی و بەهۆی گەشتوگوزاربوونیان خەڵکی ڕادەکێشن، بەڵام ناوچە شاخاوییەکان لەچالاکی ئابوورییاندا دیاریکراون و سەرنجی دانیشتوان بەلای خۆیدا ڕاناکێشن.

لەجیهاندا چوار ناوچەی قەرەباڵغ بە دانیشتوان هەن، باشووری ئاسیا، ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ڕۆژئاوایی ئەوروپا، باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەمریکا، ناوچەی یەکەم: هیند و پاکستان و سریلانکا و بۆرما و کەمبۆدیا و تایلاند دەگرێتەوە. بەڵام ناوچەی دووەم: چین و کۆریا و ژاپۆن و بەشێك لە فلیپین دەگرێتەوە، ناوچەی سێیەمیش کۆمۆن و وێلزی سەربەخۆی ڕووسیا و ئیتاڵیا و ئەڵمانیا و وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا دەگرێتەوە. ناوچەی چوارەمیش ناوچە شارنشینییەکانی ڕۆژهەڵاتی کەنەدا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەگرێتەوە.

## ئاوەدانی و چۆڵەوانی (نا ئاوەدانی)

یەکێك لەو ڕێگایانەی کە دەکرێ بەهۆیەوە وەسفی دابەشبوونی دانیشتوانی جیهان بکەین ئەوەی جیهان دابەشی سەر دوو ناوچە بکەین: ئاوەدانی و نا ئاوەدانی.

**ئاوەدانی** بریتییە لە ئەو بەشەی کە هەمیشە ئاوەدانە و خەڵکی تیایدا دەژین یا ئەو ناوچانەی بەردەوام دانیشتوانی لێ نیشتەجێیە، بەڵام نا ئاوەدان ئەو بەشەیە کە خەڵکی لێ نییە، یەکەمجار ئاسانە جیهان دابەشی سەر ناوچەی ئاوەدان و نا ئاوەدان بکەین، بەڵام ڕاستییەکەی دابەشکردن پرۆسەیەکی زۆر دژوارە، چونکە هیچ ناوچەیەکی نییە لە جیهان بەردەوام ئاوەدان بێ یا نا ئاوەدان بێ تا بتوانین وێنەی دابەشبوونی دانیشتوانی بۆ بکەین.

کەش و هەوا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە دیاریکردنی ئەو دوو جۆرە سەرەکییە، ناوچە هەمیشە بەستەڵەکەکان، بە ناوچەیەکی نا ئاوەدان لە قەڵەم دراون، هەروەها دەکرێ زۆرترین ناوچە وشکەکانی جیهانیش جیا بکەینەوە، بەڵام زۆربەی ناوچە نا ئاوەدانەکانی تر دابڕان ( وەك زنجیرە چیاکان)، کە یا چۆڵن یا خەڵکی لێ پەرش و

بلاوبۆتەوە. لە (٣٠٪)ی رووبەر وشکانی گۆی زەوی بە زەوی چۆڵەوانی دادەنرێ بەبێ ئەوەی هیچ گرنگییەکی هەبێ بۆ نیشتەجێبوونی دانیشتوان، هەروەها چەندین ناوچەی فراوانیش دارستانن و بەکەڵکی نیشتەجێبوونی دانیشتوان نایەن.

بەمەش ناوچە ئاوەدانەکان دەبێتە (٣٥-٤٠٪) رووبەری وشکانی گۆی زەوی، ئەوەش رێژەیەکە لەرووبەری گۆی زەوی بەبێ ئەوەی دانیشتوان بەبەردەوام لێی نیشتەجێبن، هەڵبەتە ئێستا ناوچە چۆڵەوانییەکان لە جاران بچووکترە، چونکە مێژوویی مرۆی بە شێوەیەکی فراوان جێ پەنجەی خۆی لەسەر ناوچە ئاوەدانەکان جێ هێشتووە.

گەشەی دانیشتوان و پێشکەوتنی تەکنەلۆژی، بۆ وێنە (گونجان و ساردکەرەوە) و دۆزینەوەی سامانە کانزاییەکان لە ناوچە لاتەریکەکان، بوونەتە هۆی ئاوەدانکردنەوەی چەندین ناوچەی نائاوەدان.

لێکۆڵینەوەکانی تر سەبارەت بە ئاوەدانی پەردەی لەسەر هەندێ تایبەتمەندی راکێشانی هەرێم لابرد، کۆبوونەوە دانیشتوانییەکانی ئەنگلۆئەمریکی و ئەورووپی رۆژئاوایی دەکەونە هەمان ناوچەی پانی سەروو، بۆ وێنە ناوچەی کۆبوونەوەی دانیشتوانی ئەنگلۆ ئەمریکی دەرئەنجامێکی راستەوخۆی داگیرکاری ئەورووپییە (بەجۆرێك دانیشتوان پێکناهێنن و ناچارن بەرگەی شارنشینی ئەورووپی بگرن).

ناوچەی کۆبوونەوەی دانیشتوانی ئەرورووپی و ناوچەی کۆبوونەوەی ئەنگلۆ ئەمریکی خاوەن تەکنەلۆژیای پێشکەوتوون، بەرزترین ئاستی ئابووری و رێژەیەکی زۆری دانیشتوانەکانیشیان لە شاردا نیشتەجێن.

لەبەرامبەردا دوو ناوچەی ئاسیایی هەن کە دانیشتوانی جیهانیان لێ کۆبوونەتەوە (جگە لە ژاپۆن) کە تا ئێستا دەچنە خانەی وڵاتانی تازە پێشکەوتوو. لەگەڵ ئەوەی بە پیشەسازبوون و ئاماژەکانی تری پەرەسەندنی ئابووری لە کۆتایی سەدەی رابردوو تارادەیەك وێنەی گۆڕیون، وڵاتە ئاسیاییە پیشەسازییە تازەکان (وڵاتە پڵنگەکان) کۆریاری باشوور و هۆنگ کۆنگ و تایوان و سەنگافوورە دەگرێتەوە، لەگەڵ سەرەتای



هەشتاکانی سەدەی رابردوو چین دەستی کرد بە پرۆسەی دووبارە بونیادنانەوەی ئابووری بە ئامانجی زیندووکردنەوەی ئابووری. لەگەڵ سەرەتای هەزارەی سێهەم ئابووری چین چووە پاڵ گەورەترین رێژەی داهاتی نەتەوەیی، هەرچەندە تا ئێستا لە نزمترین داهاتی تاکەکەس ماوەتەوە. رۆڵی ئابووری پەرەسەندنی چینی لە بازرگانی جیهانیدا بەرچاوە. هەروەك چۆن گۆڕانی هەلومەرجی ئابووری لەو وڵاتە دەرئەنجامی گۆڕانی وێنەی دیموگرافییە.

## چڕی دانیشتوان

چەندین شێواز هەن بۆ پێوانەکردنی چڕی دانیشتوان: بلاوترین پێوەر ئەوەیە کە ژمارەی دانیشتوانی ناوچەیەك لە کۆی رووبەری ئەو ناوچەیە دەپێورێ. ئەو شێوازەش پێی دەوترێ : چڕی حیسابی. خشتەی (١-٣) چڕی دانیشتوانی هەرێمە سەرەکییەکانی جیهان لە سالانی (١٩٦٠-١٩٧٥-١٩٩٥) رووندەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەورووپا و ئاسیا پڕ دانیشتوانترین کیشوەرن، کەچی ناوەندی چڕی لە وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان سێ هێندەی وڵاتە هاوشێوەکانی خۆیانن لە وڵاتە پێشکەوتووەکان. لە هەشتاکانی سەدەی بیست چڕی دانیشتوان لە کیشوەری ئاسیا زۆرتربووە لە چڕی دانیشتوانی کیشوەری ئەورووپا، ئەمە لەکاتێکدا پێشتر ئەورووپا بەرزترین چڕی دانیشتوانی بەخۆوە بینبوو.

**خشتەی ژمارە (١-٣) چڕی دانیشتوانی جیهان و هەرێمە سەرەکییەکان - ١٩٦٠، ١٩٧٥، ١٩٩٥.**

| ناوچەکان | رووبەر (١٠٠٠کم٢) | ١٩٦٠ | ١٩٧٥ | ١٩٩٥ |
|---|---|---|---|---|
| جیهان | ١٣٥,٧٧٩ | ٢٢,١ | ٢٩,٤ | ٤٢ |
| هەرێمە پێشکەوتووەکان | ٦٠,٩٠٧ | ١٦ | ١٨,٦ | ١٩,٢ |
| هەرێمە کەم پێشکەوتووەکان | ٧٤,٨٧٢ | ٢٧ | ٣٩,٥ | ٦٠,٥ |
| ئەوروپا | ٤,٩٣٦ | ٨٦,١ | ٩٦ | ١٠٣,١ |
| ویلایەتە یەکگرتووەکان، کەنەدا | ٢١,٥١٥ | ٩,٢ | ١١ | ١٣,٧ |
| ئۆقیانوسیا | ٨,٥٠٩ | ١,٩ | ٢,٥ | ٣,٣ |
| باشووری ئاسیا | ١٥,٧٧٥ | ٥٤,٩ | ٨٠,٤ | ١١٦,٦ |
| رۆژهەلاتی ئاسیا | ١١,٧٥٦ | ٦٧ | ٨٥,٥ | ١٢٢,٧ |
| ئەفریقیا | ٣٠,٣٢٠ | ٩ | ١٣,٢ | ٢٣,٧ |
| ئەمریکای لاتین | ٥٦٨ ,٢٠ | ١٠,٥ | ١٥,٨ | ٢٣,٤ |

لەگەڵ ئەوەی ژمارەی چڕییەکان پرۆسەیەکی ئاسانە بۆ شیکردنەوەی جیاوازییەکان لە دابەشبوونی دانیشتوان، بەلاّم زۆر لێڵ و نادیارە، لە ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی بیست چڕی دانیشتوان نزیکەی (٤٢) کەس بووە بۆ هەر کیلۆمەترێکی چوارگۆشە لە رووی زەوی، بەلاّم ئۆقیانوسیا (٣) کەس بووە، ئەفریقیا (٢٤) کەس بووە، ئەمریکای باکوور (١٤) کەس، بەلاّم کیشوەرە چڕەکان، چڕی بەرزیان هەبووە (١٠٣) کەس لە ئەوروپا، (١٢٥) کەس لە ئاسیا، چڕییەکان لەسەر ئاستی کیشوەریی جیاواز دەبن، بەلاّم لە چوارچێوەی ناوچە بچووکەکان بە پلەیەکی زۆر جیاواز دەبن، بۆ وێنە: چڕی دانیشتوان لە ئوستralیا (٢,٥ کەس / کم٢)، بەلاّم چڕی لە هۆڵەندا (٤,٥٥ کەس/کم٢). لە ولاّتە قەبارە بچووکەکان، بەتایبەت



ولاّتە دوورگەییەکان زۆرجار چڕی دانیشتوانی بەرزیان هەیە. لەبەرامبەردا چڕی دانیشتوان لە ولاّتە قەبارە گەورەکان کەمترە. وەك روسیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان (٢٧,٩) یەك بەدوای یەك.

کاتێك دەچینە سەر ئەو ناوچە فراوانانەی کە خاوەن جیاوازی ژینگەی گەورەن، بەهای چڕی دانیشتوان گرنگییەکی زۆری نامێنێ. هەرچەندە ناوەندی چڕی دانیشتوانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران (١٣ کەس:کم٢) کەچی چڕی دانیشتوانی بەشی ئاسیای ئەو ولاّتە تەنها (١٠٪) قەبارەی چڕی بەشە ئەوروپییەکەیەتی. چڕی حیسابی بە شێوەیەکی فراوان بەکاردەهێنرێ، چونکە ئەو زانیارییانەی بۆ حیسابکردن پێویستن ئاسان چنگ دەکەون. لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەو زانیارییانە، پەیوەندی نێوان دانیشتوان و سامانی ولاّتیان بۆ راڤە دەکات.

لێرەدا دەبینین ولاّتگەلی دەوڵەمەند هەن و چڕی دانیشتوانی بەرزیشیان هەیە، وەك ئەڵمانیا و ژاپۆن، یا ولاّتی دەوڵەمەند هەیە چڕی دانیشتوانی نزمە وەك: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئوسترالیا، هەروەها ولاّت هەیە هەژارە و چڕی دانیشتوان بەرزە وەك پاکستان و بەنگلادیش و دواجار ولاّتی هەژار و چڕی دانیشتوانی نزم وەك: سودان و چاد.

هەروەها پێوەرێکی تر هەیە بۆ دۆزینەوە و دەرهێنانی چڕی دانیشتوان کە پێی دەوترێ چڕی فیسیۆلۆژی ئەمەش بەدابەشکردنی دانیشتوان بەسەر ئەو زەویانەی کە گونجاون بۆ کشتوکاڵکردن، هەروەها ناکرێت ئەو جیاوازیانە لەبەر چاو بگرین کەلە ئەنجامی تایبەتمەندییە ژینگەییەکانی وەکو ئاو و خاك و ئاو و هەوا دێنە ئاراوە و دەبنە هۆی جیاوازی لەبەرهەمە کشتوکاڵییەکان.

بەپێی بۆچوونەکانی (Trewartha 1969) چڕی فیزیۆلۆژی سەبارەت بە پلەی قەرەباڵغی لە هەرێمێك بەبەراورد بەتوانای سروشتی بەرهەمهێنانی خۆراك و کەلوپەلی خاوی کشتوکاڵی زۆر باشترە لە پێوەری چڕی حیسابی ئەو هەرێمە. چڕی حیسابی ژاپۆن لە ساڵی (١٩٦٠) گەیشتە (٤٠٩کەس/ کم٢) بەلاّم چڕی فیزیۆلۆژی گەیشتە (٢٩٢٥کەس/ کم٢)، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو ولاّتە پێویستی بە هێنانی بڕێکی زۆری سەوزە و میوە هەیە.

## ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەریان بەسەر دابەشبوونی دانیشتوانەوە هەیە

**شیکردنەوەی دابەشبوونی دانیشتوان لە جیهان فاکتەری سەرەکی گرنگ و دیاریکراومان بۆ دەردەخەن:**

١- پەرەسەندنی مێژوویی و تەمەنی نیشتەجێبوونی مرۆڤ لەناوچەیەکی دیاریکراو.

٢- ژینگەی سروشتی و لایەنە پەیوەندیدارەکانی وەك: شێوەکانی زەوی، خاك، باران، نەخشە و سەرچاوەکانی سامانی سروشتی.

٣- پەرەسەندنی ئابووری کۆمەڵایەتی و تەکنەلۆژی هەرێم.

وەکو بۆمان دەردەکەوێ فاکتەرەکانی دوایی زۆر گرنگن، چونکە شارنشینی و سامانی پیشەسازی بەمانا فراوانەکەی بەهەموو جیهاندا بڵاوبۆتەوە، لە ژێر سایەی بوونی بنەمایەکی تەکنەلۆژی پەرەسەندوو و بەردەوام، ژینگە سروشتییەکان کاریگەرییان بەسەر دابەشبونی دانیشتوان لە جیهان کەمتر بۆتەوە، وێرای بوونی هەندێ تێبینی زۆرێك لە ولاتان، تەکنەلۆژیا بە پەنجەرەی دژە رەشەبا و گازی سروشتی یارمەتیمان دەدا بۆ زاڵبوون بەسەر گرفتەکانی زستانە ساردەکاندا، هەروەك گونجانی بارودۆخی ناوچە بیابانییەکان بووە هۆی راکێشانی دانیشتوان.

لەگەڵ پەرەسەندنی ئابووری پێکهاتەی کرێکاری (العمالە) لە کشتوکاڵدا لەکاری سەرەکییەوە گۆڕاوە بۆ زیادبوونی کرێکاران لە کەرتی پیشەسازی و خزمەتگوزاری.

پیشەسازی و خزمەتگوزاریش گرنگترین فاکتەرن بۆ کۆبوونەوەی دانیشتوان لە شار لەگەڵ ئەوەشدا گواستنەوەی دانیشتوان لە لادێوە بۆ ناوچە شارنشینەکان و دووبارە دابەشکردنەوەی دانیشتوان هەمیشە شارنشینبوونی لەگەڵ بووە.



## پێکهاتەی تەمەنی و جۆری دانیشتوان

گرنگترین تایبەتمەندییەکانی دانیشتوان، تەمەن وجۆرە، بەهۆی پابەندی تەمەن و جۆر بە گۆڕانە دانیشتوانییەکانی تری وەك مردن و نەخۆشی و بەپیتی و کۆچ، بە دوو فاکتەری زۆر گرنگ دادەنرێن.

**پێکهاتەی جۆری:** سادەترین پێوەری پێکهاتەی دانیشتوانە، ئامارە پەیوەندیدارەکان بە ئاسان چنگ دەکەون و بەزانیاری ورد لەقەڵەم دەدرێن و لەمانای نێرومێدا ناروونی بوونی نییە و پێویست بە سەرلێشێواندنیش ناکات لەو زانیارییانە.

**رێژەی جۆر** (Sex ratio) بریتییە لە ژمارەی نێر بۆ هەر (١٠٠) مێیینەیەك، بۆ وێنە رێژەی جۆر (٩٥,٤) بۆ یەکێك لە ولاتان لە ساڵی (١٩٩٥)، ئەوەش بەم شێوەیە حیسابکراوە: ژمارەی نێرینەی ولات دابەشی سەر ژمارەی مێینەی هەمان ولات دەکەین و ئەنجامەکەشی جارانی (١٠٠) دەکەین، ئەگەر ژمارەی نێرینە (١٢٧٠٦٧٠٠٠) و ژمارەی مێینە (١٣٣٢٦٥٠٠٠) بێت ئەوە رێژەی جۆرە بەم شێوەیە دەبێت:

$$\text{٩٥,٤} = \text{١٠٠٠} \times \frac{\text{١٢٧٠٦٧٠٠٠}}{\text{١٣٣٢٦٥٠٠٠}}$$

ئەو رێژە جۆرییەی کە یەکسانە بە (١٠٠) واتە ژمارەی نێر یەکسانە بە ژمارەی مێ لەو کۆمەڵگایە، بەڵام ئەگەر رێژەکە لە (١٠٠) زیاتر بوو، ئەوە مانای زۆربوونی ژمارەی نێرینەیە بەسەر ژمارەی مێینەدا، گرنگترین ئەو فاکتەرانەی کە کار دەکەنە سەر رێژەی جۆر بریتین لە:

١- جیاوازی لە رێژەی مردن لە نێوان هەردوو رگەز (هەردوو جۆرەکە).

٢- جیاوازی لە رێژەی پوختی کۆچ لە نێوان هەردوو رگەزەکە.

٣- رێژەی جۆری تازە لە دایکبووان.

سەرجەم سەرژمێرییە تازەکان ڕێژەی جۆر و ژمارەی نێر و مێ لە کۆمەڵگای دانیشتوانی دەژمێرن. ئەو زانیارییانەی کە سەبارەت بە نێر و مێن بە وردترین زانیاری دانیشتوانی لە قەڵەم دەدرێن.

**ئەگەر ڕێژەی جۆر و پەیوەندی جۆرمان بەدیاردە دیموگرافییەکانی تری وەك لە دایکبوون و مردن و کۆچ دەرخست، ئەوە ئێمە ڕووبەڕووی هەندێ ڕاستی دەبینەوە:**

١- ڕێژەی جۆر لە جیهان بەشێوەیەکی گشتی دەگاتە (١٠٥) نێر بۆ هەر (١٠٠) مێینەیەك لە کاتی لەدایکبووندا.

٢- لەسەرجەم قۆناغەکانی تەمەن مێینەکان بە ڕێژەیەکی کەمتر لە نێرینەکان دەمرن.

٣- لەکاتی کۆچ لە لادێیەوە بۆ شار و لەحاڵەتی کۆچە مەودا کورتەکانی تر ڕێژەی مێینە بەسەر نێرینەکاندا زیاتر دەبێ.

٤- لەکاتی کۆچی نێودەوڵەتی و مەودا درێژەکان ڕێژەی نێرینە بەسەر مێینەدا زیاد دەکات.

## جیاوازییە نێودەوڵەتییەکان لە پێکهاتەی جۆریدا

هەرچەندە لەکاتی لەدایکبووندا ڕێژەی نێرینە لە مێینە زیاترە، کەچی مێینە زیاتر لە نێرینەکان توانای مانەوەیان هەیە بەتایبەت لەو ناوچانەی کە چاودێری پزیشکی باشیان لێ هەیە، بۆیە ئێمە پێشبینی دەکەین ڕێژەی جۆری وڵاتە پێشکەوتووەکان نزمە و ڕێژەی جۆری وڵاتە دواکەوتووەکان بەرزە، بەجۆرێك مردنی کۆرپەلە و پیتی تا ئێستا بەرزن، چەند وڵاتێکی کەم لەجیهان هەن ڕێژەی جۆریان لە (١٠٥) زیاترە یا لە (٩٠) کەمترە.

هۆکاری بەرزبوونەوەی ڕێژەی جۆر دەگەڕێتەوە بۆ فاکتەرگەلی وەك کۆچی هاتووی نێرینەکان و بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردنی مێینەکان بەهۆی نزمی ئاستی تەندروستی نزمبوونەوەی ژمارەی مێینە و بەرزی ئاستی پیتی، پێکهاتەیەکی دانیشتوانی گەنجی لێ دەکەوێتەوە.



لەهەندێ ناوچەدا وەك ڕۆژئاوای مالیزیا و هۆنگ کۆنگ و کوبا کۆچ و زۆربوونی هێزی دەستی کار فاکتەری گرنگن لە دیاریکردنی ڕێژەی جۆر، لەگەڵ ئەوەشدا لە وڵاتەکانی تری وەك لیبیا و پاکستان و هیند و سریلانکا کۆچ هیچ کاریگەرییەکی نییە، بەجۆرێك بەرزبوونەوەی ڕێژەی جۆر لەو وڵاتانە هۆکاری بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردنی مێینە زیاتر لە نێرینەکان، ئەو وڵاتانەی کە ڕێژەی جۆری نزم بەخۆوە دەبینن بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە ئەوروپا بەرچاو دەکەوێ، و نزمبوونەوەی ڕێژەکە لەوێدا دەگەڕێتەوە بۆ ژمارەی زۆری کۆچکردنی دەرەکی کە زۆربەیان نێرینەن، هەروەها هۆکاری تریش هەیە وەك کوژرانی زۆرینەی نێرینەکان لە جەنگی دووەمی جیهانی.

## جۆر و جێندەر

هەرچەندە دیموگرافیناسان و جوگارفیناسان لە مێژە ڕێژەی جۆریان بەوە جیاکردۆتەوە کە پێوەرێکە بۆ دابەشکردنی ڕێژەیی نێرینە و مێینە لە هەر کۆمەڵگایەکی دانیشتوانی، کەچی لە ماوەی ئەم دەیەی دوایی سەدەی بیست گرنگییەکی زۆر دەدرێ بە مەسەلەی رگەز و لێکۆڵینەوە رەگەزییە جێندەرییەکان، لێکۆڵینەوە جێندەرییەکان یا رگەزییەکان لەلای جوگرافیناسان و توێژەرانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە گرنگی بە جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان هەردوو رگەزەکە دەدرێ بەبەراورد بە جیاوازییە بایۆلۆژییەکان. بەنموونەی ئەو جیاوازییە کۆمەڵایەتیانە لە نێوان هەردوو رەگەزە (ڕۆڵە رگەزییەکان) بەشێوەیەکی تەقلیدی لەو شێوازە جیاوازانە دەردەکەوێ کە ڕۆڵەکانی نێر و مێ لە کۆمەڵگا پێ جیادەکرێتەوە، هەر لە هەلی فێربوونی زووەوە لە وڵاتە دواکەوتووەکان تا دەگاتە قەشە شوشەییەکانی ئەمریکا و لە ژنانیش وەك سکرتێر و سستەر و پیاوانیش وەکو کرێکارانی پیشەسازی و پزیشکان.

ئەو جۆراندنە کۆمەڵایەتییە دەکرێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاواز بێ، بەڵام جوگرافیناسان زۆر گرنگی بە ڕۆڵی شوێن دەدەن لە جیاوازییە رگەزییەکان.

هەڵبەتە زەمینەیەکی هاوبەش لەنێوان جوگرافیای ژنان و لێکۆڵینەوە جوگرافییەکانی رگەز هەیە. کە ئەم شتانە دەگرێتەوە، وەسف و شیکردنەوەی ئەزموونەکانی ژن، گرنگیدان بە جۆریەتی ژیانی ئافرەت و روانگەی سیاسی بۆ یەکسانی نێوان هەردوو رگەز.

## پێکهاتەی تەمەنیی دانیشتوان

زۆرینەی رەفتارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتوان رێژەی دانیشتوان لە هەموو دەستە تەمەنییەکان دیاریان دەکات. چەند هۆکارێك هەن دەکەونە پشت گرنگی زانستی پێکهاتەی تەمەنی دانیشتوان و رۆڵی ئەو پێکهاتەیە لە شیکاری دانیشتوان:

**یەکەم:** تەمەن شەخسیترین تایبەتمەندی تاکەکانە. تاك بیر لە چی دەکاتەوە، چی دەکات، پێداویستییەکانی چین؟ سەرجەم ئەو پێداویستیانە بە شێوەیەکی توندوتۆڵ بەتەمەنی مرۆڤ بەستراونەتەوە.

**دووەم:** دەستە تەمەنییەکان دەستنیشانکەری گرنگی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەموو کۆمەڵگایەکن.

**سێیەم:** دەبێ توێژینەوەری لێهاتووی بابەتی دانیشتوان ئەو شارەزاییە هونەریانە بەدەستبهێنێ کە پێویستن بۆ دەرخستنی تایبەتمەندییە گرنگەکانی پێکهاتەی تەمەنی دانیشتوانی کۆمەڵگای لێکۆڵینەوەکەی.

هەڵبەتە ئەو تایبەتمەندییانە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی و ئاراستەکردنی زۆر پێویستن، هەروەها لەبەر ئەوەی پێکهاتەی تەمەنی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ تایبەتمەندییە دیموگرافییەکانی دیکەی وەك رێژەی لەدایکبوون و رێژەی مردوان و رێژەی کۆچ و رێژەی هاوسەرگیری هەیە، بۆیە دەبێ وریا بین لە کاتی بەراوردکردن و شیکاری کە ئەو تایبەتمەندیانە لەخۆ دەگرێت.



## ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەریان لە پێکهاتەی تەمەندا هەیە

لەهەر وڵاتێکدا فاکتەرگەلێکی زۆر هەن کە کار دەکەنە سەر پێکهاتەی تەمەنی دانیشتوان، بەڵام فاکتەری سەرەکی رێژەی لەدایکبوونە، ئەوکۆمەڵگا پڕ دانیشتوانەی کە رێژەیەکی بەرزی لەدایکبوون بە خۆیەوە دەبینێت رێژەیەکی زۆری دانیشتوانی تەمەنی بچووك لەخۆ دەگرێ، بەڵام ئەو کۆمەڵگایانەی رێژەیەکی نزمی لەدایکبوونیان هەیە رێژەی تەمەن بچووکیان کەمە. هەندێك بیرورا هەن پێیان وایە نزمبوونەوەی رێژەی مردن کار دەکاتە سەر پێکهاتەی تەمەنی ئەوەش لەمیانی بوونی رێژەیەکی بەرزی گەورە تەمەنان، راستییەکەی ئەو رێژەیە دەرئەنجامی پێشکەوتنی تەندروستییە کە ژیانی تاکەکان درێژ دەکات، بۆیە رێژەی گەورە تەمەنان لەکۆ کۆمەڵگا زیاد دەبێ، هەڵبەتە کاریگەری بەپیتی لەسەر پێکهاتەی تەمەنی گەورەترە لە کاریگەری مردن.

کاریگەری کۆچ بە شێوەیەکی گشتی بەسەر پێکهاتەی تەمەنی دانیشتوان رەنگە بەهۆی ئەوەی زۆربەی وڵاتان کۆت و بەندیان لەسەر کۆچی نێودەوڵەتی داناوە، کەمبێ. لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بە کۆمەڵگایەکی پڕ دانیشتوان لە هەر وڵاتێك یا لە هەر کەرت یا هەرێم یا پارێزگا یا هەر شارێك، تەنانەت هەندێ بەشی ناو شارێك کاریگەری کۆچ بەسەر پێکهاتەی تەمەنی ئەو شوێنانە بەروونی دەردەکەوێ. کۆچ بەشێوەیەکی گشتی سەبارەت بە رێژەی تەمەن شتێکی لە سەرپشکانەیە (انتقائیە)، واتە زۆرینەی جۆرەکانی کۆچ رێژەیەکی زۆری گەنجان دەگرێتەوە ئەو گەنجانەی کە دەتوانن کار بکەن، ئەو ناوچانەی کە ژمارەیەکی زۆر کۆچبەران لێوەی کۆچدەکەن، رێژەی گەنجانیان کەمە لە دەستەی تەمەنی (٢٠-٤٠)ساڵ، بەڵام ئەو هەرێمەی کە کۆچی زۆری بۆ دەکرێ و پێشوازی لە ژمارەیەکی زۆر کۆچی ناوخۆی دەکات رێژەی گەنجی زۆرە.

کارەساتەکانی وەك برسیەتی و دەرد و نەخۆشی و جەنگ کاریگەری راستەوخۆیان بەسەر پێکهاتەی تەمەنی هەر ناوچەیەك هەیە، بۆ وێنە جەنگ کاریگەرییەکی

دوولایەنەی بەسەر پێکهاتەی تەمەنیەوە هەیە، یەکەم: زۆرینەی گەنجانی تەمەن ناوەند لە بەرەکانی جەنگدا لەناو دەچن.

دووەم: لەسەروەختی جەنگدا هەمیشە ڕێژەی لەدایکبوون لەنزمبوونەوەدایە.

## هەرەمەکانی دانیشتوان

هەرەمی دانیشتوانی، (یا هەرەمی تەمەنی جۆری) وێنەیەکی بەیانییە دابەشکردنی دانیشتوان بە گوێرەی تەمەن و جۆر ڕووندەکاتەوە و پێی دەوترێ (هەرەم)، ئەوەش لەبەر ئەوەی وێنەیەکی (کلاسیکی) ئەو کۆمەڵگایانەیە کە خاوەن پیتییەکی بەرز و لەدایکبوونی بەرزن (تا ئەم دواییەش لە زۆربەی شوێنەکانی جیهان بەکار دەهات)، ئەو هەرەمە دانیشتوانییە بنکەیەکی پانی هەیە، بەهۆی ئەوەی ڕێژەی زۆری لەدایکبوون لەخۆ دەگرێ، دواتر لە بنکەکەوە وردە وردە بۆ سەرەوە لار دەبێتەوە (تا تەمەن گەورەکان)، ئەوەش بەهۆی بەرزی زۆری مردن هاوشان لەگەڵ بەرزبوونەوەی ڕێژەی لەدایکبوون. وێرای جیاوازی ئێران و مەکسیك لەرووی شارستانیەتەوە، بەڵام دابەشبوونی تەمەنی و جۆری لەو دوو وڵاتە ڕەنگدانەوەی وێنەیەکی کلاسیکی هەرەمی دانیشتوانن. هەروەك لە وێنەی (٢-٣) دەردەکەوێ. وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و فەرنسا پێکهاتەی تەمەنی و جۆریان بەسەر شێوەیەکی لا کێشەیەك یا شێوەی هاوتەریبە (بڕوانە شێوەی ٢-٣)، لەگەڵ ئەوەشدا تاکو ئێستا هەر بەوێنەکە دەڵێن (هەرەمی دانیشتوان).

هەرچەندە هەر شێوەیەك یەکسانە بە هەزار وشە، کەچی ئێمە ڕاستەوخۆ، بەچەند وشەیەکی کەم یا هەندێ ژمارەوە پێکهاتەی تەمەنی یا جۆری دانیشتوان دەپێون. ناوەند و ڕێژەی بەخێوکردن(الاعالە) دوو پێوەرن لەوەدیهێنانی ئەو پێوانەیەدا هاوکاریمان دەکەن.



## ڕێژەی بەخێوکردن(الاعالە)و ناوەندی تەمەن

ڕێژەی بەخێوکردن ئاماژەیەکی ئاماری سادەیە و ڕۆڵی پێکهاتەی تەمەنی لە چالاکی بەرهەمهێنانی دانیشتوانمان بۆ دەپێوێ، ئەوەش بەبەراوردکردنی ڕێژەی ئەو تەمەنانەی ناتوانن کار بکەن لەگەڵ ئەوانەی دەتوانن کار بکەن، ڕێژەی بەخێوکردن وا گریمان دەکات تاکەکانی نێوان (١٥-٦٤) ساڵ ئەو تەمەنانەن کە دەتوانن کار بکەن، بەڵام ئەوانەی لە خوارەوەی ئەو تەمەنی (١٥ ساڵ) یا لەسەرووی ئەو تەمەنەوەن (٦٤ ساڵ) توێژێکی بەخێوکراون(المعالە)ن لە کۆمەڵگا.

## ڕێژەی بەخێوکردن (الاعالە) دەکرێ بەم شێوەیە هەژمار بکرێ

ڕێژەی بەخێوکردن (الاعالە) یەکسانە بە دابەشکردنی ژمارەی دانیشتوانی ژێر (١٥ ساڵ) کۆی ژمارەی دانیشتوانی سەروو (٦٥) ساڵ بەسەر ژمارەی دانیشتوانی نێوان (١٥-٦٥)ساڵ جارانی (١٠٠).

ئامانج لە هەژمارکردنی ڕێژەی بەخێوکردن پێوانەکردنی ژمارەی بەخێوکراوەکانە (المعالین) کە (١٠٠) تاکی بەرهەمهێن بە خێویان دەکەن، کەوایە هەندێ وڵات بەهۆی بوونی ژمارەیەکی زۆری بەساڵاچوان ڕێژەی بەخێوکردن (الاعالە) تیایدا بەرزە. بەڵام بەهەمان شێوە هەندێ وڵاتی دیکە هەیە بەهۆی بوونی ژمارەیەکی زۆری منال ڕێژەی بەخێوکردن (الاعالە) تیایاندا بەرزە.

بەهۆی نەبوونی زانیاری نێودەوڵەتی بۆ بەراوردکردنی چالاکی ئابووری دانیشتوان، ڕێژەی بەخێوکردن (الاعالە) بەکار دێ بۆ ڕەنگدانەوەی جیاوازییەکانی بەخێوکردنی ئابووری، لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە دانیشتوان لەتەمەنی بەخێوکردندان (الاعالە) کەچی کار دەکەن، بەڵام هەندێکی تر هەمن توانای کارکردنیان هەیە، کەچی لەرووی ئابورییەوە بە بەخێوکردن (الاعالە) لەقەڵەم دەدرێن، بەتایبەت لە کۆمەڵگا ڕۆژئاوییەکان، بۆ بەراوردکردن، ئێمە دەبینین ڕێژەی بە خێوکردن (الاعالە) لە

(غانا) (١٠٤)ە، واتە هەر (١٠٠) کەسێك لە دانیشتوان ئەوانەی دەتوانن کار بکەن (١٠٤) کەسیان بە خێو بکەن (یعیلون) لە دەرەوەی هێزی کارگەرن. بەڵام دەبینین ئەو ڕێژەیە لە ژاپۆن (٤٧) واتە بۆ هەر (١٠٠) کەسێك کە توانای کاریان هەیە تەنها (٤٧) کەسیان کار ناکەن و لەدەرەوەی هێزی کارن.

**ناوەندە تەمەن:** بە شێوەیەکی گشتی ناوەندە تەمەن پێوەرێکە ئەو تەمەنە دیاریدەکات نیوەی دانیشتوان لەسەرووی ئەو تەمەنەوەن و نیوەکەی تریش لەخوارووی ئەو تەمەنەوەن، لە شێوەی (٢-٣) هەرەمی دانیشتوانی ئێران و مەکسیك و ویلایەتە یەکگرتووەکان و فەرەنسا دەردەخات، تەمەنی ناوەند (١,٨١ ، ٢٠,١ ، ٣٣,١ ، ٣٤,٨) دوا بەدوای یەك، بۆیە جیاوازییەکی ئاشکرا لە شێوەی هەرمەکانی دابەشبوونی تەمەن لەنێوان وڵاتانی تازەگەشەسەندوو وڵاتانی پێشکەوتوو بەدی دەکرێت، ئەم جیاوازییەش ڕەنگدانەوەی جیاوازی ناوەندە تەمەنە.

## جۆرەکانی پێکهاتەی تەمەنی لە جیهان

ئەگەر تەماشای پێکهاتەی تەمەنی دانیشتوان بکەین لە جیهان دەبینین زۆرینەی دانیشتوانی جیهان منداڵ تەمەنن و لە وڵاتە تازەپێشگەوتووەکان دەژین، ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتین. بەجۆرێك نیوەی دانیشتوان لە زۆربەی وڵاتان لە ژێر تەمەنی (١٥) ساڵین، گەورە تەمەنان ڕێژەیەك پێکدەهێنن کەمترە لە (٤٪)ی دانیشتوانی ئەفریقیا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین. لە ساڵی (١٩٩٥) ڕێژەی تەمەن منداڵی ژێر (١٥ ساڵ) لەهەندێ وڵات بەم شێوەیە بوو:

تەنزانیا (٤٧٪)، غەززە (٥٠٪)، بەنین (٤٧٪)، غانا (٤٥٪)، سوریا (٤٩٪)، نایجیریا (٤٩٪)، هیندۆراس (٤٧٪)، ڕێژەی لە دایکبوونی بەرز لەو وڵاتانە جەخت لەسەر زۆربوونی هاوسەرگیری تازە دەکات، ئەگەر ئەو هاوسەرانە بەنیازی دروستکردنی خێزانی قەبارە بچووك بن.



ئەوروپا بەرزترین ڕێژەی بە ساڵاچوان لەخۆ دەگرێ، کە دەگاتە (١٣٪) ی سەرووی تەمەن (٦٥) ساڵ و زیاتریش، رەنگە ئەو ڕێژەیە لەهەندێ وڵات بە شێوەیەکی سەربەخۆ بەرز بێ وەك: ئەڵمانیا (١٥٪)، سوید (١٨٪)، نەرویج (١٦٪)، بەریتانیا (١٦٪)، وەکو دەشزانین ڕێژەی لە دایکبوان لەو وڵاتانە زۆر نزمە، بۆیە پیربوونی دانیشتوان (واتە بەهۆی ئەوەی زۆربەی دانیشتوان پیرن) لە ئەوروپا حکوومەتی ناچارکردووە چاو بە خەرجی پزیشکی و کۆمەڵایەتی بەساڵاچوان بخشێنێتەوە.

## نەژاد و ئیتنی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان: وەکو نموونە بۆ پێکهاتەی نەژادی دانیشتوان

پێکهاتەی نەژادی و پێکهاتەی ئەتنۆگرافی دانیشتوان بابەتگەلی گرنگن لە پێکهاتەی دانیشتوان، بەتایبەت لەوڵاتە گەورە و فرە نەژادەکان، هەروەها ئەو وڵاتانە گۆڕانی دیموگرافی جیاواز بەخۆوە دەبینن، هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تاکە وڵاتە لەو چەشنە، بەڵام لەم بوارەدا نموونەیەکی بەکەڵکە بۆ ئێمە، هەندێ لە جوگرافیناسان جەختیان کردووە کە جیاوازی لە بەها و ئاراستەی پیشەیی و شێوازی ژیان و بیروباوەڕی ئایینی و شێوازە کۆمەڵایەتییەکان پشت بە باکگراوندی ئیتنی دەبەستن، کە دەشێ هەندێ کات دەربکەوێ و برێ جاریش لەبەرچاوی خەڵك بە شاراوەیی بمێنێتەوە، فاکتەری ئیتنی لە دروستبوونی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و جۆرەکانی پێکهاتەی سیاسی و ئابووری و ئایینی و شێوازی ژیان و خواردنی باو و پرۆسەی گۆڕانی کلتووری شارستانی لە ئەمریکا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ ( turner, aleen-1988).

هەروەها ئەو جۆرە گۆڕانانە لە ئاستی نەتەوەییەوە بۆ ئاستی خۆجێی دەکرێ بە پێوەری جیاواز پێوانە بکرێن، جوگرافیناسان لە وڵاتانی تر و لە ڕوانگەی ترەوە گرنگیان بەم مەسەلەیە داوە، جوانترین نموونەش بۆ ئەو لێکۆڵینەوە جوگرافی و

کۆمەڵایەتییە، لێکۆڵینەوەیە لە بارەی شارێکی کەنەدی و لێکۆڵینەوەی گۆڕانە خێراکانی دەوروبەری نیۆیۆرك.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەمیشە بە گۆڕانی جۆرە نەژادی و ئیتنییەکان وەسفدەکرێ و دوارۆژی ئەمریکاش هەر بەو نەژاد و ئیتنیانە پێکدێ. هەندێ لە جوگرافیناسان هەندێ راڤەی جوگرافیان لەبارەی جۆرە ئیتنییەکانی ئەمریکای هاوچەرخ خستووەتەروو، جگە لەو لێکۆڵینەوانەی پەیوەستن بە کۆمەڵە نەژادی و ئیتنییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان  کە جوگرافیناسان و کۆمەڵناسان و ئەوانی تر نووسیویانە دەکرێ چەندین لێکۆڵینەوەی تر لەو بارەوە ئامادە بکرێ.

هەر گفتوگۆکردنێك لەبارەی ئیتنەوە رووبەرووی گرفتی پێناسە و پێوانە دەبێتەوە کە زۆربەیان دەکەونە دەرەوەی چوارچێوەی ئەو رووپێوە جوگرافییە، (galzer-1983) گرفتی پێناسەی بەم شێوەیە دەست نیشانکردووە: چەمکی ئیتنی واتە کۆمەڵێکی کۆمەلایەتی کە چەندین لایەنی کلتووری گشتی پێکیان دەبەستێتەوە، بە شێوەیەکی سەرەکیش نەژاد (السلالە)، ئیتن بەشێکە لە کۆمەڵێك گۆڕانکاری چەند مانایەکی هاوشێوە یا پێك بەستە وەك کۆمەڵەی کەمایەتی، یا کۆمەڵەی نەژادی یا نەتەوە، ئاسان نییە، ئەو چەمکانە لە یەکتر جیابکەینەوە، نەژاد واتە بوونی کۆمەڵێك کە زنجیرەی بنەماڵەی تایبەت بەخۆیان و تایبەتمەندی جەستەیی دیاریکراویان هەیە.

هەروەها دەکرێ بە چەندین پێوەر جیاوازی لە نێوان ئەو گۆڕاوانە بکەین، بەلاّم زانیارییەکانی نوسینگەی سەرژمێری و پۆلینکردنی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەو شتەیە کە بۆ تاوتوێکردنی بابەتی ئیتنی و نەژاد  پشتی پێ دەبەسترێ. لە ئەمریکا سێ کۆمەڵەی سەرەکی هەیە: ئەمریکییە ئەفریقییەکان، ئەمریکییە بەرچەڵەك ئیسپانییەکان، ئەمریکییە ئاسیاییەکان، بە دانیشتوانی دورگەی پاسفیکیشەوە، شێوەی (٣-٣) پێکهاتەی ئیتنی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەردەخات.



# بەشی چوارەم

# تیۆرەکانی گۆڕانی دانیشتوان

ئەگەر بمانەوێ باشتر لە هۆکار و دەرئەنجامی پرۆسە دانیشتوانییەکان تێبگەین، دەبێ لایەنی وەسفی دانیشتوان تێبپەڕێنین و واوەتر لەوە بچین، وێڕای ئەوەش ئەگەر ئێمە توانیمان وێنەی ئایندەی ئاراستەی رووداوە دیموگرافییەکان بکێشین ئەوە دەبێ بە قووڵی لەو ئامرازانە تێبگەین کە بەهۆیەوە گۆڕاوە دیموگرافییەکان لەگەڵ خۆیان و لەگەڵ گۆڕاوە نادیموگرافییەکانی تردا کارلێك دەکەن و ئاوێتە دەبن. سەرباری ئەوە ئێمە پێویستمان بەوەیە لە سروشتی ئەو گۆڕاوانە تێبگەین کە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێ یا جیاواز دەبێ. لەبەر ئەوەی سیستەمە دیموگرافییەکان لەناو چوارچێوەیەکی فراوانی کلتوور و رۆشنبیری کارلێك دەکەن، بۆیە کارێکی ئەستەمە لێکۆڵینەوە لە بارەی راڤەی ئەو گۆڕاوانە بکەین لەسەر ئاستی جیهان.

نموونە و تیۆرەکان پەرەیان سەند، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئێمە بەتواناتربین لە بەستنەوەی گۆڕاوە دیموگرافییەکان بە گۆڕاوە نادیموگرافییەکان و گۆڕاوە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکان کە کاردەکەنە سەر دینامیەتی دانیشتوان. لەم بەشەدا هەندێ تیۆری گۆڕانی دانیشتوان و گرنگی ئەو تیۆرانە و رۆڵیان لە یارمەتیدانی ئێمە بۆ تێگەیشتن گۆڕانی دیموگرافی دوارۆژ دەخەینە بەرباس، بەتایبەت لە ولاتە تازە گەشەسەندووەکان.

**گرنگترین پرسە هەنووکەییەکانی دانیشتوان ئەمانەن:**

١- رێکخەرەکانی گەشەی دانیشتوانی چین؟

٢- گەشەی دانیشتوانی ئێستا کەی رادەوەستێ؟

زۆر بە پوختی ئەگەر ئێمە وا دابنێین گەشەی دانیشتوان دەبێ بوەستێ (ئەمە تەنها گریمانەیەکە)، ئەوە دەبێ سێ شت رووبدات: یەکەم: رێژەی لەدایکبوون کەمبێتەوە، دووەم: رێژەی مردن بەرزبێتەوە، سێیەم: یا تێکەڵەیەك لە نزمبوونەوەی لەدایکبوون و بەرزبوونەوەی مردن دەبێتە هۆی ئەوەی گەشەکردنی دانیشتوان بگاتە سفر. ئەمەش لە نەبوون و نائامادەیی جووڵەی کۆچ دەبێ، واتە دەبێ رێژەی

لەدایکبوون یەکسان بێ بە رێژەی مردن، کەلێنی نێوان رێژەی لەدایکبوون لە جیهان (یەکسانە (٢٣) بە هەزار و رێژەی مردن (٩) بە هەزار) زۆر گەورەیە، بەشێوەیەك لەسەدەی یەکەمی هەزاری سێ ناتوانین بگەینە هاوسەنگی نێوانیان.

هەوڵدان بۆ پێشبینیکردنی چۆنیەتی کۆنترۆڵکردنی گەشەی دانیشتوان، هەروەها کەی ئەوە روودەدات، ئەمە مەسەلەیەکە پڕاوپڕە لە دژواری، بۆیە لەبری پێشبینی دانیشتوان چەند روانگەیەك خروانەتە روو: یەکێك لە روانگەکان دەڵێ: ئەو زیادبوونە خێرایەی دانیشتوان هاوسەنگییەك لە گەشەی دانیشتوان بەدوای خۆیدا دێنێ بەر لەوەی گەشەی دانیشتوان بگاتە قۆناغی وزەی ئیستیعابی[*] کۆتایی زەوی، روانگەیەکی تر دەڵێ: گەشەی خێرایی دانیشتوان دەکەوێتە سەرووی وزەی ئیستعابی زەوی، ئەو بەرزبوونەوەیە لەرێژەی مردن بەهۆی نەبوونی خۆراك زیاتر دەبێ، زیادبوونی ژمارەی مردنیش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان، بەشێوەیەکی کەمتر لەو ژمارەیەی کە زەوی دەتوانێ ئیستیعابی بکا. هەروەها پێشنیارێکی تر هەیە هاوشێوەی روانگەکانی پێشووە دەڵێ: بەرزبوونەوەی ژمارەی دانیشتوانی زەوی بەسەر وزەی ئیستیعابی زەوی قۆناغێکی درێژ لە بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی بەردەوامی دانیشتوان لە ئاستی بەرزتر یا نزمتر لە وزەی ئیستیعابی بەدوای خۆیدا دێنێ، دەشێ مەترسیدارترین شوێنەواری گەشەی خێرای دانیشتوان بەشێوەی ئەڵتەرناتیڤی شوێنەوارەکانی دانیشتوان رووبدات یا دەرکەوێ، کە دەبێتە هۆی بەتاڵبوونەوەی سامانی بەردەست، پاشان دەبێتە هۆی نزمبوونەوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەقەبارەی دانیشتوان. بەلاّم پێشنیاری کۆتایی (کەلەلای هەندێ لە ئابووریناسان برەوی هەیە)، باس لە زیادبوونی بەردەوامی وزەی ئیستیعابی زەوی دەکات کە هەمیشە لەسەرووی رێژەی گەشەی دانیشتوانە، لەهەندێ حاڵەتیشدا بۆماوەیەکی کورت دەشێ گەشەی دانیشتوانی وزەی ئیستیعابی تێپەڕێنێ. بەلاّم بۆ ماوەیەکی کورت دەشێ توانا و داهێنان و داهێنانەکان جارێکی تر توانای ئیستیعابی

(*) وزەی ئیستیعابی: هێنانەدی هاوسەنگییە لە نێوان ژمارەی دانیشتوان و دەرامەتەکانی زەوی.



زەوی بەرز بکەنەوە، مەسەلەی لەباری هەر یەك لەو پێشنیارانە بۆ دوارۆژ پشت بە خەملاّندن و توانایی پێشبینی و پەرسەندنە تیۆرییەکان دەبەستێ.

تیۆر سەبارەت بە ئێمە پێکهاتەیەکی شێوەیی زەینییە بۆ کۆمەڵێك رێسا و یاسا و راستی و بەستنەوەیان بەراستییەکانی ترەوە کە توێژینەوە ئەزموونییەکان دەریانخستتووە، بەراوردکردنی جوگرافیای دانیشتوان و دیموگرافیا و هەندێ زانستی کۆمەلاّیەتی تر بەزانستە سروشتییەکان لە بونیادنانی تیۆر شکستی هێنا، وێرای ئەو پێشکەوتنە خێرایەی کە بونیادنانی تیۆر لەم دەیانەی دوایی بەخۆیانەوە بینیان، تیۆر قاڵبێکی سەرەکییە بۆ هەموو زانستێك، هەر زانستێکیش بەبێ بونیادنانی تیۆری بەهێز لە کەشتییەکی بێ سووکان دەچێ کە بەبێ ئامانج بەرەو نادیار دەڕوا.

جوگرافیناسان و دیموگرافیناسان لەسەر ئەو ئاراستەیە و گرنگیدانە بە بونیادنانی تیۆر هاوڕا و تەبان، گرنگی بونیادنانی تیۆر وەکو رابەرێك یارمەتیمان دەدات لە روونکردنەوەی زانیاری زۆر لەبارەی دانیشتوان و دڕاشتنی خەملاّندنی ئایندەیی بۆی.

## پۆلینکردنی تیۆرەکان

دەکرێ تیۆرەکانی دانیشتوان دابەشی سەر پۆل گەلێکی جیاواز بکرێن.

**تیۆرە سەرەکییەکان:** بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ تەفسیرکردنی رەفتاری دیموگرافی دروستدەبێ.

**تیۆرە لاوەکییەکان:** ئەم تیۆرانە بەشێوەیەکی فراوانتر گرنگی بە شیکردنەوەی ئەو دیاردانە دەدەن کە (تطبیقاتي) دیموگرافیان هەیە، بۆ وێنە: توێژەر بەشێوەیەکی سەرەکی گرنگی بە چینی کۆمەلاّیەتی و رەفتاری ئابووری یا هەندێ دیاردەی نا دیموگرافی دەدات: کاتێك لەم حاڵەتەدا تیۆر دەردەکەوێ دەبێ رەهەندێکی دیموگرافیانەی هەبێ. ئەم جۆرە تیۆرانە دەکرێ بە تیۆری ناوەندی دابنرێن، ئەگەر ویستمان فاکتەرگەلێکی پەیوەست بە پیتی و مردن و کۆچ دیاریبکەین، ئەوە تیۆرەکەمان دەبێتە تیۆرییەکی سەرەکی، هەروەها بەهۆی گرنگیدانی زانیاری

هاوچەرخ بە بابەتی دانیشتوان زۆربەی تیۆرە سەرەکییەکان دوای ماوەی ماڵتۆس دەرکەوتن. تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە گرنگیدان بە لێکۆڵینەوەی دانیشتوان کەم بوو و زۆربەی ئەو تیۆرانەی پابەندبوون بە دانیشتوان لاوەکی بوون.

هەر تیۆرەیەکی دانیشتوانی، لاوەکی یا سەرەکی، دەکرێ لە ژێر یەکێك لە پۆلبەندییەکان دابنرێن: ژینگەیی یا سروشتی، راڤە سروشتییەکان جەخت لەسەر رۆڵی پرۆسە بایۆلۆژییەکان دەکەن و زۆر جاریش توانای مرۆڤ لە خوگونجاندن لەبەرچاو ناگیرێ، تیۆرە ژینگەییەکان لەمیانی پرۆسە هەمە چەشنەکانەوە کەلە شوێنێکەوە بۆ یەکێکی تر و لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێن، تەفسیری رەفتارە دیموگرافییەکان دەکات. لە ئێستادا جەخت لەسەر تیۆرە ژینگەییەکان دەکرێ کە چەمکی ژینگە هەم سروشتی و هەم ژینگەی کۆمەڵایەتی (کلتووری) دەگرێتەوە.

وێڕای ئەو رۆڵە گرنگەی کە خەسڵەتە بۆ ماوەییەکان دەیگێڕن، کەچی تێڕوانینی باوی ئێستا دەڵێ: زۆرینەی هەڵسوکەوت و چالاکییەکانی مرۆڤ کلتوور کۆنترۆڵی کردووە، بە قسەی (Thomlinson – 1976) ساکاری راڤە سروشتییەکان و جێ بەجێکردنەکانیان کە وا پیشاندەدا ئێمە بەرپرس نین لەوەی روودەدا، پرۆسەیەکی سەرنج راکێشە، بەڵام توێژینەوەی لاواز سەرنجی بۆ راڤە کۆمەڵایەتە عەقڵانییە تێکچڕژاوەکان راکێشاوە.

## تیۆرە بەراییەکانی دانیشتوان

نابێ ئەوە بشارینەوە کە ژمارەیەکی کەمی فەیلەسووفە بەناوبانگەکان گرنگیان بە بابەتی دانیشتوان داوە، رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە ئەوان لە جیهانێکی قەرەباڵغی وەکو ئێستا ژیابێتن، زۆرینەی روانگە بەراییەکانی دانیشتوان و ئەو فاکتەرانەی کە کاریان کردۆتەوە سەر پیتداری لەسەر شێوەی ئەفسانەیی میللی سەریان هەڵداوە. (Eversley-1958) دەڵێ: بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەران بەهۆی نەزۆکی و رۆشنبیرە شاربەدەرنراوەکان و پیاوەتی، هێزی وەچەخستنەوە کەمبۆتەوە،



گێل و گەمژەکانیش وەکو کەروێشك مناڵیان خستۆتەوە،! ئەم جۆرە بیروباوەڕانە لەلای زۆربەی دانیشتوان باو بووە، تا ئێستاش هەندێ خەڵك هەن بروایان بەو شتانە هەیە.

رەنگە بڵاوترین بیروباوەڕ لەبارەی دانیشتوان بەر لەهاتنی ماڵتۆس ئەوە بووبێ کە دەڵێ: زۆربوونی گەشەی دانیشتوان شتێکی باشە و نزمبوونەوەی گەشەی دانیشتوان شتێکی خراپە. سەروەت و پێشکەوتنی ماددی بە شێوەیەکی سەرەکی پشتیان بە دەستی کار دەبەست، هێزی کارگەریش وەکو ئامرازێك بۆ پەرەسەندن و پێشکەوتن تەماشاکراوە، بەبەرزبوونەوەی رێژەی مردن لە میانی مێژوویی مرۆڤایەتی باو بووە بۆتە هۆی ئەوەی ئەو کەمبوونەوەیە بە زۆربوونی ژمارەی مناڵ قەرەبوو بکرێتەوە.

## تیۆرەی ماڵتۆس

تۆماس رۆبێرت ماڵتۆس وەکو ئابووریناسێك و وەکو قەشەیەك کاریگەرییەکی دیاری بەسەر ئاراستە و بیروباوەڕەکانی پەیوەست بە گەشەی دانیشتوان هەبووە، تاکو ئێستاش ناوی ئەو لە زۆربەی ئەو گفتوگۆیانەدا هەیە کە سەبارەت بە ئاراستەکانی دانیشتوان ئەنجامدەدرێن، ناوی ئەو وابەستەی بابەتی دانیشتوانە، لەگەڵ ئەوەی دیموگرافیستەکان هەموویان لەسەر ماڵتۆس کۆك نین لەسەر ئەوەی ماڵتۆس شتێکی زانستی گرنگی خستبێتە سەر لێکۆڵینەوەکانی دانیشتوان، بەڵام ئەگەر هیچی نەکردبێ بابەتی دانیشتوانی بۆ بەرزترین ئاستی گفتوگۆ بەرز کردۆتەوە.

ماڵتۆس لە ئینگلتەرا لە ساڵی (١٧٦٦) لە خێزانێکی رەسەن لەدایکبووە، لەسەردەمی شۆڕشی سیاسی و پیشەسازی ژیاوە ، ئەوروپاییەکان لە زۆرینەی مێژووی خۆیاندا شوێنی پێشبینی و چاوەڕوانکردنی چارەنووسێکی دژوارتر و ژیانێکی کورت بوون، مەزهەبی رەشبینی پابەند بوو بەو بیرباوەڕەی کە پێی وابوو کەل و پەل و سامانی ماددی زۆر نییە تا بەکار بهێنرێن، بیری ئابووری لە رۆژگارەکانی ماڵتۆس ئاماژەبوو بەوەی بازرگانی و سیستەمی ئابووری بەسیاسەتە بەهێزەکانی حکوومەت رووەو کەڵەکەکردنی سامانەکان پاڵپشتی دەکرا، هەژاری بە ئیرادەی خوا و بەو کرێیە بەستراوەتەوە کە مرۆڤ بەدەستی دەهێنا.

هەروەها زەوی وەکو شوێنێك بۆ ئەزموون و سزا تەماشا دەکرا. سیاسەتەکانی بازرگانی دانیشتوان لەگەڵ زۆربوونی وەچەخستنەوە بوو، چونکە زۆربوونی ڕێژەی لەدایکبوون واتە زۆربوونی هێزی کار و دواتریش کەڵەکەبوونی زیاتری سەروەت و سامان، هاوکات ماڵتۆس و ئادەم سمس و ریکاردۆ (زانایانی ئابووری) پێکەوە ئاماژەیان بەوە دا کە خواستی جیهانی بۆ کرێی حەقیقی ئەوەیە یەکسان بێ ئەگەر پاشەکشە نەکات، چونکە هەر زیادبوونێك لەسەرمایەی فەراهەم بۆ دانی کرێ هاوکات زیادبوونی ئەو کەسانەشی لەگەڵ دەبێ کە پێویستیان بە کرێیە.

لەسەردەمی ماڵتۆس پرۆسەکانی پیشەسازی پەلەتر بوون و بیروباوەڕەکان بەخێرایی گۆڕان، پرۆسەی پرکردنەوەی هەژاری و پێداویستی بڵاوبووەوە و بەرهەم و بازرگانی بەخێرایی پەرەی سەند و بووە هۆی ئەوەی بوترێ دەرامەتەکان سنووردار نین، وێرای ئەوەش زۆربوونەوەی (خستنەروو و سوو- عرض و فائز) بوونە شتێکی شیاو، لە نێوان هەموو ئەو باکگراوندانە پرۆژەی خەیاڵی و خەونی سەیرو سەمەرە و ڕوانگەی ئایندەیی دەکەوتن. بەپێی تێروانین بۆ دوارۆژ دورخستنەوەی هەژاری و کوێرەوەری و بێ ئومێدی و چاوچنۆکی و تەنانەت مردنیش دەبێ دوور بخرێنەوە، لەگەڵ کەمێك خۆش بەختی و کۆمەڵێك گۆڕان، دەکرێ کۆمەڵگا سەر لەنوێ دەست بەپەرەسەندن بکات. باوکی ماڵتۆس سەرقاڵی ئەو جۆرە بیروباوەرانە بوو، کە پەیوەست بوون بە خۆشگوزەرانی مرۆڤ و کۆمەڵگا، هەمیشە بیرمەندە گەشبینەکانی بانگ دەکردە ماڵی خۆی بۆ گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە، بەڵام لە ژێر سایەی ئەو گفتوگۆیانەدا ماڵتۆس هەڵوێستێکی پێچەوانەی باوکی وەرگرت.

لە ساڵی (١٧٩٨) یەکەم وتاری ماڵتۆس لە ژێر ناونیشانی (وتارێك لەبارەی داهاتووی کۆمەڵگا) بڵاوبووەوە، لەگەڵ هەندێ سەرنج لەسەر پێشبینییەکانی بەڕێز (گۆدوین) و بەڕێز (کۆندرس و نوسەرانی تر)، ماڵتۆس ئەو وتارەی وەکو مەرجەعێکی دیموگرافی نەنوسی، بەو شێوەیەش نا کە یاسایەکی نوێیە بۆ پەرەسەندنی دانیشتوان، تەنانەت مەبەستی ئەوەش نەبوو بیروباوەڕی گەشبینەکان پووچەڵ بکاتەوە کە ئەوکات



بڕەوێکی زۆریان هەبوو، ئامانجی سەرەکی ماڵتۆس لەو وتارە لە ناونیشانەکەی دەرکەوێ، بۆ بێ بەختی ماڵتۆس لە وتارێکی تردا وتبووی ڕێگای گەشبینی دەشێ هەمیشە داخراو بێ، چونکە بەگوێرەی ئەو ڕێگایە دانیشتوان هەمیشە فشار دەخەنە سەر کۆمەڵە سنووردارەکانی بوونیان (دەرامەتەکان).

وتارە سەرەتاییەکانی ماڵتۆس سادەبوون، بۆ وێنە یاسای دانیشتوان بەهۆی دوو مەسەلەی سەرەتایی و گریمانێکەوە داڕشتبوو، مەسەلەی یەکەم: پەیوەندی سێکسی نێوان هەردوو ڕگەزەکە شتێکی پێویستە و بەشێوەی خۆی وەستێنەری گەشەی دانیشتوانە. بەڵام گریمانەکەی ئەمە بوو: ژمارەی دانیشتوان لەسەر شێوەی دوابەدواییەکی ئەندازەیی زیاد دەکات (٢،٤،٨،١٦،٣٢....)، بەڵام بەروبوومی خۆراکی بە شێوەی دوابەدواییەکی حیسابی زیاد دەکات (١،٢،٣،٤،٥،٦،٧......)، بە پشت بەستن بە ماڵتۆس گەشەکردنی دانیشتوان هەمیشە فشار دەخاتە سەر کۆڵەکەکانی بوونی خۆی، ئەگەر ئەو گەشەکردنە بەتوندی کۆنترۆڵ نەکرێ، ئەو کۆت و بەندانەش کە ماڵتۆس ئاماژەیان کردووە پێدەکرێ بەسەر جۆری ڕێگر و پێویست یا پۆزەتیڤ پۆلینیان بکەین، کۆت و بەندی ڕێگر کار دەکاتە سەر ڕێژەی لەدایکبوون و بەرای ئەو کۆت و بەندەی ئەخلاقی تاکە شتە کە قبووڵبکرێ، هەرچەندە ئەو دانی بەوەدا دەنا کە دەردەسەری وەك ڕێگری سکپڕی و پەیوەندی سێکسی تاکە لایەنە کاریگەریی دەبێ بەسەر لەدایکبوونەوە، بەڵام کۆت و بەندە پۆزەتیڤەکان ئەو کۆت و بەندانەن کە کار دەکەنە سەر ڕێژەی مردن وەك نەخۆشی و دەرد و پەتا، هەژار، برسیەتی و قات وقڕی، بەو شێوەیە ماڵتۆس هەستی بەوەکرد هیچ هۆکارێك نییە تا خۆمان پێی لە کۆت و بەندە پۆزەتیڤەکان لابدەین، بەڵام (گۆردیۆن)ی فەیلەسوف پێی وابوو شتەکان دەتوانن بارودۆخەکە باشتر بکەن ئەگەر لە فیوداڵی و سەرمایەداری ڕزگار بکرێن. یاسای دانیشتوان کە ماڵتۆس دایڕشتووە نەرم نییە، ناکرێ خۆت لێی لابدەی، ڕاستییەکەی هیچ هۆکارێك نییە تا کاریگەری ئەو یاسایە لابدا کە دەرئەنجامی ڕەشبینی ماڵتۆسە بۆ دوارۆژی ڕگەزی مرۆڤ. بۆیە تاهەتایە تۆمەتی ڕەشبینی دەدرێتە پاڵ ئابوریناسەکان بەو پێیەی زانستەکەیان زانستێکی ڕەشبینییە.

ئەو شتانەی ئێستا کەوا دەکەن بیروباوەڕەکانی ماڵتۆس بەتاڵبکەنەوە ئەمانەن: ماڵتۆس جەختی کردووە کە زەوی توخمێکی سەرەکی سنووردارە بۆ فراوانبوونی بەرهەمهێنانی خۆراك، هەروەك چۆن گۆڕاوە یارمەتیدەرەکانی دیکەی وەك باشترکردنی جۆرەکانی خاوی بەرهەم، بەپیتی، جۆرایەتی تۆو، گۆڕاوە سەرەکییەکانی لە بەرهەمهێنانی خۆراك بەبەرزی دەهێڵنەوە، سەرباری ئەوەش خۆراك تاکە پێویستی ئێمە نین، بەڵکو جل و بەرگ و ماڵ و کالاّنی تریش هەن، پیشەسازیش بە ئاراستەی پەرەسەندن دەڕوا و هاوکارە لە فەراهەمکردنی زۆرینەی ئەوکالا و پێداویستیانە بە خێراییەکی زیاتر لە خێرایی گەشەکردنی دانیشتوان.

ماڵتۆس شکستی خواردووە لەوەی ئەو گۆڕاوە سەرەکیانە لەبەرچاو بگرێ کە سیستەمی گواستنەوە ئەنجامیدەدات، هەروەها فراوانبوونی بازرگانی پەرەسەندنی گواستنەوە لەگەڵ خۆیدا دێنێ، هەروەها بەهۆی ئەوەی ماڵتۆس حەزی لەکاری پارێزەری بوو شکستی خوارد لە سەرپەرشتیکردنی پەیداکردنی ڕەواجێکی فراوانی ڕێگرەکانی سکپڕی، یا وای دەزانی هاوسەرەکان بڕیاری بچووککردنەوەی قەبارەی خێزان دەدەن بەهۆی گۆڕانی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوەیە.

وێڕای مشتومڕی زۆر و ئەو بەرهەڵستکارییەی کە دوای ئەوەی ماڵتۆس کتێبەکەی لە ساڵی (١٧٩٨) بڵاوکردەوە، دەرکەوت. بەڵام بەهۆی سەرکەوتنی شۆڕشی پیشەسازییەوە کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە ڕێگای گرتۆتەبەر و ڕۆڵی ئەو شۆڕشە کەمبوونەوەی فشاری دانیشتوان لەسەر دەرامەتەکان و کەمبوونەوەی کۆچ بۆ جیهانی نوێ و بەرزکردنەوەی کرێی کرێکاران تیۆرەکەی ماڵتۆس متمانەی خۆی لەدەستدا. بەڵام زیادبوونی خێرای دانیشتوان لەمیانی سەدەی بیست و هاوکات بەد خۆراکی لە زۆربەی ناوچەکان جارێکی تر بیروباوەڕەکانی ماڵتۆسی هێنایەوە بەرباس، زۆرینەی ماڵتۆسییەکان تا ئێستا پێیان وایە گەشەی دانیشتوان بەرووبوومی خۆراکی تێدەپەڕێنێ و جیهان ناتوانێ زیاتر بەرگەی دانیشتوان بگرێ.



## ماڵتۆسە نوێیەکان

ماڵتۆسە نوێیەکان بەردەوامن لە مشتومڕ لەسەر پرسی گەشەی دانیشتوان و تەنها لەو سنوورەی مشتومڕەکان نەوەستاون کە گەشەی دانیشتوان گرفتگەلی پەیوەست بە فەراهەمبوونی خۆراك دەخولقێنێ، بەڵکو گەشەی دانیشتوان و گرفتە ژینگەییەکانیشیان پێکەوە بەستۆتەوە، هەروەها پێیان وایە گەشەی خێرای دانیشتوان تەنها نابێتە هۆی هەژاری، بەڵکو شێوازی ژیان لەسەر گۆی زەوی دەڕووخێنێ. هاوکات لە کۆت و بەندە ئەخلاقییەکان واوەتر چوون کە ماڵتۆس بۆ کۆنترۆڵکردنی گەشەی دانیشتوان بانگەشەی بۆ دەکرد. ئەمان پشتگیری لە ڕێکخستنی خێزان و بەکارهێنانی ڕێگرەکانی سکپڕی بەهەموو شێوەکانیەوە دەکەن، تەنانەت پشتگیری لەبابردنیش دەکەن.

دیارترین ماڵتۆسە تازەکان (پۆڵ ئارلخ –paul ehrlich) و (گاریت هاردن – gorreet hardin) نن، ئەمان هەردووکیان لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو سەرنجی ڕای گشتیان بۆ سەر مەسەلەی دانیشتوان ڕاکێشا و لەو ئاراستەیەش بەردەوامن، لەوکاتەوە تا ئێستا ئارلخ لە کۆتایی شەستەکان کتێبێکی نووسیوە بەناوی (بۆمبی دانیشتوان) و لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو ئارلخ گەشەی دانیشتوانی بە پرسە ژینگەییەکانیش بەستەوە.

## بۆسێرپی ئابووریناس – Ester Boserup

ئابووریناسی دانیمارکی بۆسێرپ لە ساڵی (١٩٦٥) پەیوەندییەکی دیالێکتیکی لەنێوان گەشەی دانیشتوان و بەرهەمی خۆراکی داڕشت، تەواو بە پێچەوانەی ماڵتۆسەوە، لەسەرەتای لێکۆڵینەوەکەیدا دەڵێ: (گەشەی دانیشتوان بە گۆڕاوێکی سەربەخۆ دادەنرێت کە بەرۆڵی خۆی دەبێتە فاکتەرێکی سەرەکی لە کۆنترۆڵکردنی پەرەسەندنی کشتوکاڵ)، هەروەها دەڵێ: گەشەی دانیشتوان و چڕی دانیشتوانی جیهانی، دەشێ ببێتە هاندەری داهێنان و گۆڕان لە کشتوکاڵ، وەکو خاڵێکی سەرەتا

پێشنیاری کردووە  بەرزی و نزمی لە بەرهەمهێنان لەبری زەوییە کشتوکاڵییەکان و زەوییە نا کشتوکاڵییەکان بەکار بهێنرێ، ئەگەر چەمکی بەکارهێنانی زەوی و جۆرەکانی بەکارهێنانی ئامێرەکان لە کۆمەڵگا چڕەکان بە شێوازی نوێ
لەبەرچاو بگرین، پاشان ئەمە بەگۆڕانی وردە وردە بەرامبەر بە جۆرەکانی بەکارهێنانی زەوی لە قەڵەم بدەین، دەشێ رووبەرێکی دیاریکراوی زەوی زیاتر لە جارێك بەرووبومی تیا بەکاربهێنرێ.

لە حاڵەتی گەشەی دانیشتوان لە کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی دەشێ دانیشتوان ببنە هەڕەشەیەك لە رووی نزمبوونەوەی ئاستی گوزەران، لەو کاتەی کە ماڵتۆس وتی ڕێژەی مردن بەرز دەبێتەوە تا ڕێگا لە گەشەی دانیشتوان بگرێ و پاشان ببێتە هۆی هاوسەنگی لە گەشەکردن، ئەو کات (بۆسێرپ) روونیکردەوە ئیمکانیەتییەکی تر هەیە پێی دەوترێ چڕکردنی سیستەمی کشتوکاڵی، هەروەها (بۆسێرپ) وتی: ئەگەر دانیشتوان چەند کاتژمێرێك زیاتر کار بکەن و ڕێگاکانی بەرهەمهێانی بەروبووم بەشێوەیەکی چڕ بگرنە بەر، ئەوە دەتوانن بەسەر گرفتی گەشەی دانیشتواندا زاڵبن.

(بۆسێرپ) وای دەبینی لەگەڵ بەردەوامبوونی گەشەی دانیشتوان پراکتیزەکردنێکی چڕتری کشتوکاڵ دێتە ئاراوە، ئەو پراکتیزەکردنە چڕەی کشتوکاڵیش بڕینەوەی دارستانەکان و چاندنەوەی درەختەکان سەر لەنوێ بە شێوەی مەودا کورت یا ساڵانە و بەرهەمی فرە بەروبووم دەگرێتەوە.

هەروەها خانمە توێژەری دانیمارکی دەڵێ: لە ژێر کاریگەری زۆربوونی دانیشتوان لەم دەیانەی دواییدا گواستنەوەیەك لە سیستەمێکی بەکارهێنانی فراوانەکانەوە بۆ بەکارهێنانێکی چڕی زەوی لە زۆربەی وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان هاتۆتە ئاراوە.

لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا دەڵێ: گەشەی دانیشتوان پاڵنەرێکی بزوێنەرە بۆ گۆڕانی تەکنەلۆژی بەتایبەت لە ژێر سایەی هەندێ هەلومەرجدا لەگەڵ ئەوەشدا دان بەوەدا دەنێ ڕێژەی گەشەی بەرزی دانیشتوان دەشێ ببێتە بارگارنییەك بەسەر ئەو سیستەمانەوە، لە وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان کشتوکاڵی چڕوپڕ بەردەوامە لە



پێشکەوتن، بەلاّم لەهەندێ کاتدا وێرای گەشەی گشتی لەبەرهەمی کشتوکاڵی، ڕێژەی گەشە لە داهاتی تاك هەروەك خۆی ماوەتەوە یا تارادەیەکیش کەمی کردووە، لەم بارەشەوە لەهەندێ ناوچەی ئەفریقیا نموونەی جوان بەرچاو دەکەون.

لەگەڵ ئەوەی بۆسێرپ هەندێ تێبینی روونمان لەبارەی چارەسەرکردنی گەشەی دانیشتوانەوە پێدەدات، وەکو ئەوەی گەشەی دانیشتوان گۆڕاوێکی سەربەخۆیە و بەرۆڵی خۆی دەبێتە هۆی بەکارهێنانی چڕوپڕی کشتوکاڵ و داهێنراوە تەکنەلۆژییەکان، بەلاّم تێبینییەکانی لە رەخنە بەدوور نین، ئەو پرسیارەی کە لێرە هۆی قوت دەکاتەوە ئەوەیە: ئەگەر خۆراك کەمە بۆچی دانیشتوان دەستی بە گەشەکردن کردووە، بەتایبەت کە گەشەی دانیشتوان هێواشە و لەزۆربەی سەردەمەکانی مێژوویی مرۆڤایەتی هەروا  بووە؟ رەخنەیەکی تر کە جێگەی ئاماژەپێکردنە ئەوەیە، بۆسێرپ لەگەڵ  کۆمەڵگا کشتوکاڵییە داخراوەکان مامەڵەی کردووە، واتە ئەو کۆمەڵگایانەی کۆچ تیایاند رووناداتت، لە راستیدا کۆچ رۆڵی دەمەوانەی دڵنیا (صمام الامان) لە گەشەکردنی دانیشتوان دەبینێ و لەزۆربەی حاڵەتەکاندا، هەرچەندە ئەو رۆڵە لەگەڵ گەشەی خێرایی دانیشتوان لە سەدەی بیست سنووردار بووە.

## **کارڵ مارکس:** Karl Marx

زۆربەی توێژەران لەگەڵ بیروباوەرەکانی ماڵتۆس هاورا نین، دیارترین رەخنەگری بیروباوەرەکانی ماڵتۆس (کارڵ مارکس)ە، کە دەڵێ: ئەو جۆرە لەرادەبەدەرییەی ژمارەی دانیشتوان بوونی نییە، مارکس پێی وایە ماڵتۆس لایەنگرێکی بورژوای شۆڤینییە و پشتگیری سیستەمی دەوڵەتێك دەکات کەلەسەر نایەکسانی و نادادپەروەری کۆمەڵایەتی بونیادنراوە، هەروەها ماڵتۆس بەوە تۆمەتبار دەکا کە نوسین و بیروباوەڕی تیۆریستە ئابورییە تەقلیدییەکانی دووبارە کردۆتەوە، ئەوانەی کە رکابەریەکی بێ سنووریان ڕێکخستبوو و پەرەیان بە کەرتی تایبەت و سەرمایەی تاکەکەسی دەدا، وەك چارەسەرێك بۆ زۆربوونی دانیشتوانی زەبەلاحی ئەوروپا،

بەمەش مالتۆس بووە ئامانجێکی ئاسانی رەخنەی شۆڕش و دوژمنی بزووتنەوەی سۆسیالیزمی جیهانی، دواجار وەکو نووسەرێکی چەوسێنەری چینی هەژار و برەوپێدەری چینی چەوسێنەر لەقەڵەمدرا.

مارکس لە کتێبەکانی خۆ و لەو سیستەمە شیوعییەی کە دایڕشت باسی ئەوە دەکا کە بە گەیشتنی کرێکاران بە دەسەڵات دەبێتە هۆی هاتنی کایەی کۆمەڵگایەکی بێ چین، بەبێ موڵکایەتی تایبەت. هەروەها مارکس پێی وایە گەشەی دانیشتوان بەرهەمی خۆراکی و دەرامەتەکان تێدەپەڕێنێ، نەك لەبەر ئەوەی یاسایەکی سروشتی هەیە دەڵێ توانای زەوی ناتوانێ یەکسان بێ لەگەڵ گەشەی دانیشتوان، بەڵکو لەبەر ئەوەی هەژاران لە ژێر سایەی سەرمایەداری ناتوانن فەرمانرەوایەتی بەسەر خۆراك و دەرامەتەکانی ترەوە بکەن، وێرای ئەوەش مارکس دەڵێ: ئەگەر هەژاران جڵەوی بەڕێوەبردنی ئامرازەکانی ژیان و مەعریفە و زەوی رێژەیەکی باشی سەروەت و سامانیان لەدەستدا بێت، ئەوە بەرهەمهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکانیان دەکەوێتە سەرووی گەشەی دانیشتوان.

مارکس وای دەبینێ هیچ گرفتێکی دانیشتوانی لە ئارادا نییە بەڵکو گرفتەکە خراپ دابەشکردنی دەرامەتەکانە.

شیوعییەکان و سۆسیالیزمەکان هاوڕابوون لەسەر ئەوەی بنچینەی گرفتی دانیشتوان گرفتی خراپ دابەشکردنی دەرامەتەکانە، لەگەڵ ئەوەی جیاوازییەکی بنچینەیی لەنێوان سۆسالیستەکان و شیوعییەکان هەیە لەرووی پرۆسەی جێ بەجێکردنی ئەو چارەسەرەوە.

سەرباری ئەوەی تاکو ئێستا هەندێ وڵاتی شیوعی بوونیان هەیە، کەچی سیستەمی رێکخستنی خێزانیان بە شێوەیەکی فراوان پراکتیزە کردووە، باشترین نموونەش کۆماری چینی میللییە، هۆکاری پشت ئەمەش: باشترکردنی رەوشی تەندروستی و فێرکاری و رەوشی ژنان و نەوەکانی داهاتووە.



## ئاڵوگۆڕی دیموگرافی: سەرنجێکی خێرا

بونیادنانی تیۆری ئاڵوگۆڕی دیموگرافی پشت بە خوێندنەوەیەکی مێژووی ئەو گۆڕانە دیموگرافییانە بەستووە لە وڵاتانی ئەوروپای رۆژئاوا روویانداوە، جیاوازی نێوان رێژەی لەدایکبوون و رێژەی مردن تەنکبۆتەوە، ئەوەش بەهۆی نزمبوونەوەی رێژەی لە دایکبوون، نەك بەهۆی بەرزبوونەوەی رێژەی مردن وەکو مالتۆس پێشبینی کردووە، ئەوروپا گەیشتۆتە جۆرێکی نوێی سەقامگیری دیموگرافی، ئەم سەقامیگیرییەش سەرەتا لە باکووری رۆژئاوای ئەوروپا دەستیپێکرد پاشان درێژبۆوە بۆ بەشەکانی تری ئەو کیشوەرە، ئەو ئاڵوگۆڕە لە سیستەمی دیموگرافی تارادەیەك جێگیرە و بەرێژەی لەدایکبوون و مردنی بەرز بۆتە سیستەمێکی نموونەیی، بەڵام بەرێژەی لە دایکبوون و مردنی نزم، ئەوەیە پێی دەوترێ ئاڵوگۆڕی دیموگرافی.

نموونەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی بنچینەی بوونی پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان شارنشینی لەلایەك و نێوان نزمبوونەوەی مردن و بەپیتی لەلایەکی تر دێنێتە ئاراوە. لەرووی تیۆرییەوە دەکرێ بەشێوەیەك تەماشای ئەو رەوشە بکرێ کە زنجیرەیەکی نموونەیی ئەو قۆناغانەیە کە لەمیانیەوە کۆمەڵێکی دیاریکراوی دانیشتوان تێدەپەرێ و هەمیشە بە قۆناغی جۆرێکی دیموگرافی سەقامگیر کۆتایی دێ کە رێژەیەکی لە دایکبوون ومردنی نزم لەخۆ دەگرێ، نموونەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی پشت بەو زانیاری و ئەزموونە دیموگرافیانە دەبەست کە لە رۆژئاوایی ئەوروپا بەتایبەت ئینگلتەرا و وێڵز پێیدا تێپەرین. شێوەی (١-٤) ئەو گۆڕانە رودەکاتەوە کە بەسەر رێژەی ژیاری لە ئینگلتەرا لە سەدەی حەڤدە و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەدەی نۆزدەدا هاتووە، ئەو وێنەیە لایەنی تیۆری ئەو نموونەیە روونەکاتەوە.

ئینگلتەرا بە شێوەیەکی گشتی (پێش شۆڕشی پیشەسازی لەسەدەی نۆزدە) رێژەیەکی بەرزی لەدایکبوون و مردنی بەخۆوە بینی، بەڵام نەك بەو ئاستە بەرزەی رێژەی مردن و لەدایکبوون کە ئێستا لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان هەیە. دەرئەنجامی بەرزبوونەوەی لەدایکبوون و مردن لە ئینگلتەرا کۆمەڵگایەکی دانیشتوان

تارادەیەك جێگیر هاتە ئارا کە تیایدا لە دایکبوون و مردن هاوسەنگ بوون: لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدە کاتێك ڕێژەی مردن دەستی بە نزمبوونەوە کرد گۆڕانێکی کتوپڕ ڕوویدا، تاکو ئێستاش هۆکاری سەرەکی ئەو گۆڕانە کتوپڕە بەتەواوی نەزانراوە، هەرچەندە زۆرینەی پسپۆڕان کۆکن لەسەر ئەوەی کە هۆکارەکە دەشێ وەرزانەی باشی کشتوکاڵی بووبێ لەو سەردەمەدا. ئەو وەزرە باشانەی کشتوکاڵ دەرئەنجامی ئەو پەرەسەندنە دەرکەوت کە (بەهۆی پەیرەوکردنی سیستەمی بازنەیی کشتوکاڵی و بایەخدان بە سەروەتی ئاژەڵ لە کێڵگەکان) بەسەر کشتوکاڵدا هات. لەسەرەتای سەدەی نۆزدە بەرزبوونەوەیەکی کەم لە ڕێژەی مردن ڕوویدا. ڕەنگە هۆکاری ئەوەش پەرەسەندنی شارە پیشەسازییەکان و هەلومەرجی نا تەندروستی و ژینگەی پیس بووبێ.

لەگەڵ ئەوەشدا دوای چەند دەیەیەك ڕێژەی مردن دەستی بەنزمبوونەوە کرد و بەردەوام بوو تاکو ئێستا.

لە ئینگلتەرا بەرزبوونەوەی ڕێژەی لە دایکبوون سەرەتا بە شێوەیەکی کەم دەستی بەبەرزبوونەوە کرد، ئەوەش دەرئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی لە ژێر سێبەری بە پیشەسازبوون و نەبوونی سیستەمی ڕاهێنانی پیشەیی، کرێکارە ناکارامەکان لە کارگەکان کاریان دەستکەوت و چیتر ناچار نەبوون ماوەیەکی درێژ خەریکی خۆ ڕاهێنان بن لەسەر پیشەیەك بەر لەوەی قەرەبووی تەواویان پێ بدرێ.. ئیدی لەوە بەدواوە دەیانتوانی زوو هاوسەرگیری ئەنجامبدەن و لە تەمەنێکی منداڵدا خێزان پێکەوە بنێن، ئەو گۆڕانەی کە بەسەر ئاستی گوزەراندا هات بووە یارمەتیدەرێك لەبەرزبوونەوەیەکی نزمی لە دایکبوون، ئەو دایکانەی کە لەکاتی دووگیانیدا تەندروستییەکی باشیان هەبوو دەیانتوانی بە شێوەیەکی زیاتر منداڵی تەندروست و ساغ و سەلامەت بخەنەوە.

تاکو ساڵی (١٨٧٠) پیتداری لە ئینگلتەرا وەکو خۆی مایەوە، دوای ئەوە بە شێوەیەکی بەرچاو دەستی بە نزمبوونەوە کرد، هۆکاری سەرەکی ئەو نزمبوونەوەیە



گۆڕان لە شێوازی هاوسەرگیری نەبوو، بەڵکو هۆکاری سەرەکی ئەو گۆڕانە، گۆڕانی چەمکی قەبارەی خێزانی نموونەیی بوو، بچوکبوونەوەی قەبارەی خێزانی نموونەیی چەند هۆکارێکی لە پشتەوەیە، گرنگترینیان:

**یەکەم:** نەمانی ڕۆڵی داهاتی خێزان، لە ماوەی بەر لە شۆڕشی پیشەسازی منالان بە ڕێژەیەکی زۆر بەشداربوون لە داهاتی خێزان، چونکە ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوان لە کشتوکاڵدا کاریان دەکرد، بۆیە پیویستیان بە ژمارەیەکی زۆری منداڵ بوو تا داهاتی خێزان زیاد بکات، لەماوەی سەرەتاکانی پیشەسازی ڕستن و چنین و کارکردن لە کانەکان منالان توخمێکی ئابووری گرنگ بووە، چونکە بە کرێیەکی کەمتر لە گەورەکان کاریان دەکرد. هەروەها منالان سەرچاوەیەك بوون بۆ دەستەبەری کۆمەلایەتی، چونکە کاتێك باوکان نەیاندەتوانی کار بکەن ئەوان تاکە سەرچاوەی یارمەتییەکانی خەڵك بوون، لەگەڵ داڕشتنی مەرج و بەند لە سەرکارکردنی منداڵ لە ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەقامگیربوونی دانیشتوان لە شارەکان، منالان بوونە بارگرانییەك بەسەر دایك و باوکیانەوە، هەروەها دەوڵەت سیستەمی دەستەبەری کۆمەلایەتی بۆ پیرەکان دانا، لەگەڵ گەشەکردنی پرۆسەی بە پیشەسازبوون ژمارەی ئەو دانیشتوانانەی لە کشتوکاڵدا کاریاندەکرد، بە شێوەیەکی بەرچاو کەمبووە و ڕۆڵی منالانیش وەکو بەرهەمهێن باوی نەما.

**دووەم:** هۆکاری دووەم لە پشت بچووکبوونەوەی قەبارەی خێزان ڕۆشنبیری تاکەکان بوو، شۆڕشی پیشەسازی بڕێکی گەورەی کالا و خزمەتگوزاری بەرهەمهێنا، بۆیە خەڵکی گۆڕان بەسەر گرنگیدانیاندا هات لە کالا و خزمەتگوزارییەوە بۆ بە کەمالیاتەکان و شتە ناسەرەکییەکان. وەکو پێداویستییەکی سەرەکی تەماشای خۆشگوزەرانی دەکرا. بزاوتی کۆمەلایەتی و دەوڵەمەندبوون بۆ تاکەکان ئاسانتر بووەوە، ئەگەر ژمارەیەکی کەمی منالان هەبوایە، هەروەها لەگەڵ پەرەسەندنی مەعریفە خەڵکی مەیلیان بەلای ڕێکخستنی خێزانەوە چوو، کە بەم هۆیەوە نزمبوونەوەیەکی گرنگ و بەردەوام لە ڕێژەی لەدایکبوون هاتە ئارا.

زۆربەی وڵاتانی رۆژئاوا ئاڵوگۆڕێکی دیموگرافی هاوشێوەی ئینگلتەرایان بەخۆوە بینی، جگە لە فەرەنسا نەبێ کە پێش ئینگلتەرا رێژەی پیتداری تیایدا کەمبۆوە. هەرچەندە کاتی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێ، بەڵام دەرئەنجامەکان تارادەیەك هەر یەك شتن، هاوسەنگییەکی نوێی رێژەی ژیاری (الحیوی) لە هەلومەرجی گوزەرانی تەندروستی و ماددی باشتری دانیشتوانی هێنایە ئارا، کە پێشتر رووی نەدابوو.

ئەگەر ئەزموونی تەقلیدی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی بپشکنین دەبینین نزمبوونەوە لە رێژەی لەدایکبوون درەنگتر بووە لە رێژەی مردن، کاتێکیش دەرکەوت کە پیشەسازی رێگایەکی درێژی بڕییەوە. شایانی باسە مالتۆس ئاگاداری ئەو ئاڵوگۆڕە دیموگرافییە نەبووە، بەڵکو پێی وابووە هاوسەنگی دانیشتوان دەشێ بەبەرزبوونەوەی رێژەی مردن زیاتر لە نزمبوونەوەی رێژەی لەدایکبوون بێتە دی.

دەکرێ جۆری گشتی قۆناغەکانی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی بەچەندین ناوچەی جیهانی ببەستینەوە لەکاتی ئێستادا. شێوەی ژمارە (٢-٤) نموونەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی، چەندین قۆناغی جیاواز دەخاتە روو:

**قۆناغی یەکەم:** ئاماژەیە بەو ناوچانەی کە رێژەیەکی بەرزی مردن و رێژەیەکی بەرزی لەدایکبوون بەخۆوە دەبینن، ئەوەش چەرخی بەر لە شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپا دەردەخات، تا ئێستا هیچ هەرێمێك نییە لە جیهان بەو قۆناغەدا تێپەری بێ، وێڕای بوونی چەند دەوڵەتێکی ئەفریقی کەم نەبێ بەو قۆناغەدا تێپەربوون.

**قۆناغی دووەم:** کۆمەڵێکی دانیشتوانی خاوەن رێژەیەکی لە دایکبوونی بەرز و رێژەیەکی مردنی نزم زۆرینەی وڵاتانی ئەفریقیا تا ئێستا بەو قۆناغەدا تێدەپەڕن، زۆرێك لە وڵاتانی ئاسیاش هەر بەو قۆناغەدا تێدەپەڕن، جگە لە ژاپۆن و چین و هۆنگ کۆنگ و تایوان نەبێ.



**قۆناغی سێیەم:** ئەو کۆمەڵگایانە دەگرێتەوە کە رێژەیەکی بەرزی لە دایکبوون و رێژەیەکی نزمی مردن بەخۆوە دەبینن وەکو زۆربەی وڵاتانی ئەمریکای لاتین و ناوەڕاست و هەندێ وڵاتی ئەفریقی، رێژەی گەشەی دانیشتوان لەو وڵاتانە لە جیهان خێراترن. بۆ وێنە لە ساڵی (١٩٩٥) لە کینیا رێژەی لەدایکبوون (٤٥) لە هەزارە و رێژەی مردن (١٢) لە هەزاردایە. بەمەش رێژەی زیادبوونی سروشتی دەگاتە (٣٣) لە هەزاردا. یا (٣,٣٪) ساڵانە.

**قۆناغی چوارەم:** وڵات هەیە رێژەی لەدایکبوون و رێژەی مردن تیایدا نزمە، وەك ئەرجەنتین و ئۆرەگوای، هەروەها کۆماری چینی میللی و تایوان و کۆریای باشوور.

نزمبوونەوەی رێژەی لەدایکبوون لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان دوای (١٩٧٠) شتێکی ئاسایی و سروشتی بوو، پاشان یارمەتیدەرێك بوو لەنزمبوونەوەی رێژەی گەشەی دانیشتوانی جیهان.

**بەڵام قۆناغی پێنجەم و کۆتایی:** ئەو کۆمەڵگایانە دەگرێتەوە کە رێژەیەکی نزمی لە دایکبوون و مردن بەخۆوە دەبینن، وەك وڵاتە رۆژئاواییەکان و ژاپۆن.

ئەگەر نموونەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافیان قبووڵکرد و پێمان وابوو پەیوەندییەکی هۆکارەکی لە نێوان شارنشینی و پاشەکشە لە رێژەی پیتداری، مردن هەیە، چارەسەری گەشەی خێرایی دانیشتوان بە زووترین کات لە شارنشینی بوونی جیهان دەردەکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر پێشکەوتنێکی بەرچاو لە قۆناغی یەکەمەوە بۆ قۆناغی کۆتایی روویدا، ئەوە خێرایی بزاوتی وڵاتان بەو قۆناغەدا بە بزاوتێکی بنچینەیی دادەنرێ. ئەو وڵاتانەی کەبە قۆناغی چوارەمدا تێدەپەڕن بە ئاراستەیەکی دروستدا تێدەپەڕن، و لە ماوەیەکی کورتدا دەگەنە پرۆسەی هاوسەنگی نێوان لەدایکبوون و مردن، بەڵام ئەو وڵاتانەی لە قۆناغی سێیەمدان ئەو زۆربوونێکی خێرایی دانیشتوان بەخۆوە دەبینن، ئەو وڵاتانەش هەر بە ئاراستەیەکی دروستدا دەڕۆن، و پێویستە ئەزموونی نزمبوونەوەی رێژەی لەدایکبوون کە هاوشانی

نزمبوونەوەی ڕێژەی دانیشتوان دەستپێدەکەن. بەڵام ئەو وڵاتانەی لە ڕەوشێکی لاپەرەسەنگدان ئەو وڵاتانەن کە بەهەردوو قۆناغی یەکەم و دووەمدا تێپەڕیوون و تاکو ئێستاش کاتێکی زۆریان ماوە تاکو بگەن بە قۆناغی سێیەم، قۆناغی سێیەم ئەو قۆناغەیە کە گەشەکردنێکی خێرایی دانیشتوان بە خۆوە دەبینن، ئاسیا و ئەفریقیا زۆرترین ژمارەی دانیشتوانی جیهان لە خۆ دەگرن، ئەگەر ئەزموونی ئەوروپی جێ بەجێ بکەن، ئەوکات دەشێ وڵاتانی ئەو دوو کیشوەرە زیادبوونێکی زەبەلاحی ژمارەی دانیشتوان بەخۆوە ببینن.

ویڕای ئەوەش کۆماری چینی میللی نزمبوونەوەیەکی خێرایی پێتداری بەخۆوە بینی، چونکە چین بەرەسمی هانی سیاسەتی یەك مناڵی دەدا لەخێزاندا، پێشتر بۆمان دەرکەوت نموونەیی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی ئاسان نییە لە هەموو شوێنێك و لەهەموو کاتێك جێ بەجێ بکرێ.

## هێنانەدی یا جێ بەجێکردنی نموونەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی

ویڕای ئەو گرنگییەی بەنموونەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی دراوە، کەچی مەودای هێنانەدی یاخود هاوتابوونی لەگەڵ واقیع تاکو ئێستاش جێی گومان و گفتوگۆیە، ئایا ئەم نموونەیە بۆ تەفسیرکردنی ئەو گۆڕاوە دانیشتوانیانە بەکەڵك دێ کە لە وڵاتە دواکەوتووەکان دەردەکەوێت؟ ئایا بەسەر ئەو گۆڕاوانەدا دەسەپێ؟ هەلومەرجی ئێستای وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان زۆر جیاوازە لەو هەلومەرجەی کە لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لە ئارادایە، چونکە ئەوان بە پرۆسەی گواستنەوەی دیموگرافیدا تێپەڕیوون، پێکهاتنی بنچینەکانی دانیشتوان لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان پشت بە چەمکەکانی نموونەیی ئاڵوگۆڕ مەودای جێ بەجێکردنی ئەو چەمکانە و مەودای سوود لێوەرگرتنی لە ئاراستەکردنی سیاسەتە گەشەپێدەرەکان، دەبەستێ.



گرنگترین پرسیار کە لێرەدا دێتە پێش ئەمەیە: تا چ ڕادەیەك وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان دەتوانن ئەزموونی وڵاتە پێشکەوتووەکان کە پشتیان بە نموونەیی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی بەستووە، جێ بەجێ بکەن؟

جێی خۆیەتی جیاوازی نێوان ئەزموونی ئەوروپی و ئەو ئەزموونەی کە ئێستا لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان هەیە، لەبەر چاو بگرین، پرۆسەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی چ ئەزموونی ڕۆژئاوایی بێ یا ئەزموونی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان زۆر بەهێواشی دەجووڵێتەوە نەك بە خێرایی، لە لاپەڕەکانی تردا هەندێ جیاوازی و کاریگەری چاوەڕوانکراوی گۆڕانی دیموگرافی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان دەخەینەڕوو.

## جیاوازی نێوان ئەزموونی ڕۆژئاوایی و ئەزموونی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان لە ئاڵوگۆڕی دیموگرافیدا

### یەکەم: لە بواری گەشەی دانیشتوان

وەکو پێشتر سەرنجمان دا گەشەی دانیشتوان لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان بە ڕێژەی زۆر بەرز دەرکەوت، کە پێشتر وێنەی نەبووە. کیشوەری ئەفریقیا خێراترین هەرێمە لە جیهان لەرووی گەشەی دانیشتوان، ڕێژەی زیادبوونی سروشتی لە ساڵی (١٩٩٥) گەیشتە (٢,٨٪)، نایجیریا، نیجیر، زامبیا، کینیا، ئۆگەندا، تۆگۆ و زائیر لەو وڵاتە ئەفریقیانەن کە تا ئێستا ڕێژەی گەشەی ساڵانەیان لە (٣٪) زیاترە. شوێنەوارە کەڵەکەبووەکانی سەر ئەمەش بەروونی دەردەکەوێ ئەگەر ئەوە لەبەرچاو نەگرین کە دانیشتوان بە ڕێژەی (٣,٥٪)، تەنها لەماوەی (٢٠) ساڵدا دووجا دەبنەوە، ڕەنگە بەرادەی (٣٢) لە ماوەی سەد ساڵ دووجا بێتەوە. بەبەراورد لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپا، کاتی پێویست بۆ دووجابوونەوەی دانیشتوان لەنێوان (٨٥-٩٥) ساڵە، ئەمە لەکاتێکدا وڵاتانێکی زۆرکەم ڕێژەی گەشەی ساڵانەیان زیاتر لە (١,٥٪) بووە.

گرنگترین ئەو گرفتانەی کە پەیوەستە بە گەشەی خێرای دانیشتوان گەشەی خێرای پێداویستییەکانی دانیشتوان لەرووی کالاّ و خزمەتگوزاری و گەشەی داخوازی لەسەر خزمەتگوزارییە کۆمەلاّیەتییەکان و وەبەرهێنان وەك خوێندن، لەبەرامبەردا ئێستا ولاّتە ئەوروپییەکان رووبەرووی گرفتی ترسناك بوونەتەوە، هەروەها گەشەی دانیشتوان گەشەی ئاستی گوزەرانی دانیشتوانی کۆت و بەند کردووە.

مەسەلەکە لە ولاّتە تازە گەشەسەندووەکان دژوارترە، چاوەروان دەکرێ کۆنترۆڵکردنی (یا وەستانی) گەشەی دانیشتوان لەو ولاّتانە ئەستەم بێ، وەکو ولاّتە ئەوروپییەکان لە میانەی پرۆسەی ئالۆگۆڕی دیموگرافی خویاندا گەشەکردنیان دابەزاند. پێکهاتەی تەمەنی گەنج (بچووك) لە ولاّتە تازە گەشەسەندووەکان دەرئەنجامی پیتداری بەرزە و بەوەش دوارۆژی گەشەی دانیشتوان زۆر بەرز دەبێ، هەروەکو ئەمەش بە: کەموکورییەکی خۆوەکی دیموگرافی ناودەبرێت کە ناتواندرێ لە دەستی رزگار ببین، تەنانەت ئەگەر رێژەی پیتاندن لە ولاّتە تازە گەشەسەندووەکان بۆ ئاستی جێگرتنەوە دابەزێ، لەماوەی ئەم دەیەی ئێستا (هەڵبەت روونادا)، ئەوە ئەو ولاّتانە لە ماوەی (٦٠) ساڵی داهاتوودا یا زیاتر لە گەشەکردن بەردەوام دەبن و قەبارەی دانیشتوانیان دووجا دەبێتەوە، لە ولاّتانی وەکو هیند دووجابوونەوەی ژمارەی ئێستای دانیشتوان (دەگاتە یەك ملیار خەڵك) ئەمەش گرفتی گەورە لەگەڵ خۆی دێنێ.

### دووەم: لە بواری نزمبوونەوەی مردن:

یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی گەشەی خێرایی دانیشتوان لە ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان بریتییە لە نزمبوونەوەیەکی خێرای مردن، کە لەگەڵ دەرکردنی بەرنامەی پزیشکی و پرۆگرامی تەندروستی گشتی لەلایەن ولاّتە پێگەیشتووەکان دەرکەوت، کە دواجار بووە هۆی باشتربوونی ئاستی تەندروستی دانیشتوان لە ماوەیەکی کورتدا، ولاّتە ئەوروپییەکان نزمبوونەوەیەکی وردە وردەی مردنیان بەخۆوەبینی کە پەیوەست بوو بەو گۆڕانە کۆمەلاّیەتی و ئابوورییانەی کە هاوشانبوون



لەگەڵ پرۆسەی بە پیشەسازبوون و پەرەسەندنی ئابووری، لەزۆربەی ولاّتە دواکەوتووەکانی ئێستا نزمبوونەوەی مردن زۆر خێراترە لە ولاّتە ئەوروپییەکان، دەرئەنجامی ئەمەش ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان ئاستێکی کەمتری مردن بەخۆوە دەبینن بەبەراورد لەگەڵ ئەوروپا لە میانی قۆناغی یەکەمی پرۆسەی بە پیشەسازبوون.

نزمبوونەوەکانی دیکەی مردن لە ئەفریقیا دەردەکەوێ، بەلاّم دەشێ بەهۆی بلاّوبوونەوەی نەخۆشی ئایدز لەو کیشوەرە و ناسەقامگیری کۆمەلاّیەتی هێواش بێ.

### سێیەم: لەبواری پیتاندن

ئاستەکانی پیتاندن لە زۆربەی ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان لەکاتی ئێستا زۆر بەرزترە لە ولاّتە ئەوروپییەکان، هەڵبەت بەر لەوەی ولاّتە ئەوروپییەکان بەپرۆسەی ئالۆگۆڕی دیموگرافیدا تێپەڕن. زۆرێك لە ولاّتە ئەفریقییەکان بۆ وێنە رێژەی لەدایکبوون تیایاندا لە (٤٥) بۆ هەر هەزار کەسێك زیاتربووە لە ساڵی (١٩٩٨)، لەبەرامبەردا رێژەی لەدایکبوونی گشتی لە سەرەتای سەدەی نۆزدە لە بەریتانیا گەیشتە (٣٥) لە هەزاردا. هۆکاری سەرەکی جیاوازییەکان لە شێوازی هاوسەرگیری دەردەکەوێ، لەسەدەی نۆزدە لە ئەوروپا دواخستنی هاوسەرگیری یا ئەنجامنەدانی هاوسەرگیری شتێکی ئاسایی بوو، بەلاّم لە زۆربەی ولاّتە تازە پێگەیشتووەکانی ئێستا ئەزموونەکان ئاماژە بە هاوسەرگیری زوو و گشتاندنی هاوسەرگیری دەدەن.

وێڕای ئەوەی رێژەی بەرزی لە دایکبوون لە ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان بلاّوبوەوە، ئەوەش وەکو دەرئەنجامێکی شێوازی هاوسەرگیری و لەگەڵێشیدا بەکارهێنانێکی کەمی رێگری سکپڕی، بەلاّم ئاماژە هاندەرەکانی نزمبوونەوەی رێژەی لەدایکبوون لە ئاسۆدایە، بەهۆی هەر هۆکارێکەوە ناکرێ پیتاندن لە ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان دابمەزرێنرێ، بۆیە گۆڕینی شێوازی هاوسەرگیری لە برەودان بە گۆڕینی ئەو شێوازە کاریگەرترین میکانیزمەکانی رێگری سکپڕییە.

بەشێك لەو نزمبوونەوەیەی ئێستای پیتاندن لە چین زادەی ئەوجۆرە هەوڵ و تەقەلڵایەیە. ئەگەر تەمەنی هاوسەرگیریمان بەرزکردەوە ئەوە ئەو ساڵانەی کە ئافرەتان تیایدا سکپڕ دەبن کەم دەبێتەوە. (واتە ئەگەر مرۆڤ چەندی درەنگتر هاوسەرگیری ئەنجامبدەن ئەوەندە بواری منالبونیان کەمتر دەبێتەوە — و.ك).

ئەو پاڵنەرانەی هانی پێکهێنانی خێزانی قەبارە بچووك دەدەن بوونەتە شتێکی پێویست بەر لەوەی نزمبوونەوەیەکی بەرچاو لە پیتداری لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان ببینین. بڵاوبوونەوە و مۆدێلی شێوازی خێزانی بچووك لە ئەوروپا بووە هۆی ئەوەی لە زۆربەی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانیش کاریگەری ئەو شێوازە بڵاوبێتەوە، ئەوەش دەرئەنجامی فراوانبوونی بازرگانی جیهانی و سیستەمی پەیوەندییەکانە، دەشێ ڕۆڵی حکوومەت و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان هاوکار بێ لە نزمبوونەوەی ڕێژەی پیتداری بە شێوەی خێراتر. پەیرەوکردنی بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان کاریگەرییەکی کارای دەبێ ئەگەر لە لایەن حکوومەتەوە برەوی پێبدرێ. حکوومەتەکان زیاتر لە جاران گرنگیپێدەری شێوازە جیاوازەکانی پلانن، هەروەها وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان زانای زانستە کۆمەڵایەتییەکان و پلانڕێژی زۆریان هەیە بە شێوەیەکی کارا بەشدارن لە پێکهێنان و جێ بەجێکردنی سیاسەتەکانی پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە وڵاتانی خۆیان.

ئەو جۆرە پلانڕێژیانە لە سەردەمی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی و قۆناغی بەپیشەسازی بووندا لە وڵاتە ئەوروپییەکان بوونیان نەبوو، هەروەها هاوکاری مەعنەوی و ماددی بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەرنامە و ڕێکخستنی خێزان و ئەو ئامرازە پەیوەندییانەی کە بۆ ئەو بەرنامە و بۆ بڵاوبوونەوەی ئامرازەکانی ڕێکخستنی خێزانی هاوچەرخ بەکار دەهێنرێ، سەرجەمیان کاریگەری خۆیان هەیە لە وڵاتانی جیهانی سێیەم.



**چوارەم: لە بواری کۆچدا:**

بێگومان کۆچ ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە سەقامگیربوونی دانیشتوان لە پارچەکانی کیشوەری ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەدا. هەروەها ڕۆڵی دەمانەوانەی دڵنیایی (صمام الامان) گێڕا و شوێنەوارەکانی گەشەی خێرای دانیشتوانی نزمکردەوە. ملیۆنان هاوڵاتی ئەوروپی لەسەدەی نۆزدە بەرەو ئۆقیانوسیا و هەردوو ئەمریکا کۆچیان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی واقیعی ئابووری و سیاسی ئێستا چیتر کۆچ وەکو دەمانەوەی دڵنیا بۆ سووککردنی فشاری دانیشتوان بۆ ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان کەڵکی نەماوە.

لەمیانی پڕۆسەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی ئەوروپیدا گەشەی دانیشتوان لە ناوچە دێهاتەکان دەیانتوانی لە ڕێگای ناردنی دانیشتوان بەرەو ناوچە شارنشینییەکان بۆ دۆزینەوەی کاری ڕەخساو، چارەسەرێك بدۆزنەوە. پیشەسازی بەخێرایی لە شارەکان بڵاوبووبۆوە، کاتێك دانیشتوان لە گوندەکانەوە دەچوون بۆ شار فێری پیشەی تازە دەبوون. ئێستا لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان پیشەسازی ناتوانێ هەلی کار بە خێرایی لە شارەکان برەخسێنێ، تا گەشەی خێرا لەهێزی دەستی کار وەربگرێ و پاشان هانی مانەوەی پیتاندنی بەرز بدات، هەندێ لە وڵاتان لەهەوڵی نزمکردنەوەی ڕێژەی کۆچن لە لادێکانەوە بۆ شار.

**پێنجەم: لە بواری فێرکاری و گەشەی ئابووری:**

گەشەی ئابووری و شارنشینی لە زۆربەی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان زۆر خێراترە لە وڵاتانی ئەوروپای سەدەی نۆزدە. ڕەنگە ئەمەش وامان لێبکا بڵێین پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان شارنشینی و نزمبوونەوەی پیتداری هەیە، ئەو پەیوەندیەش نزمبوونەوەیەکی زیاتر لە پیتداری دێنێتە ئارا و بە شێوەیەکی گورجوگۆڵ کۆتایی بە پرۆسەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی دێنێت.

لەلایەکی ترەوە فێرکاری ڕۆڵێکی کارا هەیە بەسەر پیتاندنەوە، بە شێوەیەکی گشتی هەرچەند ئاستی ڕۆشنبیری بەرز بێتەوە پیتداری نزم دەبێتەوە.

ئەمەش بە شێوەیەکی روون لەلای ئەو ئافرەتانە دەردەکەوێ کە ولاّتانی جیهانی سێ هەلی فێرکاریان نەبووە.

بلاّوبوونەوەی گەشەی خێرای دانیشتوان لە ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان شان بەشانی بوونی رێژەیەکی گەورەی دانیشتوان لە گرووپی تەمەنی بچووك. واتە داخوازییەکی خێرا و زۆر لەسەر خزمەتگوزارییە فێرکارییەکان. ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان ناتوانن ئەو پێداویستیانە دابینبکەن کە بەهۆیەوە ئامانجەکانی فێرکردنی گشتی دەگۆرێ و وێرای رۆڵی سەرەکی لە نزمبوونەوەی پیتداری.

دەبێ ئێمە زۆر وریا بین لە هەوڵی سەرپەرشتیکردنی شوێنەوارە دیموگرافییەکانی شارنشینی، تاکو ئێستا رێگایەکی درێژ لەبەردەممان ماوە بۆ تێگەیشتن لە پەیوەندی و وابەستەکانی نێوان گۆرانە ئابوورییە کۆمەلاّیەتییەکان و نێوان گۆرانە دیموگرافییەکان.

بێگومان جیاوازی تریش هەیە لە نێوان ئەزموونی ئاڵوگۆری دیموگرافی ولاّتە ئەورووپییەکان و ئاڵوگۆری دیموگرافی ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان، گۆرانکاری لە پێکهاتەی هێزی کار لە ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان، دەشێ ئەویش کاریگەری باش و پۆزەتیڤی هەبێ بەسەر پیتدارییەوە، ئەگەر زۆربەی ژنان لە دەرەوەی ماڵ هەلی کاریان دەستکەوت، بەلاّم ئەگەر ژنان لە دەرەوەی رۆڵی تەقلیدی خۆیان وەکو دایك یا سەرۆکی خێزان کاریان دەست نەکەوت، ئەوە خێزانی بچووك بەباشتر دەزانن، هەر بۆیەشە کاتێك ژنان داهاتێکی سەرباریان دەستدەکەوێت ئەوە حەز بە خستنەوەی منالّی زۆر ناکەن.



# بەشی پێنجەم

## مردن

## دەستپێك

کەمبوونەوەی مردن هۆکارێکی سەرەکییە بۆ گەشەی ئێستای دانیشتوانی جیهان نەك بەرزبوونەوەی پیتاندن، مەسەلەکە ئەوە نییە خەڵکی وەکو کەروێشك زاوزێ دەکەن، بەڵکو مەسەلە ئەوەیە وەکو مێش نامرن، لە ژیانی خۆماندا بەرادەیەك مردن کۆنترۆڵکراوە زۆربەمان وا هەستدەکەین ژیانێکی درێژ دەژین، راستییەکەی تەمەن درێژی لەسەرجەم جیهان رەواجێکی میللی بەرچاوی هەیە، سەرکەوتنی مرۆڤ بەسەر نەخۆشییەکان و مەرگی زۆر، بێگومان گرنگترین چاکسازییە لە مێژووی رەوشی ژیانی مرۆڤایەتی، ئەوەش وامان لێدەکا شانازی بەخۆمانەوە بکەین، وێرای ئەوەش یەکێك لە دەرئەنجامەکانی چەرخەکەمان گەشەی ئێستای دانیشتوانە و گرفتە کەڵەکەبووەکانی سەر قەبارەی دانیشتوانە، سەرباری گرفتەکان گەشەکردن هەر درێژەی هەیە، وێرای زاڵبونمان بەسەر مردندا وەلێ تاکو ئێستا جیاوازی لە پێشبینیکردنی ئایندە هەیە لەسەرجەم جیهان، هەروەها لە نێوان دانیشتوانی یەك وڵاتیش بیروڕای جیاواز هەیە، ئەو جیاوازییە سەرچاوەیەکی چاوەروانکراوی گەشەی دانیشتوانە، چونکە زیاتر نزمبوونەوەی ئاستی مردن رێژەی گەشەی دانیشتوان بەرز دەکاتەوە، مەگەر بتوانین سنوورێك بۆ پیتاندن دابنێین.

جاران وا بلاوبوو جیاوازی لە رێژەکانی مردن لە سروشتی خۆیدا بۆ ماوەیی یا بایۆلۆژییە، بۆیە ناکرێ بگۆڕدرێ، بەلاَم ئێستا ئێمە ئاگادارین زۆربەی جیاوازییەکان دەگەڕێنەوە بۆ هۆکاری کۆمەلایەتی نەك بایۆلۆژی، لەسەرەتای ئەم بەشەوە بەدوای ئەم خاڵەدا دەچین جیاوازی نێوان توخمە کۆمەلایەتی و بایۆلۆژییەکانی مردن شیدەکەینەوە، دوای ئەوە تیشك دەخەینە سەر هۆکارەکانی مردنی دانیشتوان، هۆکارەکانی مردنی دانیشتوان چین؟ دوای ئەوە و دوای راڤەکردنێکی پوختی چۆنیەتی پێوانەکردنی مردن، دەگەڕێینەوە سەر بابەتی ئەوەی ئەوانەی دەمرن کێن؟ جیاوازییەکانی تەمەن و جۆر و دەستە کۆمەلایەتییەکان چۆن کار دەکەنە سەر هۆکارەکانی مردن.

## توخمەکانی مردن

مردن دوو بواری بایۆلۆژی هەیە، یەکەم: مەودای ژیان، واتە ئەو تەمەنە درێژەی کە مرۆڤ پێی دەگا، دووەم: تەمەن درێژی: واتە توانای زیندوومانەوەی مرۆڤ لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر. توانای بەرەنگاربوونەوەی مردن بە گشتی دیاردەیەکی بایۆلۆژییە، لە کاتێکدا تەمەن درێژی توخمی بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی تری هەیە.

## مەودای ژیان

مەودای ژیان واتە درێژی ئەو ماوەیەی کە مرۆڤ دەتوانێ بژی، هەڵبەت شتێکی ئەستەمە بەدروستی پێشبینی ئەو ماوەیە بکەین کە مرۆڤ تیایدا دەژی، بێگومان دەبێ قایل بین بە درێژترین تەمەن کەمرۆڤ لە واقیعدا بتوانێ بژی (ئەو ژمارەیە لە رۆژێکەوە بۆ رۆژێکی تر دەگۆڕێ)، درێژترین تەمەن کەمرۆڤ بتوانێ بژی، سەبارەت بە تەمەن درێژی پروپاگەندەی زۆر هەیە، بەڵام دڵنیابوون لەو پروپاگەندانە شتێکی ئەستەمە، درێژترین تەمەنی متمانە پێکراو کە مرۆڤ ژیابێ (١٢٠) ساڵ بووە، کەسێکی ژاپۆنی بەناوی (سیکبشیبو ئیزۆی) کە لە ساڵی (١٩٨٦) کۆچی دوایی کرد، واتە چوار مانگ پێش جەژنی لە دایکبوونی (١٢١) ساڵەی خۆی، ( mrfarlan et,al,91)، دەشێ گوێبستی راپۆرتی وەها بووبین کە خەڵکی هەبێ زیاتر لەو تەمەنە ژیابێ، بەڵام هیچ یەك لەو راپۆرتانە پشت راست نەکراونەتەوە، هۆکارەکەشی ئەوە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە تۆماری لە دایکبوان بە شێوەیەکی ورد و دروست تۆمار نەکراوە، یا بەهۆی (ئاگر کەوتنەوە و لافاو) یا بزربوون و لەناوچوون، نموونەیەك بۆ ئەم حاڵەتە پیاوێکی ئەمریکییە بە ناوی (چارلی سمس) کە پێشتر کۆیلە بووە بە قسەی خۆی ساڵی (١٨٤٢) لە لایبیریا لە دایکبووە، ساڵی (١٨٣٤) بە کۆیلەیی هێنراوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تەمەنی (١٣٧) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، رێگای پەیڕەوکراو بۆ زانینی تەمەنی کەسێکی تەمەن گەورە کە کاتێك تۆمارەکانی لە دایکبوون بە پێی پێویست نەبێت، گەڕانەوە بۆ سەرژمێریکردن و زانیاری



کۆکردنەوە، لەبارەی ئەو کەسانە لەو کاتانەی کە بە تەمەن بچووکبوونە. بۆ بەدبەختیش (چارلی سمس) ناوێکی ئاساییە، چەندین جار گوازراوەتەوە، ئەستەمە بەدواداچوونی بۆ بکرێ (MEYERS-1978)، بەڵام تۆماری هاوسەرەکەی لە فلۆریدا دۆزرایەوە، بڕوایەکی بە توێژەران بەخشی کە تەمەنی (٣٣) ساڵ کەمتر نەبووە و کاتی کۆچی دوایی کردووە (١٠٠) ساڵ تێپەری نەکردووە. ( MC WITER 1983) لەکاتی نوسینی ئەم کتێبەش (واتە ساڵی ٢٠٠٣) تەمەن درێژترین مرۆڤ ژنێکی فەرەنسی بوو بەناوی (لویز کالْمنس) کە لەخانوویەکی باشووری فەرەنسا دەژیا، مێژوویی متمانە پێکراوی (٢١ شوباتی ١٨٧٥) بووە و وای لێکردووە ببێتە بەتەمەنترین مرۆڤ لە ساڵی (١٩٩٣) (١١٨) ساڵ (خاتوو کالْمنس ساڵی (١٩٩٧) لە تەمەنی (١٢٢) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد). بەم شێوەیە دەبینین مرۆڤ دەتوانێ تا تەمەنی (١٢٠) ساڵی بژی یا رەنگە زیاتر، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی کەمی ئەو کەسانە دەگەنە ئەو تەمەنە، زۆرینەی خەڵکی نیوەی ئەو تەمەنە دەژین (بەگشتی خەڵکی ٦٥ ساڵ دەژین)، واتە تەنها بیرۆکەیەکە واتە ئەو تەمەنەی کە مرۆڤ تیایدا دەژی، بەمانای ئەوەی توانای مانەوەی مرۆڤ لە ژیان بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ دەتوانێ بژی پێی دەوترێ (درێژیی تەمەن).

## تەمەن درێژیی

## فاکتەرە بایۆلۆژییەکان

هەمیشە تەمەن درێژی بە ئایندەی چاوەروانکراو (الاجل المتوقع) پێوانە دەکرێ، چونکە ناوەندێکی ئامارییە بۆ تەمەن درێژی، تارادەیەکی زۆریش کاریگەرە بەو تایبەتمەندییە بۆ ماوەییانەی کە لەگەڵمان لە دایك دەبن، هێزی ئەندامەکانی جەستە، توانای بەرگریکردنی نەخۆشی، میتاپۆلیزم، چەندان شتی تر هەموویان فاکتەری بایۆلۆژین و ناتوانین کۆنترۆڵیان بکەین مەگەر بەرادەیەکی کەم نەبێت، زۆرێك لە لاوازییە توندە بایۆلۆژییەکان راستەوخۆ دوای لە دایکبون دەردەکەون، دەرئەنجامی

ئەوەش مردن لە ساڵی یەکەم لەناو منالاّندا زۆرترە لە ساڵانی تری تەمەنی منالاّن و گەنجان.

دوای ماوەیەك لە ژیان ماوەی تری زەمەن هەیە، هەمیشە تا ناوەڕاستی تەمەن درێژ دەبێتەوە، کاتێك ئەگەرەکانی مردن تارادەیەك کەم دەبنەوە، دوای ناوەڕاستی تەمەن مردن بە خێرایی زیاد دەکات، ئەم جۆرە مردنە بە پێی تەمەن لە شێوەی ژمارە (١-٥) روونکراوەتەوە، دەبینین جۆرە هاوشێوەکان چ ڕێژەی مردنی حەقیقی نزم بێت یا بەرز، لایەنە بایۆلۆژییەکانی تەمەن درێژی وا لە زۆرێك لە تیۆریستان کردوو بڕوا بکەن کە دەکرێ جۆرەکانی تەمەن درێژی (شێوەی ژمارە ١-٥) بەهاوکێشەی بیرکارییانەی سادەی هاوشێوەی یاسای کێشکردن یا یاساکانی تری سروشت راڤە بکرێن، هەڵبەتە کەڵك و سوودی هیچ یەك لە سادەترین تیۆرەکانیش نەسەلمێنراوە، لەگەڵ ئەوەی نموونە بۆماوەکانی پەیوەست بە شیکارییەکانی مرۆڤ هەندێ ئەگەر دەدەن بە دەستەوە (weiss, 1990)

ساڵی (١٩٩١) ڕێژەی مردن لە ئەفغانستان بەرزترین ڕێژەبوو لە جیهان، لە ژاپۆنیش نزمترین مردن هەبوو، فلیپینیش ناوەندی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سێ وڵاتە شێوەی تەمەنی مردنی جیهانی مردنیان — بەرز لە هەردوو ئاستەکە و نزم لە ناوەند- دەنواند، زانیارییەکانی نێر، بەڵام شێوەکە هەروەکو خۆی بوو سەبارەت بە مێ.

وێڕای بەهێزی و لاوازی بایۆلۆژی تاکەکەسیمان کەچی ئاستە واقعیەکانی مردن بۆ هەر جۆرێك لە جۆرەکان و بۆ هەر تەمەنێك لە هەموو کۆمەڵگاکان وا دەردەکەوێ دەرئەنجامی ئەو فاکتەرە کۆمەڵایەتیانەیە کە کار دەکەنە سەر کات و هۆکاری مردنەکە.



## فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان

**فاکتەری کۆمەڵایەتی بە چەند ڕێگایەك کار دەکاتە سەر ئەگەرەکانی مردن کە دەکرێ لە دوو دەستەدا کۆیان بکەینەوە:**

**١- ژێرخانی کۆمەڵایەتی و ئابووری.**

**٢- شێوازی ژیان.**

ژێرخان بۆ کۆمەڵگا واتە ئەو شێوازەی کە تیایدا سەروەت و بەرهەم دێ و دابەشدەکرێ و ئەو حەقیقەتە دەردەخات کە چۆن خۆراك و پەناگە و جل و بەرگ و ئیمکانیەتی گەیشتن بە هاوکارییە پزیشکییەکان کار دەکەنە سەر مردن، هەروەها لە چ رەوشێکی کۆمەڵایەتی دەشێ ڕێژەکانی مردن کار بکەنە سەر شێوازی ژیان، خۆراکە چەورەکان و خوێ و کەهول و ئاستی بەکارهێنانی توتن و کەم وەرزشکردن ئەمانە سەرجەمیان کار دەکەنە سەر تەمەن کورتی.

لەگەڵ ئەوەی تەمەن درێژی دایك و باوکت کلیلی تەمەن درێژی تۆیە، کەچی تایبەتمەندییەکانی ژیانێکی درێژ، بریتییە لە تێکەڵەیەك لە هەڵبژاردنی شێوازەکانی ژیان، بۆ وێنە (لیسنەر برسلۆ) راگری پێشووی کۆلیژی پزیشکی گشتی زانکۆی کالیفۆرنیا — لۆنس ئەنجلۆس پێی وایە کلیلی درێژکردنەوەی تەمەن پرۆسەیەکی ڕێك و پێك و نان خواردنی رۆژانە و کێشی ئاسایی و جگەرە نەکێشان و خواردنەوەی خواردنەوە رۆحییەکان بە رادەیەکی مامناوەندی و خەوتن (٧-٨) کاتژمێر رۆژانە و ڕێکخستنی ژەمەکانی خواردن. زۆرینەی ئەو توێژەرانەی کە گرنگی بەم مەسەلانە دەدەن روانگەیەکی گەشبینانەیان بۆ ژیان خستە سەر لیستەکە.

جیمس بێرن سەرۆکی سەنتەری لێکۆڵینەوەی بەساڵاچوان لە زانکۆی باشووری کالیفۆرنیا تێبینی کردووە ئەو کەسانەی کە ژیانێکی باش دەژین ئەوکەسانەن کەهەمیشە بەرەو ئایندە بیر دەکەنەوە. ئەو پێشنیارانە بەسەر جیهانی رۆژئاوا قۆرخ نەکراوە، هەروەها تازەش نین، بەڵکو کۆمەڵێك توێژەرانی بواری تەندروستی کە لەباشووری چین توێژینەوە لەسەر بەساڵاچوان کردووە، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە

فاكتەری گرنگ هەن بۆ تەمەن درێژی وەك هەوای پاك، مامناوەندی لە خواردن و خواردنەوە و وەرزشكردنی رێك و پێك و روانگەیەكی گەشبینانە، هەروەها دكتۆر (ڤیبەر) ساڵی (١٩٠٣) كە تەمەنی (٨٣) ساڵ بوو، لە گۆڤارێكی پزیشكی بەریتانی وتارێكی بلاَوكردەوە و تیایدا روانگەی خۆی بۆ ژیانێكی درێژ خستۆتەروو. "لە خواردن و خواردنەوە لەسەرجەم چێژە جەستەییەكان مامناوەندی بە، بەبێ گرنگیدان بە كەش و هەوای رۆژانە وەرزش بكە، زۆر زوو بخەوە و زوو هەڵسە، لە (٦-٧) كاتژمێر زیاتر مەخەوە، رۆژانە خۆت بشۆ، لەسەر بنەمایەكی رێك و پێك عەقڵی خۆت سەقاڵ بكە، چێژ وەرگرتن لە ژیان تاكو عەقڵت هێور دەبێتەوە و پڕ دەبێ لە هیوا، بەسەر ئارەزووەكانیدا زاڵبە، گرنگی بە تەندروستی بدە، لە خواردنەوەی كەهولییەكان و تلیاك و دەرمانە هێوركەرەوەكان خۆت بەدوور بگرە ( QUOTED IN METHILFF -1908)، جیاوازییەكی گەورە لە تەمەن درێژی لە جیهان هەیە (بڕوانە شێوەی ژمارە ٢-٥) و فاكتەرە كۆمەڵایەتییەكان بەهەمان ئەو شێوازە كار لەو جیاوازییانە دەكەن كە تیایدا كار دەكاتە سەر گۆڕانە مامناوەندییەكان — هۆكاری پەیوەندیدارەكان.

ولاَتە دواكەوتووەكانی ئاسیا و ئەفریقیا لەمەر (ئایندەی چاوەڕوانكراو) لە ژێر رێژەی جیهانین (٥٦ ساڵ)، بەلاَم ولاَتانی ئەمریكای لاتین لە ناوەندی جیهانی نزیكن، كەچی ولاَتە پێشكەوتووەكانی ئەمریكا و ئەوروپا و ئاسیا لەسەرووی ناوەندەوەن.

Source: data courtesy of population reference bureau, I, n,c, Washington.d,c.

## پێوەرەكانی مردن (مقاییس الوفیات)

١- **تێكڕای مردنی گشتی:** ئەمەش بریتییە لە ژمارەی ساڵانەی مردن بۆ هەر هەزار كەسێك لە دانیشتوان، باشتر وایە بۆ هەر هەزار كەسێك بێت لە دانیشتوان لە نیوەی ساڵدا، وەك لەم هاوكێشەیەی خوارەوە دەردەكەوێ:



تێكڕای گشتی مردن: = ژمارەی مردن لە ساڵ و شوێنی دیاریكراو

———————————— × ١٠٠٠

ژمارەی دانیشتوان (لەنیوەی ساڵدا)

بۆیە پێی دەڵێن تێكڕای گشتی لەبەر ئەوەی جیاوازی مردن لە نێوان دەستە جیاوازەكانی تەمەن لەبەر چاو ناگرێت.

٢- **تێكڕای مردنی تایبەت بە تەمەن:** ئەمەش بریتییە لەو تێكڕاییانەی كە مردن دەپێوێ بۆ هەر یەك لە دەستە تەمەنەكانی یەك ساڵ و پێنج ساڵ و دە ساڵ...هتد.

٣- **تێكڕای مردنی تایبەت بە تەمەن** =

ژمارەی مردن لە دەستەی ٢٠-٢٤ لە ساڵێكی دیاریكراو

———————————— ×١٠٠٠

ژمارەی دانیشتوان لە دەستەی (٢٠-٢٤).

بە شێوەیەكی گشتی رێژەكانی مردن لە تەمەنەكانی لاوێتی و هەرزەكاران لەنزمترین ئاستدایە، بڕوانە وێنەی (١-٥).

٣- **تێكڕای مردنی منالاَنی شیرەخۆرە:** ئەمەش بریتییە لە ژمارەی مردووان لە نێومنالاَن لە كات و ساتی لە دایكبوونەوە تاكو پێش تەواوبوونی ساڵی یەكەم، لە تەمەنی هەر هەزار كەسێك لە لەدایكبوونی زیندوو:

**ژمارەی ساڵانەی مردوانی منالاَن لەكاتی لەدایكبوونەوە تاكو پێش ساڵی یەكەم**

**تێكڕای مردوانی منالاَنی شیرەخۆرە** =

———————————— ×١٠٠٠

**ژمارەی ساڵانەی لەدایكبوونی زیندوو.**

مردنی منالاَن بە شێوەیەكی یەكسان بەسەر تەواوی رۆژەكانی ساڵدا دابەش نەبووە، راستییەكەی زۆربەی مردنەكان لە شەش هەفتەی یەكەمی ساڵ روودەدەن، لەو ناوچانەی كە مردنی منالاَنی تیادا نزمە، نیوەیان لە چوار هەفتەی یەكەمی دوای

لەدایکبوونیان دەمرن، مردنیش لەکاتێکی زووی تەمەندا ڕەنگە بۆ نارێکی دروستبوونی یان زەبر پێگەیشتن لە کاتی لەدایکبوون دەگەڕێتەوە، ئەمەش تاکو ئێستا زانستی نۆشداری ناتوانێت سنوورێکی بۆ دیاریبکات.

٤- **خشتەکانی ژیان:** سەرەڕای سوودی جیاوازی ڕێژەکانی مردن بۆ دەست نیشانکردنی بارودۆخی مردن، بەلاّم شتێکمان پێ ڕاناگەیەنن دەربارەی ئایندەی چاوەڕوانکراو لەلای دەستە تەمەن جیاوازەکان، هەروەها هیچ شتێکیش دەربارەی ئەوانەی لە ژیاندا دەمێننەوە لەتەمەنە جیاوازەکان ڕوون ناکەنەوە. ئەم زانیاریانە ئەگەر هەبن بەسوودن، بۆیە خشتەکانی ژیان ئەم جۆرە زانیاریانە دەستەبەر دەکات کە بونیادنراوە لەسەر مردنی پۆلینکراو بەپێی تەمەن و جۆر، هەروەها زانیارییەکانی تایبەت بە ئایندەی چاوەڕوانکراو تێکرای مانەوە لەژیانمان بۆ دەستەبەر دەکات.

## ئەو فاکتەرە سەرەکیانەی کە مردن دیاریدەکەن

مردن لە کاتێکی بۆ کاتێکی تر و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە، لە پێناو تێگەیشتنی ئەم جیاوازییە پێویستە دیاریکەرەکانی مردن لەبەر چاو بگرین، زانیارییەکانی تۆمارە ژیانییەکان تایبەت بە مردن (کە مردن بەپێی تەمەن و جۆر و هۆ) تۆمار دەکەن، سوودبەخشە، بەلاّم زۆری تۆمارە ژیانییەکان لە ولاّتانی تازەپێگەیشتوو تاکو ئێستا ناکامڵە.

بەپێی خەملاّندنەکانی (UN) تەنها (٦٨٪) مردوان لە ئەمریکای لاتین تۆمارکراوە، (١٥٪) لە ئاسیا و کەمتر لە (١٪) لە ئەفریقیا تۆمار دەکرێت.

سەرەڕای کەموکورییەکان لەسەرژمێرییەکانی مردوان، بانکی نێودەوڵەتی و نەتەوەیی یەکگرتووەکان هەستاون بە بلاّوکردنەوە، تێکرا ژیانییەکانی زۆربەی ولاّتانی جیهان.



## مردن، نەخۆشی، گواستنەوەی پەتا

هەندێ جار نەخۆشی نابێتە هۆی مردن، نەخۆشییەکانیش پۆلین دەکرێن بۆ نەخۆشییەکانی (معدیە) تەشەنەسەندووەکان و (الانحلالیە) جێگرتنەوە، ڕۆڵی ئەو نەخۆشیانە لە تێکڕاکانی مردنی گشتی بەپێی کات دەگۆڕێت، و دەبێتە هۆی پێشکەوتنی (بیردۆزی گواستنەوەی پەتا) کە بۆ یەکەمجار (عبدالرحیم عمران) لە ساڵی (١٩٧٧) بەم شێوەیەی خوارەوە باسیکردووە:

ئەم تیۆرەیە تیشك دەخاتە سەر گۆڕانی جۆرەکانی نەخۆشی و پەیوەندی ئەمە بە گۆڕانە دیموگرافی و کۆمەلاّیەتی و ئابووری و ژینگەیی و ژیانییەکان. زۆرێك لە ولاّتان گۆڕانێکی بەرچاو لە ئاستە بەرزەکانی مردنەوە بۆ ئاستە نزمەکان بەخۆوە دەبینن، هاوشان گەشەکردنی کۆمەلاّیەتی و پەرەسەندنی پزیشکی لە بواری داو و دەرمان، بەتایبەت (دژە ژیانییەکان و المبیدات) و گرتنەبەری ڕێوشوێنی پزیشکی توندوتۆڵی دوای جەنگی دووەمی جیهانی هەروەها ئالوگۆڕێکی ڕوون لە جۆرەکانی نەخۆشی و هۆکارەکانی مردن ڕوویداوە، نەخۆشییەکانیان شوێنی نەخۆشییە بەربلاّوەکان و ئەو نەخۆشیانەی گرتۆتەوە کە دەرئەنجامی ئەو فشارەن کە ڕووبەرووی مرۆڤ دەبێتەوە و دەستکردی خودی مرۆڤن، بەم شێوەیە چیتر نەخۆشی تیفۆئید و سیل و کۆلێرا و دیفیتریا و تاعون نەخۆشی سەرەکی نین و هۆکاری بنەڕەتی مردن نین و نەخۆشییەکانی دڵ و شێرپەنجە و جەڵتە و شەکرە و نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەرس و شوێنی ئەو نەخۆشیانەیان گرتۆتەوە. وێڕای نەخۆشی دەروونی و ڕووداوە پیشەسازییەکان کە هۆکارەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ داڕووخانی ژینگە. گواستنەوەی پەتا بەرزبوونەوەیەکی هەستپێکراو لە ئایندەی چاوەڕوانکراو لە نێوان خەڵکی لەگەڵ خۆی دەهێنێ، ڕێژەی ئایندەی چاوەڕوانکراو لەسەر ئاستی جیهان لە (٣٠) ساڵەوە ساڵی (١٩٠٠) بەرز بۆوە بۆ نزیکەی (٦٦) ساڵی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، هەڵبەت نا لێکچوونێکی گەورە لە نێوان دەوڵەتێك بۆ دەوڵەتێکی تر هەیە، ئایندەی چاوەڕوانکراوی ئەمڕۆ دەگاتە (٤١) ساڵ لە ئەمریکای ناوەڕاست بۆ (٨٠) ساڵ لە ژاپۆن.

زیاتر لە (٣٠٠) ملیۆن کەس لە ولاَتانێك دەژین کە تیایدا ئایندەی چاوەروانکراو ناگاتە (٥٠) ساڵ (واتە بەر لەوەی بگەنە ٥٠ ساڵ دەمرن —و.ك)، لەو ولاَتانە لە دە منالّی تازە لە دایکبوون یەکێکیان دەمرێ بەر لەوەی بگاتە تەمەنی یەك ساڵی، هەڵبەتە ئایندەی چاوەروانکراو پەیوەستە بە ئاستی گەشەی ئابووری (بەبەراورد بە ڕێژەی داهاتی تاك).

زۆربوونی ئایندەی چاوەروانکراو لەم چوار دەیەی دوای لە نێوان ولاَتانی جیهان یەکسان نییە، تا ئێستا کەلێنێکی فراوان لە (نزیکەی ١٠ ساڵ واتە ٦٤ بەرامبەر ٧٤) لە نێوان ولاَتانی تازە پێگەیشتووی ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتین و ولاَتانی پێشکەوتوو، بەلاَم ئەو کەلێنە لەم سالاَنەی دوایی لە کورتی داوە.

پەیوەندی نێوان مردن و گەشەی ئابووری هەمیشە جێگای گرنگیپێدان و گفتوگۆکردن بووە، هەندێك پێیان وایە پێشکەوتنی هەلومەرجی مردن لە ولاَتە تازەپێگەیشتووەکانی ئەمڕۆ بە شێوەیەکی فراوان پابەند نین بە گەشەی ئابووری وەکو جاران، لە کاتێکدا هەندێکی تر دەڵێن گەشەی ئابووری فاکتەری سەرەکی و کاریگەرە لەسەر ڕەوشی مردن.

لە سەرنجی سەرەتادا دەردەکەوێ ڕێژەی داهاتی تاك لە ولاَت فاکتەری گرنگە، لە ڕاپۆرتی ئاستەکانی مردن لە ولاَتە پێشکەووتوەکانی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و باکوور و ڕۆژئاوایی ئەوروپا داهاتی تاك (٢٠,٠٠٠) دۆلار زیاترە، لەو ولاَتانەی کە ئایندەی چاوەروانکراو دەگاتە (٧٥) ساڵ، لە کاتێکدا چەندین ولاَتی ئەمریکی کە داهاتی تاك دەگاتە سنووری (٦٠٠) دۆلار لە ساڵێکدا ئایندەی چاوەروانکراو دەگاتە (٥٣) ساڵ، لەگەڵ ئەوەشدا چەند ولاَتێکی داهات نزم هەیە تیایاندا ئایندەی چاوەروانکراو دەگاتە ئاستی ولاَتە پێشکەووتوەکان (چین -٧٢، جامایکا -٧٢, سریلانکا — ٧٦ و کوبا ٧٥ ساڵ).



## هۆکارەکانی مردن

هۆکارەکانی مردن لە ولاَتە پێشکەوتووەکان بۆ ولاَتە تازە پێگەیشتووەکان جیاوازە، ولاَتە پێشکەوتووەکان کە بونیادێکی تەمەنی گەورەی تەمەنیان هەیە، جۆرێك لە نەخۆشییەکانی (**الانحطاطات**)یان دەردەکەوت، وەکو لە شێوەی (١-٥) دەردەکەوێ نەخۆشییەکانی دڵ و جەڵتە و نەخۆشییەکانی سوری خوێن کاریگەری زۆریان هەیە لە ڕێژەی مردن، هەروەها نەخۆشییەکانی شێرپەنجە بەرێژەی (٣٣,٥٪) کاریگەریان هەیە بەلاَم ولاَتە تازە پێگەیشتووەکان کە پێکهاتەیەکی دانیشتوانی گەنجیان هەیە و مردنی منالّ بەسەر شێوەی مردندا زاڵبووە، بۆیە هۆکارەکانی مردن لەم ولاَتانە پەیوەستە بە نەخۆشییەکانی گەنجەوە، نەخۆشییە بەربلاَوەکان و مشەخۆرەکان و بەنەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەرس و سیل زیاتر لە (٢,٠٪) ڕۆڵیان هەیە لەمردن، دەکرێ هۆکارەکانی مردن بۆ دوو فاکتەری سەرەکی بگەرێنینەوە: **فاکتەرە ژینگەییەکان و فاکتەرە ئابوورییەکان — کۆمەلاَیەتییەکان** یا هەردووکیان.

**خشتەی (١-٥) نەخۆشییەکانی دڵ دەبنە هۆی مردن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان (١٩٩٠)**

| هۆکاری مردن | ڕێژەی سەدی |
| --- | --- |
| نەخۆشییەکانی دڵ | ٣٣,٥ |
| شێرپەنجە | ٢٣,٥ |
| جەڵتە و نەخۆشییەکانی سینگ | ٦,٧ |
| ڕووداو | ٤,٢ |
| نەخۆشییە درێژخایەنەکانی سی | ٤,١ |
| ئەنفلەوەنزا و نەخۆشییەکانی سی | ٣,٦ |
| شەکرە | ٢,٢ |
| خۆکوشتن | ١,٤ |

| | |
|---|---|
| تشمع الكبد (كزانەوەی جەرگ) | ١,٢ |
| کوشتن | ١,١ |
| ئایدز | ١,١ |
| هۆکارەکانی تر | ١٧,٤ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ |

**١- هۆکارە ژینگەییەکان:** دەشێ فاکتەرە ژینگەییەکان کاریگەرییەکی درامیان هەبێ بەبێ ئەوەی پێشبینی ئاستەکانی مردن بکرێ، حاڵەتی وشکە ساڵی و لافاو کاریگەریەکی دیار و بەرچاویان بەسەر رێژەی مردنەوە هەیە لەو ناوچانەی ئەو کارەساتانەی تیادا روودەدات. هەروەها مەترسی ژینگەیی دیکە هەیە کە کاریگەری درامی کەمتریان هەیە وەك کەشی گەرم و شێدار، ئەم رەوشە کاریگەرییەکی کەمتری هەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانێ کاریگەری هەبێ بەسەر مردنەوە، ئەوەش لە رێگای رەخساندنێکی هەلومەرجێك کە ببێتە هۆی بلاوبونەوەی نەخۆشی، پیسبوونی کەش و هەوا دەبێتە هۆی بلاوبونەوەی جۆرەکانی نەخۆشی وەك شێرپەنجە و نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەناسەدان، هەروەك چۆن تیشکی سەروو وەنەوشەیی دەبێتە هۆی شێرپەنجەی پێست، لەگەڵ ئەوەی فاکتەرە ژینگەییەکان بەفاکتەری گرنگ دادەنرێن لە راپۆرتی رێژەکانی مردن، کەچی ئاسان نییە بە ژمارە دیاریبکرێ، چونکە زۆرێك لە فاکتەرە ژینگیییەکان پەیوەندییان بە فاکتەرە ئابووری — کۆمەلایەتییەکانەوە هەیە و پێیان کاریگەرن.

## فاکتەرە ئابووری – کۆمەڵایەتییەکان

یەکێك لەو فاکتەرە ئابووری - کۆمەلایەتیانەی کە کاریگەرییەکی رونیان بەسەر مردنەوە هەیە هەلومەرجی نیشتەجێبوونە، رێژەکانی مردن لە شوێنە شێدار و قەرەباڵغ و پڕ دانیشتوانییەکان بەرزە، هەروەها خەرجی تەندورستی و فەراهەمبوونی



ئاوی پاك کاریگەریەکی راستەوخۆی لەسەر مردن هەیە، سەبارەت بە رەوشی خۆراك و توانای گەیشتن بە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکانیش هەمان شتە، دەشێ چینی کۆمەلایەتی تاکەکان کاریگەریی هەبێ بەسەر ئایندەی چاوەروانکراوەوە.

زۆرێك لە لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە ئایندەی چاوەروانکراو لای خەڵکە پیشەوەرەکان بەرزە، وەك لە لای کرێکارە بێ بەهرەکان لەسەرجەم وڵاتانی پێشکەوتوو و دواکەوتووەکان، وەکو ئاشکرایە فاکتەرە کۆمەلایەتی — ئابوورییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو رۆڵیان لە ئاستەکانی مردن هەیە، بەڵام زۆر ئەستەمە کاریگەری هەر فاکتەرێك بەسەر رێژەی مردن بە جۆرێك لە وردی بپێوین، چونکە زۆربەی فاکتەرەکان پێکبەستەن و بەسەربەخۆ کار ناکەن، چاکسازی لە رەوشی ئابووری و کۆمەلایەتی کاریگەریی خۆی هەیە کە دەشێ لە کەمبوونەوەی مردن دەربکەوێ، هەندێ لە زانایان پێیان وایە فاکتەرە ئابووری — کۆمەلایەتییەکان گرنگترن لەفاکتەرە ژینگەییەکان لەکاریگەری خستنە سەر کومبوونەوەی مردن، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە دەکرێ زۆرێك لە فاکتەرە ژینگەییەکان کاریگەرییان کەمبکرێنەوە یا کۆنترۆڵ بکرێن، دەرئەنجامە کەڵەکەبووەکانی سەر فاکتەرە ژینگەییەکانیش بە فاکتەرە ئابووری کۆمەلایەتییەکان کۆنترۆڵی دەکرێ، ئەمەش بەو دەرئەنجامەمان دەگەیەنێ کە کاریگەری فاکتەرە ژینگەییەکان بەسەر مردنەوە لەگەڵ پێشکەوتنی فاکتەرە ئابووری — کۆمەلایەتییەکان لەناو کۆمەڵگا کەم دەبێتەوە.

## جیاوازییەکانی مردن

**مەترسییەکانی مردن بەتەمەن وجۆر و نەژاد و داهات و لادێ و شار و ...هتد دەگۆڕێ.**

## جیاوازییەکانی تەمەن

ئەگەری مردن لای منالانی شیرەخۆرە زۆرە (لە ساڵێك بچوکتر)، بەڵام ئەگەری مردن لای منالانی (دوای ساڵی یەکەم) و هەرزەکاران و گەنجان زۆر کەمە، دوای ئەوە

ورده ورده ئەگەری مردن بەرزدەبێتەوە و لای گەورە تەمەنان زۆر بەرز دەبێ، تێبینی دەکرێ باشترکردنی رەوشی مردن زۆرجار لە قۆناغی سەرەتایی مناڵێتی و قۆناغی مناڵێتی ئەنجامدەدرێ وێرای تەمەنەکانی تر.

وەك هەمیشە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو و تازەپێگەیشتووەکان لەو رووەوە هەیە، لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان دەبینین مردن لەنێوان مناڵانی ژێر پێنج ساڵی هەیە، ئەوەش بەهۆی نەخۆشییە تەشەنەسەندووەکانەوەیە، بۆیە رێژەی تەنها (٥٪) لەو وڵاتانە گەورە تەمەنەکانن کە تەمەنیان گەیشتۆتە (٧٥) ساڵ و زیاتریش.

لەبەرامبەردا لەوڵاتە پێشکەوتووەکان دەبینین تەنها (٢٪) مردن لە نێو مناڵانی ژێر (٥) ساڵەوەیە، لە کاتێکدا سێ بەشی مردن لەنێو گەورە تەمەنەکاندایە.

## مردنی مناڵانی شیرەخۆرە

رێژەی مردنی مناڵانی شیرەخۆرە دەگاتە (٤,٣) لە ژاپۆن و (١٦٣) لە ئەفغانستان (رەوشەکە هەندێ شت لە نەوەدەکان باشتربوو)، لەنێو هەرێمەکانی جیهان دەبینین بەرزترین رێژەی مردنی مناڵانی شیرەخۆرە لە ئەفریقیایە و بەرێژەی (٩٠)ە، دوای ئەویش ئاسیا بەرێژەی (٦٠) دێ. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش (٨) لە ئوردنیش (٢٩)یە، گرفتی مردنی مناڵانی شیرەخۆرە پەیوەندییەکی زۆری بە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانەوە هەیە، لە دەیەی نەوەدەکان نزیکەی (٩٨٪) مردن لە نێو مناڵانی ژێر پێنج ساڵەوەبوو، هەڵبەت لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان. بە گوێرەی خەمڵاندنەکانی یونیسیف (٩٥٪) لە (١٤,٥) ملیۆن مردن لە نێو مناڵانی شیرەخۆرە و مناڵانە لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانە کە دەکرێ رێگەی لێ بگیرێ، تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیش (٣٠٠) هەزار مناڵی ژێر پێنج ساڵە دەمرن (زۆربەیان لە وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵات و کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران) کە دەکرێ بەرێژەی (٦٠٪) رێگا لەو مردنە بگیردرێ.



بە گوێرەی یونیسێف لە ساڵی (١٩٥٠) (٢٤٪) مردنی مناڵانی تازە لە دایکبوو لە جیهان بەر لەتەمەنی پێنج ساڵی روویاندەدا، بەڵام بە هاتنی نەوەدەکان رێژەی مناڵانی شیرەخۆرە نزمبۆوە بۆ (١٠٪)، کەمبوونەوەی مردنی بەرچاویش لە چین روویدا کە لە رێژەی (٢٦٪) نزمبۆوە بۆ (٤٪)، هەروەها لە ژاپۆن رێژەکە لە (٧,٥٪) نزمبۆوە بۆ (٠,٨٪) لە هەمان ماوەدا.

توێژەران چەند فاکتەرێکیان دەستنیشانکردووە کە دەکرێ پەیوەندییان بە ئەگەرەکانی مردنی مناڵانی شیرەخۆرەوە هەبێ، یەك لەو هۆکارانەش مناڵخستنەوە لە نێو هەرزەکاراندا، یا لە نێو ژنانی سەروو چل ساڵی، یا لە نێو ئەو کەسانەی کە زیاتر لە حەوت مناڵیان بووە، یا لە نێو ئەو ژنانەی کە ماوەی نێوان مناڵەکانیان لە سێ ساڵ کەمتر بێ.

لەزۆربەی وڵاتانی جیهان رێژەی مردنی مناڵانی شیرەخۆرە لەگەڵ باشتربوونی رەوشی خوێندەواری دایکان کەمبۆوە، ئەگەر دایکان چەندە هۆشیار بن ئەگەری زیاتری هەیە کەڵك لە خزمەتگوزاری دایکایەتی و سەنتەرە تەندروستییەکان وەربگرن، بەتایبەت چاودێریکردن لە ماوەی پێش مردن، لە کاتی لە دایکبوون یا لەخۆراك پێدانی مناڵ و چارەسەرکردن و وشکبوونەوە لای مناڵان.

**ئەم خشتەیە هۆکارەکانی مردنی مناڵ لە خوار پێنج ساڵییەوە لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان رووندەکاتەوە:**

**خشتەی (٢-٥) هۆکارەکانی مردنی منالآنی خوار تەمەن پێنج ساڵی لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان لە ساڵی ١٩٩١ ڕووندەکاتەوە:**

| هۆکارەکانی مردن | ژمارەی مردن (١٠٠٠) | ڕێژەی مردن (١٪) |
|---|---|---|
| نەخۆشییەکانی سکچوون | ٤,٠٠٠ | ٢٧,٤ |
| الامراض القابلة للتطعيم (ئەو نەخۆشیانەی دەگوازرێنەوە) | ٣,٧٠٠ | ٢٥,٣ |
| سووریژە | ٢,٠٠ | ١٣,٧ |
| کۆکە ڕەشە | ٦٠٠ | ٤,١ |
| سیل | ٣٠٠ | ٢,١ |
| گوێ ڕەپەی کۆرپە | ٧٧٥ | ٥,٣ |
| ئیفلیجی | ٢٥* | ٠,٢ |
| هەوکردنی توندی کۆئەندامی هەناسە | ٢,٣٧٥ | ١٦,٣ |
| مەلاریا | ٧٥٠ | ٥,١ |
| نەخۆشییە تەشەنەسەندوو و مشەخۆرییەکانی تر | ٤٥٠ | ٣,١ |
| الاصابات (پێکان) | ٢٠٠ | ١,٤ |
| هۆکاری دیکە | ٧٠٠ | ٤,٨ |
| کۆی گشتی | ١٤,٦٠٠ | ١٠٠ |

* ساڵانە (٢٥٠٠٠٠) منالْ تووشی ئیفلیجی دەبن و نزیکەی (١٠٪) یان دەمرن.

* SOURCE: W. henry mosley and peter Cowley (1991) "the challenge of world health" population bulletin 46:

گرفتێکی تر هەیە کە پەیوەستە بە بەدخۆراکی لای منالآن، لەگەڵ ئەوەی بەدخۆراکی لەنێو هۆکارەکانی ناو ئەو خشتەیە نییە، بەلاّم بەرێژەی (٤٠٪) بەشدارە



لە ڕێژەی مردن، هەروەها زیاتر لە (١٧٧) ملیۆن منالْ بە دەست بەدخۆراکییەوە دەناڵێنن ڕەنگە ئەو ژمارەیە بگاتە (٢٠٠) ملیۆن منالْ.

## جیاوازییەکانی ڕەگەز

جیاوازییەکانی ڕەگەز لەلایەن زانایانەوە گرنگی زۆری پێدراوە وا دەردەکەوێ ئەگەر مردن لەنێو نێرینەکان بەرزترە لەسەرجەم قۆناغەکانی تەمەن، هیچ راڤەیەکی ئاسان و قبوولکراو بۆ ئەو جیاوازییەش نییە، زۆرێك لە زانایان دەڵێن مێینەکان لەرووی بونیادەوە لە نێرینەکان بەهێزترن (ئەم راڤەیە لەلای زۆربەی ژنان قبوولکراوە).

زۆربەی مردن لە نێو ژنانی وڵاتی تازە پێگەیشتوو دەرئەنجامی ڕێژەی بەرزی پیتداری و دووبارەبوونەوەی منالبوون و ئالۆزییەکانی ئەو دووبارەبوونەوەیە، هەروەها راڤەیەکی تر بۆ جیاوازیی مردن لە رووی جۆرەوە هەیە، ئەوەش پیشە و پێگەی کۆمەلایەتی و ڕۆڵەکانە، چونکە نێرینەکان زیاتر لە مێینەکان بۆ کارە مەترسیدارەکان، بەکار دەهێنرێن. هەندێك پێیان وایە نێرینەکان زیاتر لە مێینەکان دەکەونە ژێر فشارەوە، هەروەها نێرینەکان زیاتر لە مێینەکان جگەرەدەکێشن، وزیاتر لە مێینەکان ئۆتۆمبێل لێدەخورن و ئەمە جگە لەوەی ساڵانە ژمارەیەکی زۆری نێرینە بەهۆی جگەرەکێشانەوە دەمرن.

## ئایدز

دەیەی رابردوو بەرزبوونەوەیەکی فراوانی مردن بەهۆی ئایدزەوە بەخۆوە بینی، زانیارییەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ئاماژە بەوە دەکەن لەگەڵ هاتنی ساڵی (١٩٨٧) ڕێژەی مردن بەو هۆیەوە گەیشتە (٥٠٠٠٠٠) حاڵەت، لە جیهان نزیکەی (٥) بۆ (١٠) ملیۆن کەس هەڵگری ئەم ڤایرۆسەن، لەگەڵ هاتنی (١٩٨٦) گەیشتە (٣٢٥٦٠) حاڵەت، لە نیوەی ڕۆژئاوایی گۆی زەوی نزیکەی (٩٠٪)ی ئەوانەش لە

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی دەڵێ لە ساڵی (١٩٥٥) (١,٢) ملیۆن حاڵەتی ئایدز هەبووە، بەڵام ژمارە ڕاستییەکە (٤,٥) ملیۆن حاڵەتە و (بەهۆی نا وردی زانیارییەکان و کەموکوری لە تۆمارکردن). ژمارەی تووشبوانی ڤایرۆسەکە گەیشتۆتە زیاتر (٢٠) ملیۆن کەس زۆربەشیان لە ئەفریقیان بەڕێژەی (٧٠٪)، شایانی باسە ئایدز لە ناو هەردوو ڕگەزی نێر و مێ-دا بڵاو دەبێتەوە.

زۆرێك لە توێژەران پێیان وایە ئایدز (٦) ساڵ بەر لەوەی لە ئەمریکا دەربکەوێ گەیشتە ئەفریقیا، لە ساڵی (١٩٧٢) ئایدز لە ئەفریقیا ناسراو و دواتر بەرەو زۆربەی وڵاتانی دیکە بڵاوبۆوە.

(ئایدز دەکوژێ)، ئەمە ئەو ڕستەیەیە کەنزیکەی دەیە و نیوێکە بە ملمانەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی خەڵك ئەو حەقیقەتەیان فەرامۆش کردووە یا قبووڵیناکەن، بەتایبەت گەنجان کە دەکرێ بەدوو ڕێگا خۆمان لەو نەخۆشییە بەدوور بگرین، ئەوەش بەخۆ قەدەغەکردن لە پرۆسەی جووتبوونی نا شەرعی یا بەکارهێنانی کۆندۆم یا بە هەردووکیان، بەڵام ئەم دوو ڕێگایە هەردووکیان لەلای گەنجان ڕەتکراوەیە.

## جۆرەکانی مردن لە جیهاندا

لەدیراسەکردنی جۆرەکانی مردن لە جیهان وەکو پێوەرێك پشت بە ڕێژەی مردنی گشتی (عام) دەبەستین، لەگەڵ ئەوەی ئەو ڕێژەیە بەرادەیەکی زۆر کاریگەرە بە پێکهاتەی تەمەنی دانیشتوان، بۆ وێنە، دەبینین ڕێژەی مردنی گشتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرزترە لە ڕێژەی مردن لە مەکسیك، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە دەزانین ڕەوشی مردن لە مەکسیك خراپترە وەك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. هەڵبەتە دوو پێوەر هەیە: ئایندەی چاوەڕوانکراو و ڕێژەی مردنی منالانی شیرەخۆرە، ئەم دوو پێوەرە ڕەوشی ڕاستەقینەی مردن دەردەخەن، ڕێژەی مردنی شیرەخۆرە لە مەکسیك گەیشتە چوار هێندەی ڕێژەی مردن لە ویلایەتە



یەکگرتووەکان، ئایندەی چاوەڕوانکراو لە کاتی لە دایکبوون لە مەکسیك کەمترە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، شێوەی ژمارە (٣-٥) ڕێژەی مردنی گشتی دەردەخا.

ئەو ڕێژەیە بۆ ژماردنی ڕێژەی زیادبوونی سروشتی بەکار دێ، ئەگەر ناوچەیەك ڕێژەی مردنی نزم بێت ئەوە ڕێژەی لەدایکبوونی خاوی زۆرە و ڕێژەی گەشەی دانیشتوانی بەرزە، بەڵام ئەو ناوچانەی کە ڕێژەی مردنی تیایاندا بەرزە و ڕێژەی لەدایکبوونیشیان هەر بەرز بوو دەشێ لەئایندەدا گەشەیەکی دانیشتوانی بەرز بەخۆوە ببینن، چونکە چاوەوران دەکرێ ڕێژەی مردن خێراتر بێ لە ڕێژەی لەدایکبوون.

ڕێژەی مردنی گشتی لە جیهان لە ساڵی (٢٠٠١) بە (٩) هەزار دەخەملێنرێ، نموونەی ئەم ڕێژەیە لە چەندین وڵاتی پێشکەوتوو چەندین وڵاتی تازە پێگەیشتووی ئەمریکای لاتینی بەرچاو دەکەوێ، لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا و ئاسیا و چەند ناوچەیەکی باکووری ئەفریقیا ڕێژەی مردن نزیکەی (١٠) و (٢٠) لە هەزاردا، بەرزترین ڕێژەی سەرووی (٢٠) لە ئەفریقیا و ئەفغانستان بەرچاو دەکەوێ، ئەمە و چاوەڕوان دەکرێ ڕێژەی مردن نزمبێتەوە، ئەگەر برسیەتی و قاتوقڕی و کارەساتی بەرفراوان ڕوونەدات.

کەم خۆراکی کار دەکاتە سەر زۆربوونی ڕێژەی مردن لە نێو منالانی شیرەخۆرە و گەورەتەمەنان، و دانیشتوانی تر بەگشتی، لەگەڵ ئەوەی ڕێژەی مردن کاریگەری دیموگرافی بۆ ماوەیەکی درێژی برسیەتی دەپێوێ، بەڵام کاریگەریی کۆمەلایەتی ناپێوێ، هەر کەسێك دەمرێ لەبەرامبەردا دەیان و سەدانی تر دەناڵێنن و لە مردنەوە نزیکن، پێویستە نرخی ڕاستەقینەی خەرجی کۆمەلایەتی و کەمی خۆراك بۆ ئەو کەسانە و ملیۆنان منالی شیرەخۆرە و ئەو منالانەی کە بە قۆناغی دوورودرێژی نیمچە برسیەتیدا دەژین لەبەرچاو بگیردرێت، هەموو کات ئەوانەی بەدەست مێشك دواکەوتوویوە نالاندوویانە، هیچ کەسێك نییە خوازیاری بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردن بێت زیاتر لەوەی ئێستا هەیە، بەڵام ئاشکرایە

هەسارەکەی ئێمە لە ژێر فشاری گەشەی دانیشتوان پەکی کەوتووە، زۆربەی ئەو فشارەش لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانە، بۆیە پێویستە لە پێناو دانانی سنوورێك بۆ گەشەی دانیشتوان هاوسەنگییەك لە نێوان رێژەی مردن و رێژەی لەدایکبوون هەبێت، ئێمە نزمبوونەوەی رێژەی لەدایکبوونمان پێ باشترە و خوازیاری بەرزبوونەوەی رێژەی مردن نین بۆ گەیشتن بەو ئامانجە.



# بەشی شەشەم

# پیتداری : Fertility

## دەستپێك

زاڵبوون بەسەر منداڵخستنەوە یەكێكە لەو گۆڕانكارییە گرنگ و شۆڕشیانەی كە هاتە ئارا و بووبە هۆی ئەوەی ژنان و پیاوان پێكەوە لە دایكایەتی و باوكایەتی نەویستراو رزگاریان بێت، یارمەتیدەرێكیش بوو بۆ خستنەوەی وەچەی خوازراو. كۆنترۆڵكردنی پیتداری مانای دیاریكردنی پیتداری نییە، لەگەڵ كەمبوونەوەی مردن و مانەوەی منداڵان و كەس و كارییان مەسەلەیەكی دڵنیاییكەرەوەیە كاتێك خەڵكی خێزانێكی بچووكیان دەوێت، هەرچەند ئەڵتەرناتیڤ بۆ هێنانەوەی ئەو ئامانجە برەخسێ، ئەگەری سەركەوتن زۆر دەبێت.

كۆنترۆڵكردنی پیتداری زیاتر لەوەی كە تەنها مانای بەكارهێنانی (حەب) یا بەكارهێنانی كۆندۆم (الواقي الذكري) بێ. وەكو لە هەموو كایەكانی ژیان مەسەلەكان ئاڵۆزتر بوونە، چۆن پیتداری بناسین؟ ئەو رێگایانە چین كە بكرێ لە میانیەوە كۆنترۆڵی پیتداری بكرێ؟ ئەگەر ناسیمان چۆن كۆنترۆڵی بكەین، ئەی بۆ لەناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكی دیكە جیاوازە؟ لەم بەشەدا هەوڵدەدەین مامەڵە لەگەڵ ئەو پرسیارانە بكەین لە رێگای شیكردنەوەی بیرۆكەی پیتداری.

## پیتداری چییە؟

بریتییە لە ژمارەی ئەو منداڵانەی كە ژنێك دەیانخاتەوە، لەگەڵ ئەوەی گرنگیپێدانی سەرەكیمان كاریگەری منداڵخستنەوەیە لەسەر كۆمەڵگا، بۆیە دەبێ دان بەوەدا بنێین رێژەی لەدایكبوون و كەڵەكەبوونی ملیاران بریاری تاكەكەسین سەبارەت بە منداڵخستنەوە یا منداڵ نەخستنەوە، بەم شێوەیە كاتێك قسە سەبارەت بە كۆمەڵگایەكی بەرزە پیتاندن دەكەین، مەبەستمان لەوەیە دانیشتوانێك زۆرینەی ژنەكانی ژمارەیەكی زۆری منداڵیان ببێ. لەكاتێكدا كۆمەڵگا پیتاندنە نزمەكان، ئەو كۆمەڵگایانەن كە زۆربەی ژنەكانیان ژمارەیەكی كەمی منداڵیان دەبێ، هەر بەو

شێوەیە زۆربەی ژنان لەکۆمەڵگا بەرزە پیتاندنەکان ژمارەیەکی زۆر منداڵیان دەبێ، بە پێچەوانەشەوە راستە.

پیتاندن لە دوو توخم پێکدێ، یەکێکیان بایۆلۆژییە و ئەوی تر کۆمەڵایەتییە، مەبەست لە توخمی بایۆلۆژی توانای منداڵخستنەوەیە، ئەوەش شتێکی گرنگە بۆ دایکەکان، بەڵام بە تەنیا بەس نییە هەروەها ژمارەیان چەندە، بەڵام ئەوە مەسەلەیەکە پەیوەندی بەو بونیادە کۆمەڵایەتییەوە هەیە کە تیایدا دەژین.

## توخمی بایۆلۆژی

لەلای زانایانی دانیشتواناسی پێی دەوترێ توانای بایۆلۆژی منداڵخستنەوە (fecundity)، ئەو کەسەی توانای منداڵخستنەوەی هەیە ئەو کەسەیە کە دەتوانێ منداڵی ببێ، ئەو کەسەی توانای منداڵخستنەوەی نییە (نەزۆك) ناتوانێ منداڵی ببێ. چەمکی پیتداندن (fertility) کاری منداڵخستنەوە یا پرۆسەی منداڵخستنەوەی پراکتیکی لە دایکبوون منداڵی زیندووە نەك تەنها توانای منداڵخستنەوە. هەرچەندە خەڵکی ناتوانن لە تاقیگە ئاستی توانای خۆیان لە منداڵخستنەوە هەڵبژێرن، بەڵام زۆرینەی خەملاندنەکان پشت بە ئاستی پیتداری دەبەستن، ئەو هاوسەرانەی هەوڵی منداڵخستنەوە دەدەن و لەماوەی (١٢) مانگدا سەرکەوتوو نابن لەلای پزیشکانەوە پێیان دەوترێ (ناپیتدارەکان)، رووپێوی نیشتیمانی لە ساڵی (١٩٨٨) بۆ گەشەکردنی خێزان دەریخستووە (٨٪) هاوسەرە ئەمریکاییەکان (تەمەنی ژنەکان لە ١٥ -٤٤) بە گوێرەی بنەماکەی پێشوو ناپیتدارن، ئەمە لەکاتێکدا لە ساڵی (١٩٤٥) (١١٪) بووە.

پیتاندنی سروشتی بریتییە لە ئاستی منداڵخستنەوە دوور لە بەکارهێنانی رێگرەکانی سکپڕی، ژیانی هاوسەرداری منداڵخستنەوە لە نێوان (١٥-٤٩ ساڵ) هەموو سکپڕییەك نزیکەی (٩) مانگ دەخایەنێ، ماوەی نێوان کۆتایی هەموو سکپڕییەك و سەرەتای سکپڕییەکی تر نزیکەی (١٨) مانگە، کاتێك ئەو ژنە هەر دوو ساڵ جارێك منداڵێکی دەبێ لە ژیانیدا (١٦) منداڵی دەبێ (بڕوانە بونگارس — ١٩٧٨).



دەکرێ بڵێین ئەمە نزمترین ئاستی منداڵخستنەوەیە لەسەر ئاستی کۆمەڵە خەڵکێك، بەڵام لەسەر ئاستی تاکەکەس دەبینین، زۆربەی کچە تەمەن منداڵەکان زووتر سکپڕ دەبن، (لە ساڵی (١٩٨٨) لە ویلایەتە یەکگرتووەکان (١٠٥٨٨) منداڵ لەدایکبوون کە دایکەکانیان تەمەنیان لە ژێر پانزە ساڵییەوە بوو)، لەکاتێکدا پیرترین دایکی ئەمریکی ناوی (ruth kistler) لە ساڵی (١٩٥٦) لە تەمەنی (٥٧) ساڵی و (١٢٩) رۆژیدا منداڵی بوو، (mcfarlan, et, al, 1991). دایکە تەمەن گەورەکان بە دەگمەن هەن، منداڵخەرەوەترین دایکی جیهان ژنێکی رووسی بوو لە سەدەی هەژدە کە (٢٧) سك (٦٩) منداڵی بوو (mcfarlan,et,al,1991).

با مەسەلە ریزپەڕەکان لەلایەك دابنێین، ئەگەر وا گریمان ناوەندی منداڵخستنەوەی کۆمەڵگایەك (١٦) منداڵ بێت لە ژنێکدا ئەمە شتێکی ئاساییە، دەکەوێتە بەرامبەر پرسیارێکی سەراسیمە: بۆچی هیچ کۆمەڵگایەك لەجیهان نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی منداڵخستنەوە؟ پرسیارەکەش لە توخمی کۆمەڵایەتی لە رەفتاری پیتداریدا دەردەکەوێ.

## توخمی کۆمەڵایەتی

هەل و پاڵنەرەکانی منداڵخستنەوە لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەکی تری کۆمەڵایەتی دەگۆڕێ، ئەنجامەکەشی جیاوازییەکی گەورەیە لە ناوەندی ژمارەی ئەو منالانەی کە یەك ژن دەیانخاتەوە ناودارترین کۆمەڵگای بەرزە پیتداری کۆمەڵەی هیتراتییە (hutterites)ە، ئەمانە کۆمەڵەیەکی ئایینین، کە رێگا بە رێگری منداڵخستنەوە نادەن و لە ویلایەتەکانی داکۆتای باکوور و داکۆتای باشوو و کەنەدا دەژین. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە نزیکەی (٤٠٠) کەس لەو کۆمەڵەیە لە روسیاوە بەرەو ویلایەتە یەکگرتووەکان کۆچیان کرد، ئەوان لە ئەوروپای رۆژهەڵاتەوە هەڵاتبوون، لە ماوەی (١٠٠) ساڵدا ئەو کۆمەڵەیە توانیان ژمارەی خۆیان (٦) بارە بکەنەوە و ژمارەیان گەیشتە (٣٠٠٠٠) کەس، پێشبینی دەکرێ ژنێکی هیتراتی لە سییەکانی تەمەنیدا بەگشتی (١٢) منداڵی ببێ.

نهێنی پیتداری هیترایت، تا کاتێکی درەنگیش ئەوەبوو لەکاتێکی زوو هاوسەرگیری ئەنجامدەدەن، سیستەمی خۆراکی باش، چاودێری تەندروستی باش، پەیڕەوکردنی ئامۆژگارییەکانی تەورات (بەرهەمهێن بن و تەشەنە بکەن) ئەمانە هەمووی هاندەربوون بۆ پیتداری هیتراتەکان.

سەرباری ئەوانەش بەبێ بەکارهێنانی ڕێگرییەکانی سکپڕی یا لەبارخستن پراکتیزەی سکێس دەکەن، چونکە پێیان وایە ڕێگری سکپڕی تاوانە. لەم ساڵانەی دوایی گەشەی دانیشتوانی هیترایت بەرەو کەمبوونەوە چوو، هەموو کێڵگە کشتوکاڵییەکانی هیترایت تا نزیکەی (١٣٠) کەس گەشە دەکەن، دوای ئەوە کێڵگەکە دابەش دەبێ و کۆمەڵەی نوێ دروستدەبێ. جیابوونەوە و دروستبوونی کۆمەڵەی نوێ پێویستی بە زەوی زیاتر هەیە بۆ دروستکردنی کێڵگەی تازە، دەست بەسەرداکردنی زەوییە چۆڵەکان لەلایەن ئەو کەسانەوە گرفت و دەردەسەری زۆری ناوەتەوە، بەتایبەت لە کەنەدا، بۆیە زۆربەی هیترایتەکان لە کڕینی زەوی کۆت و بەندکراوە، هاوکات گۆڕانکارییە تەکنەلۆژییەکان لە ئامرازەکانی کشتوکاڵ شێوازی کار لە کێڵگەکان گۆڕیوە (هەرچەندە هیترایتەکان دەیانەوێ لەگەڵ پێشکەوتنەکان بڕۆن بەڕێوە).

ئەو دینامیکییە کۆمەڵایەتیانە کاریگەرییان هەیە بەسەر بەرزکردنەوەی تەمەن لە هاوسەرگیری ژنان بە نزیکەی (٤) یا (٥) ساڵ. وێڕای ئەوەش ئیمکانیەتی بەدەستهێنانی خزمەتگوزاری تەندروستی هاوچەرخ پاڵی بە زۆر لەژنانەوە ناوە بەر لە کۆتاییهاتنی ماوەی منداڵخستنەوە قایلبن بە (التعقیم) (خەساندن) (هۆکاری پزیشکییەکان) (petter -١٩٠٧) و پیتەر (١٩٧٨) پێی وایە ئاستەکانی پیتداری لەنێوان هیترایتەکان لە ساڵی (١٩٨٠) نیوەی ساڵانی (١٩٣٠) بووە.

ئاشکرایە ئاستی پیتاندن لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی وەك ئەمریکا و ژاپۆن و وڵاتانی تر زۆر کەمترە وەك لە نێو هیترایتەکان، ژنانی وڵاتە پێشکەوتووەکان کەمترین ئاستی منداڵبوونیان دەبێ. لێرەدا پرسیارێك خۆی قیت دەکاتەوە ئەویش



ئەوەیە ئەو جیاوازاییانە بۆ؟ کاتێك وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەینە دوو شت هەیە دەبێ لەبەرچاو بگرین، یەکەم: چۆن دەکرێ ئەو جیاوازییە وەدی بێت؟ ئەو ئامرازانە چین کە بۆ سنووردانانی منداڵخستنەوە یا هاندانی منداڵخستنەوە بەکاردێن؟. دووەم: ئەو پاڵنەرانە چین کەوا لەخەڵك دەکەن ڕێگرببن یان ڕێگری نەکەن لە کۆنترۆڵکردنی خستنەوەی وەچە؟.

ئامرازەکانی ڕێکخستنی خێزان (چۆن) لە ڕاستیدا پەیوەندی نێوان پاڵنەرەکان (بۆچی) و ڕەفتارەکانی پیتاندنی واقیعی، با وا دابنێین تۆ بڕیارت داوە خێزانەکەت بە بچووکی بهێڵیتەوە، ئەو ئامرازە ڕەخساوانە چین کە یارمەتیت دەدەن لە هێنانەدی ئەم شتە؟

**چۆن دەکرێ بەسەر پیتاندندا زاڵبین..؟**

ئامرازەکانی ڕێکخستنی پیتداری لە لێکۆڵینەوە دانیشتوانییەکاندا پێی دەوترێ (فاکتەرە ناوەندەکان) (davis and black,1956)، فاکتەرە ناوەندەکان ئەو گۆڕاوانەن کە لەمیانییەوە فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان کار دەکەنە سەر ئاستی پیتداری، داڤین و بلاك ئاماژە بەسێ قۆناغی پیتداری دەدەن: جووتبوونی سێکسی، بیرۆکەی دووگیانی و سکپڕی، (خشتەی ١-٦)، جوتبوونی سێکسی بۆ سکپڕبوون کارێکی پێویستە، سەرکەوتنی سکپڕییە کە لەوەدایە ئەگەر بمانەوێ منداڵەکە بەزیندوویی لەدایك ببێ، هەروەها دەکرێ ئەو پرۆسەیە لە هەر خاڵێکدا بێ کۆتایی پێ بێ، بەڵام با لەسەرەتاوە دەستپێبکەین و تەماشای ئەو فاکتەرانە بکەین کە کار دەکەنە سەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئافرەت بۆ کاری سێکسی.

### خشتەی (٦-١) ئەو فاکتەرە ناوەندانەی کە لەمیانەوە فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان کار دەکەنە سەر پیتداری

| |
|---|
| ١- ئەو فاکتەرانـەی کـار دەکەنـە سـەر رووبەرووبوونـەوەی پرۆسـە سێکسـییەکان و گۆڕاوەکـانی جوتبوونی سێکسی |
| ٢- ئەو فاکتەرانەی بەرپرسن لە پێکهێنان و (فسخ)ی جوتبوونەکانی ناو ماوەی منداڵخستنەوە |
| أ- ئەو تەمەنەی کە لێوە جوتبوونە سێکسییەکان دەستپێدەکات (شەرعی و نا شەرعی) |
| ب- قەیرەیی بەردەوام: ئەو ژنانەی هەرگیز ناچنە ناو پرۆسەی جوتبوونی سێکسی |
| ت- درێژی ماوەی منداڵخستنەوەکە دوای جوتبوونەکان یا لەنێویدا تێدەپەڕێ. |
| A- کاتێك جوتبوونەکان بە تەڵاق یا جیابوونەوە یا کۆچکردن کۆتایی دێ |
| B-کاتێك پێکەوە ژیانەکان بە مردنی پیاوەکە کۆتایی دێ |
| C-ئەو فاکتەرانەی بەرپرسن لە رووبەڕوو بوونەوەی سێکسی جوتبوونی سێکسی. |
| پ- خۆ قەدەغەکردنی خۆویستانە. |
| ج- خۆ قەدەغەکردنی زۆرەملێ (نەزۆکی، نەخۆشی، جیابوونەوەی کاتی، ناچارکردن). |
| ح- ژمارەی جارەکانی جووتبوونی سێکسی (جگە لەماوەی خۆدوورگرتن). |
| ٣- ئەو فاکتەرانەی کاردەکەنە سەر رووبەڕوو بوونەوەی سکپڕی (گۆڕاوەکانی سکپڕی) |
| خ- توانایی و بێ توانایی فسیۆلۆژی، کە کاریگەرە بە هۆکارە ناخۆویستەکان. |
| د- بەکارهێنان یا بەکارنەهێنانی رێگرییەکانی سکپڕی. |
| أ- ئامرازە میکانیکی و کیمیاوییەکان |
| ب- ئامرازەکانی دیکە. |
| ژ- توانست یا بێ توانایی فسیۆلۆژی، هەروەك کاریگەربوون بە هۆکـارە خۆویـستەکان (خۆنـەزۆك کردن، چارەسەری پزیشکی، شتی تر. |
| ٤- ئەو فاکتەرانەی کار دەکەنە سەر سکپڕی و منداڵخستنەوەی سەرکەوتوو. |
| ر- مردنی کۆرپەلە بە هۆکارێکی ناخۆویستانە. |
| ز- مردنی کۆرپەلە بە هۆکارە خۆویستەکان. |



کاتێك سکپڕی دەخەینە بەر باس دەبینین جەخت لەسەر رەفتاری ژنان دەکرێت زیاتر لە رەفتاری پیاوان، بەکورتی ئەگەر ژن جووتبوون ئەنجامنەدات منداڵی نابێت، لەکاتێکدا پیاو ئەگەر جووتبوونی سێکسی ئەنجامیش بدات هەر منداڵی نابێ، خۆلادان لە سکپڕی لە رێگای خۆ نەزۆککردن یا لە رێگای بەکارهێنانی حەبی دژە سکپڕی لەلایەن هەردوو لاوە ئەنجامدەدرێ، ژن یا پیاو، بەلاّم ئەگەر سکپڕی رووبدا ئەوە ژنەکە ئەرکی سکپڕی و لەباربردن لە ئەستۆ دەگرێ.

## جۆرەکان و ئاراستەکان

هۆکار و ئەنجامی جۆرەکانی پیتداری ئەمڕۆ گرنگی زۆری پێدەدرێ، جاران رێژەی منداڵخستنەوەی بەرز تایبەتمەندی هەموو کۆمەڵگاکان بوو، هەروەها کاردانەوە بۆ رێژەی بەرزەکانی مردن و باوبوو لەو کۆمەڵگایانە، بەلاّم ئەمڕۆ لە زۆربەی هەرێمەکانی جیهان رێژەی مردن دابەزیوە یا بەرەو دابەزین دەچێت، هاوکات دەبینین جۆرەکانی پیتداری لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر تەواو جیاوازە.

## پێوەرەکانی پیتداری

١- **رێژەی لەدایکبوونی گشتی:** بریتییە لە ژمارەی لەدایکبوونی هەر هەزار کەسێك لە دانیشتوان لە ساڵێکدا.

رێژەی لەدایکبوونی گشتی = ژمارەی لەدایکبووان لەشوێنێکی دیاریکراو

———————————————— ×١٠٠٠

ژمارەی دانیشتوان (ناوەڕاستی ساڵ).

٢- **رێژەی منالاّن – ژنان:**

چەمکی منالاّن- ژنان پێوەرێکی ناراستەوخۆیە لە پێوەرەکانی پیتداری و بۆخەملاندنی پیتداری بەکار دێ بەتایبەت لەو هەلومەرجانەی کە تیایدا تۆمارەکانی

لەدایکبوون ناتەواوە یا هەر بوونیان نییە، ئەم شتەش لە زۆربەی وڵاتانی تازە پێگەیشتوو بەرچاو دەکەوێ، بۆیە بەناراستەوخۆ دادەنرێ چونکە لەدایکبوون لە پێوەردا بەکار نایەت، بەم شێوەیە هەژمار دەکرێ:

رێژەی منالان — ژنان = ژمارەی منالانی ژێر پێنج سالی

____________________ × ١٠٠٠

کۆی ژنان لە تەمەنی نێوان (١٥-٤٥) ساڵ.

ئەم دەستەی ژنانە دەستەیەکی بەرهەمهێنن و برێ کاتێك دەستەکە تا (٤٩) ساڵ درێژ دەبێتەوە.

ئەو رێژەیە ئاماژەیە بە ژمارەی منالانی ژێر تەمەنی پێنج سالی بۆ هەر هەزار ژنێك لە تەمەنی منالبوندا، یەکێك لە خراپییەکانی بەکارهێنانی ئەو رێژەیە وەکو پێوەرێك بۆ پیتداری ئەوە لە ژمارەی منالانی زیندوو کاریگەر دەبن بە رێژەی مردن، دەکرێ بلێین بەدەگمەن ئەم رێژەیە وەکو پێوەرێك بۆ پیتاندن لەم سەردەمەدا بەکار دێ.

### ٣- رێژەی پیتداری گشتی:

ئەم رێژەیە وەکو پێوەرێك بۆ پیتداری لە هەردوو رێژەی لەدایکبوونی گشتی و رێژەی منالان — ژنان باشترە، رێژەی پیتداری گشتی بریتییە لە ژمارەی لەدایکبوون بۆ کۆی ژنان لەتەمەنی منالبوندا (١٥-٤٥) دەکرێ بەم شێوەیە هەژمار بکرێ:

رێژەی پیتداری گشتی = ژمارەی لەدایکبوون لە سالێکی دیاریکراو

____________________ ×١٠٠٠

ژمارەی ژنان لە دەستەی تەمەن (١٥-٤٥) ناوەڕاستی ساڵ.

ئەم رێژە بە ژمارەی لەدایکبوونی زیندوو بۆ هەر (١٠٠٠) هەزار ژنێك لەتەمەنی منالبوندا دەدات بەدەستەوە.



### ٤- رێژەی لەدایکبوونی تایبەت بە تەمەن:

ئەم رێژەیە زۆر بەکەڵکە چونکە منالخستنەوەی ژن تارادەیەکی زۆر بەگوێرەی تەمەن جیاواز دەبێ، هەروەها ئەو رێژەیە هاوشێوەی رێژەی پیتداری گشتییە، بەلام لەبری بەکارهێنانی کۆی ژمارەی ژنان لە تەمەنی منالبووندا کۆی ژنانی لەدەستەیەکی تەمەنی دیاریکراو بەکاردەهێنرێ کە سالێك یا پێنج سالە، بەلام (البسط) (ژێرە) کۆی منالانی لەدایکبووەکان لە سالێکی دیاریکراو بۆ ژمارەی ئەو ژنانەی لە دەستەیەکی تەمەنی دیاریکراو، بەلام هەمیشە دەستەی تەمەنی پێنج سالە بەکاردەهێنرێ، و بەم شێوەیە هەژمار دەکرێ:

رێژەی پیتداری تەمەنی (تایبەت بە تەمەن) = ژمارەی لەدایکبووان لە دەستەیەکی تەمەنی دیاریکراو

____________________ ×١٠٠٠

ژمارەی ژنان لە دەستەیەکی تەمەنی خۆی

هەمیشە دەستە تەمەنییەکان دابەشی سەر (٦) یا (٧) دەستە دەکرێ، بەم جۆرە: (١٥-١٩، ٢٠-٢٤، ٢٥-٢٩، ٣٠-٣٤، ٣٥-٣٩، ٤٠-٤٤، ٤٥-٤٩).

### رێژەی پیتداری گشتی:

ئەم رێژەیە بەکەڵکترین رێژەیە، چونکە رێژەکانی پیتداری تەمەنی دانیشتوان پوختدەکاتەوە، رێژەی پیتداری گشتی بریتییە لە ناوەندی ژمارەی ئەو منالانەی کە دەشێ ئافرەتێك بیانخاتەوە، ئەگەر بەگوێرەی رێژەی پیتداری تەمەنی باو لەسەرجەم دەستە تەمەنییەکانی لەمیانی ماوەی ژیانی منالخستنەوەیدا بیانخاتەوە.

دەکرێ بەم شێوەیە هەژمار بکرێ:

رێژەی پیتداری گشتی = ژمارەی لەدایکبووانی مێینە لە دەستەی تەمەنی لە ماوەی یەك سالدا

____________________

ژمارەی مێینەکان لەناوەڕاستی ساڵ لەدەستەی خودی تەمەنەکە.

دەستەی تەمەنی وەکو لە سەرەوە باسمانکرد، ژمارە پێنج بەکار دەهێنین بەر لە ئاماژەی کۆکردنەوە، چونکە ئێمە دەستەی تەمەنی پێنج ساڵەمان هەڵبژاردووە، ئەگەر دەستەی تەمەنی یەك ساڵەمان بەکار هێنا ژمارە (٥) پێنج بزر دەبێ.

تێکڕای پیتداری گشتی جیهان بە نزیکەی (٢,٦) دەخەملێنرێت، لەوڵاتانی پێشکەوتوو تێکراکە لە دوو مناڵ کەمترە، هەندێجار لە تێکڕای (٢,١) کەمتر و دەگاتە (١,٢)، ئەمە لەکاتێکدا تێکڕاکە زیاتر لە (٧,٥) مناڵە لە هەر یەك لە وڵاتەکانی نایجیر و یەمەن و غەززە و ئوردون، کە لە ساڵی (٢٠٠١) گەیشتبووە (٣,٥) مناڵ، ئەو وڵاتانەی کە تێکڕای پیتدارییان لە (٢,١) مناڵ کەمترە، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دووچاری گەشەی نێگەتیڤی ژمارەی دانیشتوان دەبنەوە..

### فاکتەرە سەرەکییە دیاریکەرەکانی پیتدار

پرۆسەی مناڵخستنەوەی دانیشتوان بەرهەمێکی ئاڵۆزی فاکتەرە بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانە کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە بەشێوەی جیاواز کار دەکەن. بۆ راڤەکردنی جیاوازی شوێنی و کاتی پیتداری باشتر وایە لە دەستنیشانکەرەکان (محددات)ی پیتداری بکۆڵینەوە..

#### أ- فاکتەرە بایۆلۆژییە دەستنیشانکەرەکانی پیتداری:

وەکو پێشتر وتمان باشتر وایە جیاوازی لە نێوان پیتداری کە توانای بایۆلۆژی مناڵخستنەوەیە و پیتداری مناڵخستنەوە فیعلییە بکەین، دەشێ توانای بایۆلۆژی مناڵخستنەوە بە چەند فاکتەرێکی سروشتی (جەستەیی) کاریگەر بێ هەڵبەت تەمەن و تەندروستی و هەلومەرجی خۆراکی و تەنانەت ژینگەیی سروشتیش کاریگەری خۆیان هەیە.



#### تەمەن و توانای بایۆلۆژی مناڵخستنەوە : fecundity

لەزۆربەی کۆمەڵگاکان گەنجان زیاتر مناڵ دەخەنەوە، بۆ هەژمارکردنی رێژەی پیتداری، گریمان ماوەی مناڵخستنەوە لەلای ژنان لە نێوان (١٥-٤٩) ساڵیدا بێت، دەرکەوتنی خوێنی مانگانە لای مێینە واتە پێگەیشتن (بلوغ)، گۆڕان لە بێ توانایی مناڵخستنەوە بۆ توانینی مناڵخستنەوە کتوپڕ روونادات، بەڵکو ئەو پرۆسەیە پرۆسەیەکی وردە وردەیە و لە تەمەنی (٢٦-٣٠) ساڵی روودەدات، کەلەو تەمەنەدا مێینە تەواو پێدەگات، ماوەی مناڵخستنەوە بەگەیشتنی ژن بە قۆناغی بێ ئومێدی کۆتایی دێ، هەمان شتیش سەبارەت بە پێگەیشتنی (بلوغ) نێرینە راستە، بەڵام کۆتایی بێ توانایی مناڵخستنەوە لای نێرینە دیاریکراو نییە.

#### تەندروستی و هەلومەرجی خۆراکی و توانای بایۆلۆژی مناڵخستنەوە:

تەندروستی مرۆڤ بۆ ماوەی جیاواز کار دەکاتە سەر توانای بایۆلۆژی، بە شێوەیەکی گشتی دەکرێ بوترێ تەندروستییەکی باشتر و توانای بایۆلۆژی مناڵخستنەوە شان بەشانی یەك دەڕۆن بەرێوە. زۆرێك لە نەخۆشییەکان توانای مناڵخستنەوە پەك دەخەن جا چ بۆ ماوەیەکی کاتی بێت یا بە شێوەیەکی بەردەوام و هەمیشەیی، دیارترین ئەو نەخۆشیانەش نەخۆشییەکانی ئەندامی زاوزێ کە ئەگەر چارەسەر نەکرێ دەبێتە هۆی نەزۆکییەکی هەمیشەیی، هەلومەرجی خۆراکی مرۆڤ، کار دەکاتە سەر توانای بایۆلۆژی و بەتایبەت بەدخۆراکی کە دەبێتە هۆی بێ توانایی کاتی، لەبەرامبەردا تەندروستی دایك کار دەکاتە سەر پرۆسەی مناڵخستنەوە و بەتایبەت ئەگەر دایکەکە گیرۆدەی بەدخۆراکی بێت.

#### ب- فاکتەرە کۆمەڵایەتییە دیاریکەرەکانی پیتداری:

پیتداری، تارادەیەك کاریگەرە بەجیاوازی کۆمەڵایەتی و بەجۆرەکانی هاوسەرگیریشەوە، بەکارهێنانی رێگرییەکانی سکپڕی و لەباربردن، هەر دوو

دیموگرافیست (کنگری دیڤیس و جودس بلاك) چوارچێوەیەکیان دیاریکردووە، ئەوان (فاکتەرە ناوەندییەکان) دیاریکردووە کە لەمیانییەوە فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان کار دەکەنە سەر پیتاندن، هەروەها سێ کۆمەڵەیان لە ژێر ئەم ناوونیشانە دیاریکردووە: (بڕوانە خشتەی ٦-١).

١- ئەو فاکتەرانەی کە کار دەکەنە سەر جوتبوونی سێکسی.
٢- ئەو فاکتەرانەی کە کار دەکەنە سەر سکپڕی و دووگیانی.
٣- ئەو فاکتەرانەی کە کار دەکەنە سەر سکپڕی و منالبوون.

جیاوازی پیتاندن لە نێوان نەتەوەکان دەکرێ بەهۆی جیاوازی کۆمەڵایەتییەوە لێکی بدەینەوە کە چۆن جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان کار دەکەنە سەر رەفتاری پیتداری لە رێگای فاکتەرە ناوەندییەکان.

چۆن (بۆنگاتز) چوار فاکتەری سەرەکی لە نزمبوونەوەی پیتداری دیاریکردووە کە ئەمانەن: بەکارهێنانی رێگرییەکانی سکپڕی، تەمەنی هاوسەرگیری، درێژی ماوەی منالبوون کە لەو ماوەیەدا ئافرەت ناتوانێ بەرگەی بگرێ (بەهۆی شیرپێدانی سروشتی یاخۆ قەدەغەکردن) و لەباربردن.

## هاوسەرگیری وپیتداری

ئەمڕۆ لە زۆربەی کۆمەڵگاکان هاوسەرگیری بە یەکێتییەکی کۆمەڵایەتی دانپییانراو دادەنرێ کە بە هۆیەوە منالدەخرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەرگیری داخوازییەکی پێشینەیی منالخستنەوە نییە، بۆیە پێویستە منالخستنەوەی ناشەرعی و جیاوازی داب و نەریتە کلتووری (شارستانی)یەکان لە شوێنێکی و شوێنێکی تر لەبەرچاو بگرین، پێکهێنانی هەر یەکێتییەکی رگەزی چ کاتی بێ یا هەمیشەیی دەشێ ببێتە هۆی منالخستنەوە، وێرای ئەوەی زانیارییەکان لەم بوارەدا زۆر دژوارە.



لەو کۆمەڵگایانەی کە رێگری لە سکپڕی ناکەن، بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بەو تەمەنەی کە کچ تیایدا مومارەسەی سێکسی دەکات، تەمەن دەبێتە فاکتەرێکی گرنگی پیتداری، ئەگەر وای دابنێین ماوەی پیتاندن لای ئافرەت لە نێوان (١٥-٤٩) ساڵیدا بێت ئەوە شتێکی مەنتیقییە هەرچەندە هاوسەرگیری دوابخرێت، ماوەی پیتداری کەمتر دەبێتەوە. تەمەنی هاوسەرگیری لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی تر و لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە، بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ بڵێین هاوسەرگیری لە نێو میللەتانی ولاتانی دواکەوتوو لەکاتێکی زوودا دەست پێدەکا و لەلای میللەتانی پێشکەوتوو درەنگ دەستپێدەکات.

ئەو هەنگاوانەی کە (چین) بۆ کەمکردنەوەی پیتداری گرتییە بەر بریتییە لە دیاریکردنی تەمەنی هاوسەرگیری مێینە بە (٢٥) ساڵ و نێرینە (٢٨ ساڵ. تەمەنی هاوسەرگیری لە ویلایەتە یەکگرتووەکان (٢٤) ساڵ بۆ کچان و (٢٥) ساڵ بۆ کوران. تەمەنی هاوسەرگیری لە ئوردون دەگاتە (٢٦) ساڵ بۆ کچ و (٢٨) ساڵ بۆ کوڕان.

فاکتەرێکی تر کە کاریگەری هەیە لەسەر پیتداری، رێژەی ئەو دانیشتوانەیە کە هاوسەرگیری ئەنجامدەدەن یان ئەنجامنادەن. هەروەها رێژەی ماوەی نێوان هاوسەرگیری و هاوسەرگیرییەکی تر دوای تەلاقدان یا جیابوونەوە یا مردنی یەکێکیان.

کەوایە دەکرێ بڵێین پیتداری کاریگەرە بە رەفتارە سێکسی تاکەکەسەکان و بەکارهێنانی رێگرییەکانی سکپڕی.

## رێگرییەکانی سکپڕی و پیتداری

یەك لەو فاکتەرانەی کە بەرادەیەکی بەرچاو کار دەکاتە سەر پیتداری مەودای بەکارهێنانی رێگرییەکانی سکپڕییە، رێژەی بەکارهێنانی کەرەستەکانی رێگری سکپڕی لەلای میللەتانی پێشکەوتوو لەبەرزبوونەوەدایە، لەلای گەلانی دواکەوتوو نزمە، بەلاَم بەرنامەی رێکخستنی خێزان لە ولاتانی تازە پێگەیشتوو کار لەسەر زۆربوونی بەکارهێنانی رێگرییەکانی سپکڕی دەکات، نزیکەی سێ یەکی

هاوسەرەکانی جیهان ڕێگرییەکانی سکپڕی بەکار دەهێنن، چاوەڕوانیش دەکرێ ئەو ڕێژەیە لە بەرزبوونەوەی بەردەوامدا بێت.

**دەکرێ ڕێگرییەکانی سکپڕی دابەشی سێ کۆمەڵ بکەین:**

**١- ئەو فاکتەرانەی کە ڕێگای چونە ژوورەوەی (سپێرم) تۆو نادەن.**

**٢-ئەو فاکتەرانەی کە ناهێڵن هێلکۆکە بکەوێ.**

**٣- ئەو فاکتەرانەی کە ڕوودانی پیتاندن پەك دەخا.**

فاکتەرەکانی ڕێگری سکپڕی یەکەم بریتین لە دوورەپەرێزی و کۆندۆم و (دوش) و (الحجاب الحاجز) و کەرەستە لەناوبەرەکانی سپێرم و خەساندن، کۆمەڵەی دووەم بریتین لە بەکارهێنانی ڕێگرییەکانی سکپڕی لە ڕێگای دەم، بەڵام کۆمەڵەی سێیەم (اللولب) دەگرێتەوە. ئەمە و لەباربردن دەچێتە دەستەیەکی تایبەتەوە، چونکە دوای سکپڕی ڕوودەدات.

پیشەسازی ڕێگرییەکانی سکپڕی بەرادەیەکی بەرچاو زیادیکردووە و تا ئێستاش لێکۆڵینەوەی بەردەوام هەیە بۆ پەرەپێدان و داهێنانی جۆری تازە، دەشێ خۆراکی تایبەت بە کوڕان و خۆراکی تایبەت بە ژنان بێتە ئارا، بەڵام ئەمەیان کاتی دەوێ.

گرنگترین پێشکەوتنە تازەکان بریتییە لە (morplant) ئەو کەرەستەیە کە لە ژێر پێست دەچێنرێ و چەندیەتییەکەی زۆر کەمی (پرۆجتین) دەردەدات بۆ ڕێگرتن لە کەوتنە خوارەوەی هێلکۆکە بۆماوەی پێنج ساڵ بەردەوام دەبێت.

## لەباربردن و پیتداری

هەندێ جار لەباربردن بەڕێگەیەکی ڕێگری سکپڕی دادەنرێ، بەڵام لەڕاستیدا ئەم پرۆسەیە دوای ڕوودانی سکپڕی پراکتیزە دەکرێ، کە فاکتەرێکی گرنگە لە دیاریکردنی پیتداری لە زۆربەی وڵاتانی جیهان وەك ژاپۆن و ئەمریکای لاتین، ژمارەی حاڵەتەکانی لەباربردن لە جیهان نزیکەی (٣٠ بۆ ٥٥) ملیۆن حاڵەتە. ئەمە و جێی خۆیەتی ئاماژە بە زانیارییەکانی پەیوەست بە لەباربردن بدەین کە زۆرجار ورد نییە،



زۆرێك لە وڵاتان یاسای تایبەت بە لەباربردن داڕشتووە کە هەندێك لەو یاسایانە بێ مەرجن هەندێکی تریان مەرجدارن وەك قایلبوونی هەردوو هاوسەرەکە و پزیشکەکە، هەروەها هەندێ وڵات هەیە بەهیچ جۆرێك ڕێگا بە لەباربردن نادات، بۆیە هەندێ هاوسەری والێکردووە پەنا ببەنە بەر بازاڕی ڕەش یا کۆچکردن بۆ ئەو وڵاتانەی کە ڕێگا لەباربردن دەدەن.

## فاکتەرە ئابورییە دیاریکەرەکانی سکپڕی

دەڵێن نزمبوونەوەی پیتاندن لە وڵاتە پێشکەوتووەکان زادەی ئەو پێشکەوتنە ئابورییەیە کە کاری کردۆتە سەر ڕوودانی گەورە لە بزاوتی کۆمەڵایەتی و دابەشبوونی دانیشتوان. پرۆسەی نوێ بوونەوە پاڵنەر و بزوێنەری پشت نموونەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافییە.

هەندێ هەوڵیانداوە پەرە بە تیۆرەی ئابووری پیتداری بدەن کە بریتییە لە بڕیاردانی هەردوو هاوسەر لەسەر مناڵ نەبوون یا مناڵخستنەوە، مناڵخستنەوە پەیوەستە بە خەرجی و کەڵکی مناڵ هەیە کە هەردوو هاوسەر پێشبینی دەکەن.

## بەهای مناڵ

هەندێ لێکۆڵەر بەهای مناڵیان بەم شێوەیە خستۆتەڕوو کە بریتییە لە خزمەتگوزاری و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی کەس و کار. گوزارشتی زۆر بۆ وەسفکردنی بەهای مناڵ بەکارهاتووە، وەك قایلبوون و کەڵك و پاداشت و تایبەتمەندی و سەرجەم بەها پۆزەتیڤەکان، هەروەها بەهای مناڵ واتە کۆمەڵێك شتی پۆزەتیڤ کە دایك و باوك لە پرۆسەی مناڵخستنەوە چاوەڕوانی دەکەن.

دەشێ مناڵ بەهای ئابووری و نا ئابووری هەبێ، بەها نائابوورییەکانی وەك بەهای دەروونی کە کەس و کاری مناڵ لە ڕێگای مناڵبوون و پەروەردەکردنی مناڵەوە بەدەستی دەهێنن.

**هەڵبەت منالْ دوو سوودی ئابووری هەیە:**

١- منالْ کاتێك گەورە دەبێت، دەبێتە دەستەبەرییەکی ئابووری بۆ دایك و باوك، وێرای بارودۆخە کتوپڕەکان.

٢- منــالاْن بەرهــەمهێنن بەتایبــەت لەناوچــە دێهاتییــەکان لــە ولاْتــانی تــازە پێگەیشتوو، ئەوەش پاڵنەرێکی سەرەکییە بۆ خستنەوەی زیاتر لــە منالێــك. لەگــەلْ پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان بەهای منالْ وەکــو سەرچــاوەیەکی رزق کــەمبۆوە، چــونکە یاسای پەیوەست بــە ناچــارکردنی خوێنــدن بــۆ چــەند ســالێك هاتــە ئــارا، هــەروەها دەرکەوتنی یاساکانی دەستەبەری کۆمەلاْیەتی و شتی تر.

## خەرجییەکانی منالْ

دەکرێ خەرجییەکانی منــالْ وەکــو بارگرانییــەك بەســەر خێزانــەوە دابنــێین، ئــەو خەرجیانــەش ئــابووری و نائــابوورین، خەرجییــە نائابوورییــەکان وەك ئــەو گرفتــە دەروونیانەی کە منالْ دەیخاتە ســەر دایــك و بــاوکی. هــەر دایــك و باوکێــك دەزانــن پەروەردەکردنی منالْ دەبێتە هۆی نیگــەرانی دایــك و بــاوك ســەبارەت بــە رەفتــار و تەندروستی منالْ. بەلاْم خەرجییە ئابوورییەکان وەك:

١- **خەرجییە راستەوخۆکان:** ئەو خەرجییــەی کــە دایــك و بــاوك راســتەوخۆ بــۆ پاڵپشتیکردنی منالەکەیان دەیــدەن، بەخــەرجی خــواردن و جــل و بــەرگ و خــانوو و پەروەردە و خەرجی تەندروستییەوە.

٢- **خەرجی هەل:** دایك و باوك ناچــارن لــە پێنــاو پــەروەردەکردنی منالــەکانیان قوربانی بدەن، ئەم خەرجیەش دەکرێ دابەشی سەر دوو بەش بکرێ:

أ- نزمترین ئاستی گوزەران بەهۆی بەرخۆری منالەوە

ب- منالْ کار دەکاتە سەر نزمبوونەوەی توانای دایك و باوك لە فەراهەمکردنی و وەبەرهێنان.



## قوربانیدانی دایك کە لەمووچەوە بەدەستی دەهێنیْ

خەرجی و سوودەکانی منالْ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە و لەکاتێکــەوە بــۆ کــاتێکی دیکــە دەگــۆڕێ. بــە شــێوەیەك دەکــرێ بڵــێین لــە کۆمــەڵگا ســەرەتایی و کــشتوکاڵییەکان خــەرجی منــالْ کــەم بــووە، بــەلاْم لــە ولاْتــە پێــشکەوتووەکان بــە پێچەوانەیە، لەگەلْ پەرەســەندن و بــەرەو پێشــچوون و زۆربــوونی رێــژەی شارنــشینی خەرجی منالْ زۆر بووە و سوودەکانیشی کەمبۆتەوە، دانیشتوانی ناوچە شارنشینەکان دووچاری خەرجییەکی زۆری مالْ و پەروەردە و خــەرجی پزیــشکی بوونەتــەوە، لەگــەلْ زۆربوونی رێژەی شارنشینی بەشداربوونی دایــك و بــاوك لــە بازاڕەکــانی کــار زۆربــوو ئەوەش لە ئەنجامی فەراهەمبوونی کار و بەم شێوەیە خەرجی منالْ زۆر بووە.

## جیاوازییەکانی پیتداری

پیتداری دانیشتوان لە چــەند فاکتــەرێکی تێکــچڕژاو سەرچــاوە دەگــرێ، دەکــرێ دەستەکانی دانیشتوانی ناو یەك کۆمەڵگا بە رێگای هەمەجۆر وەلاْم دەدرێتەوە، بــەم شێوەیە دەستە جیاوازەکانی دانیــشتوان ئاســتی پیتــداری جیــاواز دەردەکــەوێ، ئــەو جیاوازییە بەرچاوانەی جۆرەکانی پیتداری هەرێمی، دانیشتوانی لادێ و شار و داهات و پەروەردە و جیاوازی ئیتنی و تەمەن دەگرێتەوە.

## جیاوازییەکانی پیتداری بە گوێرەی لادێ – شار

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، کاتێك لەسەر ئاســتی جیهــان تەماشــای دەکــەین، پیتداری پەیوەندی بــە ئاســتی شارنــشینییەوە هەیــە، تەنانــەت جیــاوازی لــە نێــوان پیتداری شار و لادێی یەك ولاْتیش هەیە، پیتداری لە ناوچە شارنشینییەکان کەمــە و لەگەلْ زیادبوونی شارنشینی کەم دەبێ.

## جیاوازییەکانی پیتداری بەگوێرەی داهات

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا پیتداری پەیوەندی بە ئاستی گەشەکردنی ئابووری هەیە، هەروەك بەرێژەی داهاتی تاکەکەس لە بەرهەمی نیشتیمانی دەپێورێ، هەروەها بەگوێرەی داهات جیاوازی لەنێوان دەستە جیاوازەکانی دانیشتوان هەیە، سەرنج دەدرێ پیتداری لەنێو خەڵکانی داهات نزم و بەرز دەبێتەوە و لەگەڵ زۆربوونی رێژەی داهات نزم دەبێتەوە.

## جیاوازییەکانی پیتداری بە گوێرەی پەروەردە و فێرکردن

هەروەك رێژەی داهات، پەروەردە و فێرکردنیش پەیوەندییکی نێگەتیڤانەی لەگەڵ پیتداری هەیە، خوێندەواری هۆشیاری خەڵکی بە رێگرییە جیاوازییەکانی سکپڕی بەرز دەکاتەوە، پاشان کار دەکاتە سەر پیتداری، هەروەك کاریگەری شار و لادێ و داهات، سەرباری ئەوەش خوێندەواری وا لە هاوسەرەکان دەکات قەبارەی خێزان دیاری بکەن، ئەوەش بەهۆی هۆشیاربوونەوەیان و خەرجی و سوودەکانی مناڵ، هەرچەند خوێندەواری بەرز بێتەوە هۆشیاری خانمەکان سەبارەت بەو مەسەلانە زیاتر دەبێ و تەمەنی هاوسەرگیری لە لایان دوا دەکەوێ.

## جیاوازییەکانی پیتداری بە گوێرەی تەمەن

ژنان لە تەمەنی مناڵخستنەوە بەهەمان ئاست و تەمەن مناڵ ناخەنەوە. لە زۆربەی کۆمەڵگاکان پیتداری جەخت دەکاتە سەر دەست دیاریکراوەکانی تەمەن، جیاوازییەکانی پیتداری سوود و گرنگییەکی زۆری هەیە لە تەفسیرکردنی جیاوازی کاتی و بەگوێرەی تەمەن هاوشانی لەگەڵ جیاوازییەکان، وێڕای ئەوەش جیاوازییەکانی پیتداری تر هەیە جیا لەوانەی باسمانکردن وەك جیاوازی بەگوێرەی ئایین و پیشە و شتی تر.



## ئاراستە و جۆرەکانی پیتداری شوێنجێی

پیتداری بەگوێرەی کات و شوێن دەگۆڕێ، ئەو جیاوازییەش لە جیاوازییە هاوشێوەکانی دیاریکەری پیتداری و وەلاّمدانەوەی دیاریکەرە دیاریکراوەکانەوە سەرچاوە دەگرێ، شێوەی (١-٦) دابەشکردنی شوێنی رێژەکانی لەدایکبووانی گشتی لە جیهان دەردەخات.

رێژەکان جیاوازن لە (٥٢) لە ئۆگەنداوە بۆ (٩) لە یۆنان و ئیتالیا و ئیستۆنیا، بە شێوەیەکی گشتی جۆرەکانی پیتداری جیهانی رەنگدانەوەی جۆرەکانی گەشەکردنی ئابوورییە، رێژەی لەدایکبوونی گشتی لە ئەفریقیا دەگاتە (٤٠) و سەبارەت بە زۆربەی ولاّتانی دیکەی ئەفریقیا هەمان شتە، جگە لە ولاّتانی وەك تونس و باشووری ئەفریقیا (٢٦،٢٧ دوا بەدوای یەك).

بەلاّم لە ئاسیا کەنزیکەی (٦٠٪) دانیشتوانی جیهانی لێیە، دەبینین جۆرەکانی پیتداری بە شێوەیەکی زیاتر لە ئەفریقیا جیاواز دەبێ، رێژەی پیتداری یەك ساڵ لە ئاسیا (٢٣)، بەرزترین رێژەکانیش باشوور و رۆژئاوایی ئاسیایە.

رێژەی لەدایکبوونی گشتی لە رۆژهەلاّتی ئاسیادا دەگاتە (١٦) لێرەشدا رێژەکە جیاواز دەبێ لە (٢٤) لە مەنگۆلیا بۆ تەنها (١٠) لە ژاپۆن، لەو شتە بەرچاوانەی ئەو هەرێمە پڕ خەڵکە بریتییە لە رێژەی لەدایکبوونی گشتی لە چین کە (١٧) یە.

بێگومان پیتداری لە چین لە نەوەدەکانەوە بەرەو دابەزین دەچێ، ناوچە شارنشینییەکان نزمترین رێژەی پیتداری تۆمار دەکەن.

رێژەی لەدایکبوونی گشتی لە باشووری ئاسیا دەگاتەی (٣٣) لە هیند دەگاتە (٢٧) کە دووەم ولاّتە لە رووی ژمارەی دانیشتوانەوە، ئەوەش ئاماژەیە بە نزمبوونەوەی پیتداری لە هیند بە شێوەیەکی درامی لە پانزە ساڵی رابردوودا، بە بوونی رێژەیەکی گەشەکردنی سروشتی (١,٩٪) دانیشتوانی هیند بەردەوام دەبێ لە گەشەکردن، وێڕای سەرجەم ئەو هەولاّنەی کە دراون و دەدرێن بۆ زاڵبون بەسەر پیتداریدا.

لە ساڵی (١٩٩٨) رێژەی لەدایکبوون لە ئەمریکای لاتین گەیشتە (٢٥)، هەروەها دیسان جیاوازییەکی هەرێمی گەورە هەیە لە پیتداری، زۆربەی ولاّتانی ئەمریکای لاتین

ئاراستەیەکی دابەزینی پیتداری بەخۆوە دەبینن، ڕێژەی لەدایکبوون لە ئەمریکای ناوەڕاست (٢٩) و لە گواتیمالا دەگاتە (٣٨) و لەکۆستاریکاش (٢٣). لە سەرجەمی بەشەکانی ئەمریکای باشوور کەش و هەوایەکی مامناوەندیان هەیە ڕێژەکان بەگشتی بۆ نزمترین ئاستەکان دابەزیوون.

ڕێژەی لەدایکبوونی گشتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەگاتە گەشەی سروشتی کە دەگاتە (١٥) و لەکەنەداش دەگاتە (١٢)، هەروەها ڕێژەی گەشەی سروشتی دەگاتە (٠,٦٪) لەگەڵ ئەوەی ئەو ڕێژانە بەبەراورد لەگەڵ وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان نزمە، بەڵام ئەو گەشەکردنە تارادەیەکی زۆر بەشدار دەبێ لە زۆربوونی داخوازی لەسەر وزە و دەرامەتەکانی تر.

ئاشکرایە وێڕای هەندێ هەڵاوێری جۆرەکانی پیتداری لەسەر ئاستی جیهانی ڕەنگدانەوەی دابەشبوونی شوێنی گەشەکردنی ئابوورین، لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ڕێژەی لەدایکبوونی گشتی بۆ ئاستی خوارەوە دادەبەزێ، هەندێ جار لە ئاستەکانی مردن نزمترە وەك لە ئەڵمانیا و نەمسا و چەندین وڵاتی تری ئەوروپی، ڕێژەکانی پیتداری گشتی لە چەندین وڵاتی پێشکەوتوو لە ژێر ئاستی جێگرتنەوەیە، وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دانیمارك و سوید و نەرویج و هەنگاریا و سویسرا و هتد.

پیتداری لە چەندین وڵاتی تازە پێگەیشتوو لە نزمبوونەوەدایە، بە چینی میللی و هۆنك کۆنگ و تایوان و کۆریای باشوور و پەنەما و کۆستاریکا و مەکسیکیشەوە، ئاشکرایە لەسەرەتای نەوەدەکانەوە پیتداری لە چەندین وڵاتی تازە پێگەیشتوو دەستی بە نزمبوونەوە کردووە.

سەرجەم ئەوانەی گرنگی بە دانیشتوان دەدەن، پێویستە چاودێری ئەو شتانە بکەن کە لە چین ڕوودەدات، ئەوەش بەهۆی زەبەلاحی ژمارەی دانیشتوانەکەی. چین لە کۆتایی حەفتاکانەوە دەستیکرد بە هەڵمەتی یەك منالّی، بەهیوای دانانی سنوورێك بۆ دانیشتوان، هەڵمەتەکە لە ناوچە شارنشینییەکان پێشوازی لێکرا، بەڵام لە ناوچە لادێ نشینەکان بەتوندی ڕەتکرایەوە، وێڕای ئەوەش تاکو ئێستا ڕێژەی گەشەی سروشتی لە چین (١٪)ە.



# بەشی حەوتەم

# پیتداری: بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان

## دەستپێك

بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان و سیاسەتە نیشتیمانییەکانی پەیوەست بە مەسەلەکانی دانیشتوان دوو دیاردەی تازەن و لەسەرەتای دەیەی شەستەکان بەدەرکەوتن. لە ساڵی (١٩٦٠) (هیند) تاکە وڵات بوو ئەو سیاسەت و بەرنامەیەی پەیڕەو کرد و ئێستاش دەیکات. بەڵام ئەمڕۆ (٧٦٪)ی دانیشتوانی وڵاتانی تازە پێگەیشتوو لەو وڵاتانەدا دەژین کە سیاسەتی ڕەسمی دانیشتوانی و بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان بە ئامانجی کەمکردنەوەی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان پەیڕەو دەکەن.

بڵاوبوونەوەی بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان لە جیهان زادەی ئەو هەوڵانەبوو کە لەلایەن ڕێکخراوە ڕەسمی و تایبەتییەکانەوە دران. لە ساڵی (١٩٦٠) تەنها (١٨٪) ژنان لە تەمەنی منالبووندا لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو بەرنامەی ڕێکخستنی خێزانیان پەیڕەو دەکرد، ئەوکات ڕێژەی پیتداری گشتی لەو وڵاتانە نزیکەی (٦) منال بوو بەرامبەر بە (٢,٧) منال لە وڵاتە پیشەسازییەکان، بەڵام ئەمڕۆ پیتداری گشتی لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو دابەزیوە بۆ (٣,٥) و لەوڵاتانی پێشکەوتووش (١,٦) منالە.

لە ساڵی (١٩٥١) (هیند) بووە یەکەم وڵات کە سیاسەتی ڕەسمی بۆ پشتگیریکردنی ڕێکخستنی خێزان و هێواشکردنەوەی گەشەی دانیشتوان بونیادنا، لە شەستەکانیش چەندین وڵات شوێن پێی ئەویان هەڵگرت، لە جاڕدانی سیاسەتەکانی دانیشتوان، بەتایبەت لە ئاسیادا، لێرەدا پێویستە جیاوازی لە نێوان دوو چەمك و دەستەواژە بکەین کە بە هەڵە وەکو هاوواتا بەکاردەهێنرێن: ئەوانیش: سیاسەت و بەرنامە.

سیاسەتی نیشتیمانی دانیشتوان بریتییە لە سیاسەتێکی فەرمی حکوومەت،کە مەبەست لێی کاریگەری خستنەسەر گەشەی دانیشتوانە، ئەوەی لەم سیاسەتەدا گرنگە، ئەوەیە حکوومەت بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی گۆڕاوێك یان چەند گۆڕاوێکی دانیشتوان، دایدەڕێژێ.

دوای ئەوەی سیاسەتی حکوومی دارێژراو ژمارەیەك ئامانجی بۆ دیاریکرا، ئەوکات دەکرێ بەرنامەگەلێك دابنرێن ئەو ئامراز و کەرەستانەش بگرێتە خۆ، کە پێویستە پەیڕەو بکرێن بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسییەکانی دانیشتوان.

## ئامانجەکانی سیاسیەتی دانیشتوان

زۆربەی سیاسەتەکانی دانیشتوان لە ولاّتانی تازە پێگەیشتوو، بە ئامانجی نزمکردنەوەی ڕێژەکانی بەرزی گەشەی دانیشتوانە، لێرەوە جەخت دەکرێتە سەر نزمکردنەوەی پیتداری.

راستییەکەی ولاّتگەلی واش هەن هەولّی بەرزکردنەوەی پیتداری دەدەن، ئەوەش بەمەبەستی سیاسی و داگیرکاری، هەروەها ولاّتگەلی واش هەن خوازیاری زۆربوونی دانیشتوانن، ئەوەش مەترسی دراوسێکانی یا ژمارەی دانیشتوانەکەی کەمە بەگوێرەی دەرامەتە سروشتییەکانی، بۆیە ئەو ولاّتانە هەولّدەدەن ڕێگرییەکانی سکپڕی لە ولاّتەکانی خۆیان بە زەحمەت دەستبکەوێ، لەو ولاّتانەی پالّپشتی کۆنترۆلّکردنی لەدایکبوون ناکەن عێراق و کەمبۆدیا  لاوس و منگۆلیا و سعودیەیە.

لێرەدا سیاسەتگەلی دانیشتوان وەها هەن کە ئامانجەکانیان کەمکردنەوەی ڕێژەی مردنە، ئەوەش یا بەهۆکاری ئابوورییە یا بەهۆی مرۆییە، مەبەست لەمەش هەولّدانە بۆ باشترکردنی ڕەوشی تەندروستی و خۆشگوزەرانی دانیشتوان، بە شێوەیەکی گشتی دەکرێ بلّێین پەرەسەندنی سیاسەتەکانی دانیشتوان بەهێواشی بەڕێوە دەچێ و ڕووبەڕووی چەندین گرفت بۆتەوە، چونکە مەسەلەی پیتداری مەسەلەیەکی تایبەت و شەخسییە، ئەنجوومەنی دانیشتوانی (نیویۆرك) (٨) هەنگاوی بۆ ئەو سیاسەتە دانیشتوانیانە پێشنیارکردووە ئامانجیان سنووردارکردنی پیتدارییە:

١- گرنگیدانی حکوومەت بە دانیشتوان، چونکە دانیشتوان کاریگەری بەسەر پلانڕێژی گەشەسەندنی ولاّتەوە هەیە.
٢- راگەیاندنی مەسەلەکانی دانیشتوان لەلایەن بەرپرسگەلێکی گەورەوە.
٣- راسپاردنی لیژنەیەك بۆ دیراسەکردنی واقیعی دانیشتوان.
٤- ئەنجامدانی رووماڵێکی دانیشتوان بۆ زانینی مەودای مەعریفی و هەلوێست و مومارەسەکانی پەیوەست بە ڕێگرییەکانی سکپڕی.



٥- تەرخانکردنی بڕێکی دیاریکراو لە بودجەی سالاّنەی حکوومەت بۆ بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان لەلایەن وەزارەتی تەندروستییەوە.
٦- روونکردنەوەی ئامانجەکانی سیاسەتی دانیشتوان و چوارچێوەی زەمەنی بۆی.
٧- دامەزراندنی دەستەی ڕەسمی بۆ جێ بەجێکردنی بەرنامەکە.
٨- لێکدانی سەرجەم هەولّە دانیشتوانییەکان لەیەك دەستەدا.

دوای دیاریکردنی سیاسەتەکانی پیتداری، پێویستمان بە بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان دەبێ کە هەمیشە حکوومەت پالّپشتی دەکا و بەڕێوەی دەبا. ئامانجە راگەیەنراوەکانی بریتین: لە فەراهەمکردنی زانیاری دەربارەی ڕێکخستنی خێزان و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری لەسەر بنەمای خۆبەخشی بۆ هەر کەسێك بیەوێ زانیاری و خزمەتگوزاری دەستبکەوێ.

## بەرنامەکانی ڕێکخستنی خێزان

لەگەلّ بەردەوامی کەمبوونەوەی ڕێژەکانی مردن، تاکە ڕێگا بۆ کەمکردنەوەی گەشەی دانیشتوان نزمکردنەوەی پیتدارییە، ئەوەش شتێکی پێویستە بۆ ئەو ولاّتانەی کە قۆناغەکانی ئالوگۆڕی دیموگرافیان تەواو نەکردووە، پرۆسەی نوێکردنەوە لە ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان وێڕای گرنگییەکەی بەس نییە بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی پیتداری.

یەکەم دەنگ کە داوای ڕێکخستنی خێزانی کرد (مارگرێت سانگەر) بوو، کە هەولّ و تەقەلّلایەکی زۆریدا (مارگرێت سانگەر) لە سالّی (١٩٥٠) لە (بڕۆکلین) لە نیویۆرك یەکەم عیادەی بۆ ڕێکخستنی خێزان کردەوە، دوای پێنج سالّ عیادەیەکی لەو شێوەیە لەبەریتانیا کردووە.

دوای جەنگی دووەمی جیهانی چەندین دەستەی خۆبەخشی دەرکەوتن کە داوای ڕێکخستنی خێزانیان دەکرد، دواتر یەکێتییەکی نێونەتەویی بۆ ڕێکخستنی خێزان دامەزرا، بە ئامانجی بلاّوکردنەوەی هۆشیاری لەبارەی ڕێکخستنی خێزان و دانیشتوان

و کۆمەککردنی لێکۆڵینەوەکانی پەیوەست بە کۆنترۆڵکردنی پیتداری. لە ساڵی (١٩٩٠) یەکێیەتییەکە بووە خاوەنی (١٠٧) ئەندام لە دەستەی ڕێکخستنی خێزان، کە لە (١٥٠) وڵات بڵاوبۆوە.

بزووتنەوەی ڕێکخستنی خێزان لەهەردوو دەیەی شەست و حەفتاکان فراوان بوو، بۆ وێنە ڕێکخستنی خێزان بووە بەشێکی گرنگ لە چالاکییەکانی ئاژانسی ئەمریکی بۆ پەرەپێدانی دەرەکی (USAID) و پاشان کۆنگرێسی ئەمریکی (٤) ملیار دۆلاری بۆ ئەو مەبەستە تەرخانکرد، لە ساڵی (١٩٦٧) سندووقی چالاکییەکانی دانیشتوان (UNFPA) ی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان دامەزرا، ئەم سندووقە ئامانجی فەراهەمکردنی زانیاری پەیوەست بە مەسەلەکانی دانیشتوان پەیوەندی بە گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری بوو. وێڕای جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی دانیشتوان و بڵاوکردنەوەی ڕێکخستنی خێزان بۆ بەرژەوەندی و تەندروستی تاك و خێزان و کۆمەڵگا.

دوای بڵاوبوونەوەی کتێبی بۆمبئاسای (پۆل ئارلخ) سەبارەت بە دانیشتوان، هۆشیاری ڕێکخستنی خێزان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بڵاوبۆوە. دوای ئەویش چەندین کتێبی دیکەی پەیوەست بە گرنگی ڕێکخستنی خێزان بڵاوبوونەوە.

دەیەی دوایی سەدەی بیست پەرەسەندنگەلێکی تازەی پەیوەست بە دانیشتوان و ڕێکخستنی خێزانی بەخۆوە بینی. بە جۆرێك ڕابەران و خاوەن بڕیارەکان لەجیهانی سێ زیاتر پابەندبوون بە کەمکردنەوەی گەشەی دانیشتوان و باشترکردنی تەندروستی دایك و منداڵ.

سەرکەوتنی بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان پشت بە فەراهەمکردنی کۆمەکی دارایی دەبەستێ. وێڕای پاڵپشتی میللی و سیاسی و ئیداری و ڕێکخستنی باش و بەرچاو.



لەو هەوڵانەی کە بۆ ڕێکخستنی خێزان دران دەکرێ بڵێین پێنج چالاکی بۆ ئەو مەبەستە هەیە و سەرکەوتووش بوون، بەتایبەت لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو، ئەو هەوڵانەش ئەمانەن:

١- پرۆژەکانی بەرچاوخستن، بەمەبەستی جەختکردنە سەر ئەوەی کە داخوازی لەسەر خزمەتگوزارییەکانی ڕێکخستنی خێزان هەیە، هەروەها دەکرێ ئەو خزمەتگوزارییانە بە ڕێگای دروست و خوازراو بگوازرێنەوە.

٢- فەراهەمکردنی ڕێگرییەکانی سکپڕی وەك ئەڵقە و کۆندۆم و هتد.

٣- پاڵپشتیکردنی بەرنامەی ڕاهێنان لە بواری دانیشتوان و ڕێکخستنی خێزان.

٤- هاوکاری لە بواری ڕووماڵ و سەرژمێری دانیشتوان.

٥- هاوکاری هونەرییەکانی دیکە و بەرزکردنەوەی هۆشیاری کرێکاران و لەبەرنامە و پەرەپێدانی کەرەستەکانی ڕێگری سکپڕی کاریگەرترن و هەمەجۆرکردنی ڕێگرییەکانی سکپڕی و تاقیکردنەوەی تازە.

## ڕێکخستنی خێزان لە وڵاتە دواکەوتووەکان

لەم سی ساڵەی دوایی چەندین بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان دامەزراون، لەدەیەی پەنجا و شەستەکان حکوومەتەکان زیاتر وریابوونەتەوە بەگەشەی خێرای دانیشتوان و ئەنجامە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە کەڵەکەبووەکانی سەر ئەو گەشەکردنە.

حکوومەتەکان زیاتر گرنگیان دا بەبەرنامەی ڕێکخستنی خێزان و ژمارەی ئەو ژن و پیاوانەی کە ڕێگرییەکانی سکپڕیان بەکاردەهێنا زۆرتربوون، واتە نزیکەی (٤٠٠) ملیۆن کەس، لە کۆی (٨٥٠-٨٨٠) ملیۆن هاوسەرداران ڕێگرییەکانی سکپڕیان بەکاردەهێنا.

خەمڵاندنەکانی ئێستا ئاماژە بەوە دەدەن کە (٥٠٪) ی ژنانی هاوسەردار لە تەمەنی منداڵخستنەوە لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو جۆرێك لە جۆرەکانی ڕێگری

سکپڕی بەکاردەهێنن، ئەمەو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیاواز دەبێ و نزیکەی (١٧٪) لە ئەفریقیایە بۆ (٧٥٪) لە رۆژهەلاتی ئاسیا. (شێوەی ١-٧).

زۆربوونی خێرای بەکارهێنانی رێگرییەکانی سکپڕی زادەی زۆربوونی حاڵەتەکانی خەساندنی مێینەکان و بەکارهێنانی رێگرییەکانی سکپڕی تازەن، خەساندن نیوەی کەرەستەکانی رێگری سکپڕی لە ئاسیا پێکدەهێنێ، هەروەها نزیکەی سێ بەش لە ئەمریکای لاتین و کەمتر لە (٨٪) لە ئەفریقیا.

بۆ زیاتر ئاشنابوون بە جیاوازییە هەرێمییەکانی بەرنامەی رێکخستنی خێزان لە جیهانی سێ، (فریدمان – freedman) لە ساڵی (١٩٩٠) ئەو ولاتانەی دابەشی سەر سێ گرووپ کردووە.

١- ولاتانی کەم پێشکەوتوو خاوەن گەشەکردنێکی خێرایی دانیشتوانن.

٢- ولاتانی پەرەسەندووی مامناوەند.

٣- ولاتانی کەم پەرەسەندوو.

لە ولاتانی کۆمەڵەی یەکەم وەك کۆریا و تایوان و مەکسیك و سەنگافورە رێژەکانی پیتداری بە خێرایی دابەزی، بۆ وێنە رێژەی پیتداری لە تایوان لە ساڵی (١٩٦٠) لە (٦) منداڵەوە دابەزی بۆ (١,٧) لە ساڵی (١٩٩٩).

کۆمەڵەی دووەم ولاتانی وەك چین و ئەندەنوسیا و تایلاند دەگرێتەوە، هۆکاری دابەزینی پیتداری لەو ولاتانە دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك فاکتەری وەك بەرەودان بە کەرتی گشتی و توانای حکوومەت لە پەیڕەوکردنی بەرنامەی رێکخستنی خێزان بەسەر کۆمەلانی لادێ-نشیندا.

لەکۆمەڵەی سێیەمدا زۆربەی ولاتانی ئەفریقیای باشووری بیابان و هیند و پاکستان و بەنگلادیش و ولاتانی بچووکی باشووری رۆژئاوایی ئاسیا دەبینن، وێڕای بوونی بەرنامەی رێکخستنی خێزان لە هەندێ لەو ولاتانەدا، بەلام رێژەی رێگرییەکانی سکپڕی بە شێوەیەکی بەرچاو بەکار نایات.



گفتوگۆیەکی بەردەوام لەمەر کارایی بەرنامەی رێکخستنی خێزان هەیە و زۆربەی بەلگەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە بەو بەرنامەیە کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر نزمکردنەوەی پیتدارییەوە هەیە. زۆربەی گفتوگۆکانیش جەخت لەسەر زەروورەتی هاتنەئارای گەشەکردنێکی ئابووری و کۆمەلایەتی دەکات هەلبەتە ئەو گەشەکردنە مەرجێکی لە پێشینەیە بۆ سەرکەوتنی بەرنامەی رێکخستنی خێزان، لایەنگرانی بەرنامەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەگەر گەشەکردنی ئابووریش روونەدات ئەو بەرنامەیە کاریگەری خۆی هەر دەبێ.

(الانهام و مۆلدن) لە لێکۆلینەوەیەکدا لەسەر بەرنامەی رێکخستنی خێزان کە لە (٩) ولات ئەنجامیانداوە، تیایدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە بەرنامەی رێکخستنی خێزان رۆلێکی گرنگ دەگێڕێ لە زۆر بەکارهێنانی رێگرییەکانی سکپڕی و کەمکردنەوەی پیتداری، هەروەها جەختیان لەسەر ئەوەش کردووە کەبەرنامەی رێکخستنی خێزان شان بەشانی گەشەی ئابووری بەرێوەدەروا و نزمبوونەوەی رێژەی لەدایکبوونیش زادەی ئەو هەولانەیە.

بەرنامەی رێکخستنی خێزان بە تەنیا خۆی بەرپرسیار نییە لە نزمبوونەوەی پیتداری، فاکتەرگەلی دیکەش هەن، کە ئەوانیش کاریگەرییان هەیە لەکەمبوونەوەی رێژەی پیتداری وەکو کەمکردنەوەی رێژەی نەخوێندەواری، باشتربوونی رەوشی ئافرەت، بەرنامەی پەرەپێدانی لادێ، دووبارە دابەشکردنەوەی داهات و بەرنامەی رۆشنبیرکردنی دانیشتوان.

بەرنامەی رێکخستنی خێزان رووبەرووی چەند ئاستەنگێك دەبێتەوە وەك: جیاوازی زمان لە هەندێ ولات، فەراهەم نەبوونی ئامرازەکانی پەیوەندی بۆ سەرجەم خەلك، سروشتی ئەو هەولانەی کە حکوومەتەکان دەیدەن، مەودای توانا و پەرۆشی کرێکاران بۆ بەرنامەکە و چەندین هۆکاری دیکە.

(بۆنگارتس) لە لێکۆلینەوەیەکی تازەی خۆیدا ئەو پێداویستییە دابینکراوانەی شیکردۆتەوە کە پێویستن بۆ دابەشکردنی رێگرییەکانی سکپڕی، لەوێدا تێبینی

کردووە پێداویستییە دابین نەکراوەکان پەیوەستن بە ئاستی پیتداری بەرز، ناوەندی ڕێژەی پێداویستی (٦٠٪) و لە (٤٢٪) ڕێژەی بەکارهێنان دەنوێنێ و لە (١٨٪) پێداویستی دابین نەکراون، کۆمەڵێك فاکتەری بەرپرسن لە دابیننەکردنی پێداویستییەکان. ئەوانیش بریتین لە:

١- لاوازی خزمەتگوزارییەکانی ڕێکخستنی خێزان.
٢- ئاسان نەگەیشتن بەو خزمەتگوزارییانە.
٣- سستی پاڵنەرەکان
٤- قایل نەبوونی هاوسەرەکان.

ویڕای فەراهەمبوونی زانیاری ورد، بەڵام بڕوا دەکرێ نزیکەی (١٠٠) ملیۆن هاوسەر (couple) لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو هەن پێداویستی ئەو خزمەتکوزارییانەن و بۆیان دابین نەکراوە، سەرباری ئەو فاکتەرانەش گرفتی کۆمەککردنی ئەو خزمەتگوزاریانەش هەیە کە هاوکارییە نێودەوڵەتییەکان لە سێ بەش زیاتر پێکناهێنێ لە کاتێکدا وڵاتانی تازە پێگەیشتوو بڕەکەی تر پێکدەهێنن، بۆیە دەبێ وڵاتانی تازە پێگەیشتوو دارایی زیاتر تەرخانبکەن کە لە توانیایاندا نییە.

لێرە بەدواوە —دراسە حالە-ی هیند (چیرۆکی شکست) و کۆریای باشوور و تایلەند (دوو چیرۆکی سەرکەوتوو) تاوتوێ دەکەین.

## هیند:

هیند یەکەم وڵات بوو لە ساڵی(١٩٥٢) بەرەوی بەنزمبوونەوەی ڕێژەی لەدایکبووندا، سەرەتا کۆمەککردنەکە لاوازبوو، دوای سەرەتایەکی شەکەت، لە ساڵی (١٩٦٥) بەرنامەکە زیندووکرایەوە و حکوومەت بەڕێوبەرایەتی ڕێکخستنی خێزانی لە ژێر دەسەڵاتی وەزارەتی تەندروستی و ڕێکخستنی خێزانی دامەزراند. حکوومەتی مەرکەزیش کۆمەکی بەو پرۆژەیە کرد.



تا ساڵی (١٩٧٦) پەیڕەوکردنی ئەو پرۆگرامە، ئارەزوومەندانە بوو، بەڵام لەو ساڵە بەدواوە لە ویلایەتی (مهاراچرا) خەساندنی زۆرەملێ پەیڕەو کرا و دەبوایە نێرینەکان بەڵگەنامەی خەساندنی خۆیان بەرز بکەنەوە تا پیشەیەکەی خۆیان بگوازنەوە یا پلەکانیان بەرز بێتەوە یا باڵەخانە و چاودێری پزیشکیان دەستبکەوێ، هاوکات بەرنامەکە هەوڵیدا پەیوەندی و پاڵنەرەکان باشتر بکات، واتە قایلکردنی خەڵکی بە سوودەکانی خێزانی بچووك. گرنگترین توخمەکانی بەرنامەی هیند بریتی بوو لە کۆمەڵێك پاڵنەر وەك پاڵنەری ماددی ئەو نێرینە و مێینانەی کە دوو منداڵیان هەیە ئەگەر بەخەساندنی خۆیان رازی بوون (١٥٠) رووپیە پێدەدرا کە دەکاتە مووچەی یەك مانگی کرێکارێکی کشتوکاڵ.

هەروەها ویلایەتەکان پاڵنەری ماددی تریان بەخشی یان ئەوەتا مۆڵەتی نەدەدا دوای منداڵی دووەم.

دوای هاتنە سەر دەسەڵاتی (پارتی جناتا) لە ساڵی (١٩٧٧) میکانیزمە زۆرەملێیەکانی لابرد و پاڵنەری زۆرتری بۆ خەساندن و بەکارهێنانی ئەڵقە دانا، (١٠٠) روپییە بۆ خەساندنی پیاو (١٢٠) روپییە بۆ بەستنی (المواسیر)، بەڵام لە ژێر سایەی حوکمی (جناتا) ئەم پرۆگرامە لەلایەن فەرمانبەران زیاتر فەرامۆش کرا.

لەنێوان ساڵانی (١٩٧٨-١٩٨١) پلانێك داڕێژرا کە بەهۆیەوە هیند گەیشتە ئاستی (حلول) لە ساڵی (١٩٩٦) (ئامانجێك تا ئێستا نەهاتۆتە دی)، ئامارەکان ئاماژە بەوە دەدەن نزیکەی سێ بەشی هاوسەرەکان ئامرازەکانی ڕێگری سکپڕی بەکاردەهێنن، لەگەڵ ئەوەشدا نزمبوونەوەی ڕێژەی لەدایکبوون کەمە، واتە لە (٣٦،٨) وە نزمبۆتەوە بۆ (٣٣،٩) لەهەزاردا.

**چاودێرانی هیندی و بیانی هاوڕان لەسەر ئەوەی جێ بەجێکردنی بەرنامەکە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە لاوازبووە:**

١- پێداگری لەسەر داڕشتنی ئامانجی بەرزی بەشەکە و پەرۆشی کرێکارانی لاوازە.

٢- زۆر جەختکردن لەسەر خەساندن و بەستنەوەی بە سیستەمی پاڵنەرە گفتوگۆ وورووژێنەکان.
٣- درێژە نەدان بە بەرنامەکە لەلایەن کرێکاران و هاوکارانەوە.
٤- بێ ئاگایی جێ بەجێکارانی بەرنامەکە لە واقیعی ژیان لەلادێ هیندییەکان.

## کۆریای باشوور و تایلەند – دوو چیرۆکی سەرکەوتوو

بەرنامەی رێکخستنی خێزان کە لەکۆریای باشوور لە ساڵی (١٩٦١) بونیادنرا، تاکو ئێستاش سەرکەوتووترین بەرنامەیە لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان. ئەو سەرکەوتنەش هاوکاتە لەگەڵ گەشەی ئابووری سەرنجراکێش، لەماوەی نێوان ساڵی (١٩٦٢ تا ١٩٨٨) رێژەی داهاتی تاك لە (٦٢) دۆلارەوە بەرزبۆوە بۆ (٣٦٠٠) دۆلار. رێژەی ئەو ژنانەی کە خوێندنی ناوەندیان تەواوکرد بەرز بۆوە بۆ (٦٥٪)، بەرنامەی رێکخستنی خێزان رۆڵێکی گرنگی گێڕا لە پێکهێنانی هۆشیاری خەڵك سەبارەت بە سکپڕی و منالبوون و قەبارەی خێزان، لەسەرەتای شەستەکان لە (١٠٪) ژنان رێکخستنی خێزانیان پەیڕەو کرد. رێژەی پیتداری گشتیش (٥,٤) منال بوو. بەهاتنی ساڵی (١٩٩١) رێژەی پیتداری بۆ (١,٦) منال دابەزی و رێژەی ئەو ژنانەی کە رێگرییەکانی سکپڕیان بەکاردەهێنا بەرزبۆوە بۆ (٧٧٪)، ئەو رێژەیەش تاکو ئەمڕۆ بەردەوامە.

سەرکەوتنی بەرنامەکە پشت بە سیستەمی ئامانجەکان دەبەستێ، بۆ ئەو کرێکارانە دانراوە کە سەردانی ژنەکان دەکەن لە ماڵەکانی خۆیاندا و هانیاندەدەن رێگری سکپڕی بەکاربهێنن، و جەخت لەسەر رێکخستنی خێزان دەکەن لە پێناو باشتربوونی تەندروستی دایك و منال.



## تایلەند

تایلەند چیرۆکێکی سەرکەوتووی دیکەی سەرکەوتنی بەرنامەی رێکخستنی خێزان دەخاتە بەرچاو، لە ساڵانی (١٩٦٥-١٩٩١) رێژەی ژنانی هاوسەردار لە تەمەنی منالبووندا، رێگرییەکانی سکپڕیان بەکاردەهێنا لە (١٥٪)ەوە بەرزبۆوە بۆ (٦٨٪)، پاشان رێژەی پیتداری گشتی بە شێوەیەکی فراوان نزمبۆوە، واتە لە (٥,٧) منالەوە بۆ (٢) منال لە ساڵی (١٩٩٨).

ئامانجی ئەم بەرنامەیە فەراهەمکردنی زانیاری پەیوەست بە رێگرییەکانی سکپڕییە بۆ سەرجەم فەرمانبەران، بەتایبەت دانیشتوانی لادێ، پاشان راهێنانی دەرچووانی زانکۆ و مامانەکان لە دابەشکردنی چەندین جۆری رێگرییەکانی سکپڕی.

بەرنامەکەی تایلەند توانی دەرامەتە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان پێکەوە ببەستێتەوە، هەڵبەت بەبەشداری کەرتی تایبەت لەو هەوڵەدا.

تێبینی دەکرێ بەردەوام ئاستەکانی پیتداری لە وڵاتانی ئاسیا بەرەو دابەزین بچێت. سەرباری ئەوەی وتمان هەر یەك لە سەنگافورە و هۆنك کۆنگ و سریلانکا نزمبوونەوەیەکی بەرچاویان لە پیتداری بەخۆوە بینیوە، چاوەڕاونیش دەکرێ وڵاتانی دیکەی هەرێمەکەش شوێن پێی ئەوان هەڵگرن.

## رێکخستنی خێزان لە وڵاتانی پێشکەوتوو

رێکخستنی خێزان لە وڵاتانی پێشکەوتوو کەم گرنگی پێدەدرێ، ئەوەش بەهۆی کەمی ژمارەی دانیشتوان و نزمی رێژەی پیتداری، وێڕای جیاوازی سروشتی گرفتە دانیشتوانییەکان لە نێوان وڵاتانی تازەپێگەیشتوو و وڵاتانی پێشکەوتوو، بەڵام وڵاتانی پێشکەوتوو بەم دواییە گرنگی زۆر بە گرفتی دانیشتوان دەدەن.

پێشتر سیاسەتەکانی دانیشتوان لە وڵاتانی پێشکەوتوو هانی منالخستنەوەیان دەدا، بەڵام ئێستا دەبینین زۆربەی سیاسەتەکان هانی پیتداری نزم دەدەن، وڵاتانی پێشکەوتوو بە وڵاتگەلی نزمە پیتداری دەناسرێنەوە و سەرجەمیشیان بە قۆناغەکانی

ئاڵوگۆڕی دیموگرافیدا تێپەڕیوون. هەروەها ڕێژەی بەکارهێنانی ڕێگرییەکانی سکپڕی لەو وڵاتانە بەرزە (٢-٧).

لەهەندێ لەو وڵاتانە وەك ئیسپانیا و ئیتاڵیا ڕێژەی گشتی پیتاندن بەجۆرێك نزمبۆتەوە زانایانی بواری دانیشتوانی سەرسامکردووە و نازانن چی بڵێن، چونکە نموونەی ئاڵوگۆڕی دیموگرافی چاوەڕوان ناکرێ پیتداری دابەزێنێ بۆ (١,٢) منداڵ، بەڵام دەشێ فاکتەری ئەو دابەزینە فاکتەری ماددی بێت، وێڕای نەبوونی سیاسەتێکی دانیشتوانی دیاریکراو لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام زۆر گرنگی بە بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان دەدرێ، لە ساڵی (١٩٧٠) ئەمریکا (یاساداڕێژی ڕێکخستنی خێزان و لێکۆڵینەوەی دانیشتوانی) داڕشت، جگە لە دەرکردنی یاسای لەباربردن.

لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا ڕێژەی گەشەی دانیشتوان گەیشتووەتە سفر، لە زۆربەی ئەو وڵاتانەش سیاسەتێکی ڕەشبینانە سەبارەت بە بەکارهێنانی ڕێگرییەکانی سکپڕی و لەباربردن هەیە، بەڵام هیچ سیاسەتێکی ڕەسمی دژی منداڵخستنەوەی لە ئارادا نییە.

لە هاوبەندی وڵاتە سەربەخۆکان تەنها گرنگی بەسیاسەتی دانیشتوان و دابەشکردنی دانیشتوان دەدرا. لە هەندێ لەو وڵاتانەی کە ڕێژەی گەشەی دانیشتوانیان نزمبۆوە، هانی پیتداری بەرزیان دەدا، بەڵام ڕێگرییەکانی سکپڕی و لەباربردن فەراهەم بوو.

لە کۆتایی جەنگی سارد پیتداری لە ڕوسیا بۆ ئاستەکانی خوارەوە نزمبۆوە، لە ساڵی (٢٠٠٠) گەیشتە (١,٢) منداڵ، ئەوەش لە خوار ئاستی جێگرتنەوەیە، ڕێژەی لەدایکبوونی گشتی لە ڕوسیا گەیشتە (٩) لە هەزاردا و ڕێژەی مردنیش (٨) لە هەزاردا ئەوەش گەشەیەکی سروشتی نێگەتیڤی دەردەخست (٠,٥٪). هەروەها پیتداری لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی لە سنووری یەکێتی سۆڤیەتدا بوون نزمبووەوە، بۆ وێنە ڕێژەی پیتداری گشتی بولگاریا (١,٢) منداڵ بوو. لە ژاپۆن گەورەترین وڵاتانی پێشکەوتووی ناوچەکەیە، بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان بە شێوەیەکی فراوان پێشوازی لێکرا، هەروەها خزمەتگوزاری خێزان لە زیاتر لە (٨٠٠) سەنتەری تەندروستی لە



تەواوی وڵات فەراهەم کرا، وێڕای فەراهەمکردنی خزمەتگوزارییەکانی لەباربردن، لە ئەنجامیشدا ڕێژەی پیتداری گشتی لە ژاپۆن لە (٤) ساڵ (٢٠٠٠) بۆ (١,٤) منداڵ دابەزی، لە وڵاتە پیشەسازییەکان ڕێژەی پیتداری نزمە، لەگەڵ ئەوەی هیچ سیاسەتێك لە گۆڕێدا نییە بۆ نزمکردنەوەی پیتداری، هۆکاری سەرەکی ئەوەش کاریگەری بەرزبوونەوەی پێگەی کۆمەڵایەتی — ئابووری و شارنشینییە، زۆرجار دەبینین بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان یارمەتیدەرە لە پاراستنی نزمی پیتداری.

## ئەوروپای ڕۆژهەڵات: تەنگەژەیەکی نوێ (دیراسة حالة)

لەو کاتەی کە چین هەوڵیدەدا ڕێژەی پیتداری نزم بکاتەوە، وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات بینیان سیاسەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە ساڵانی جەنگی سارد بووە هۆی نزمبوونەوەی نەخوازراوی ئاستەکانی پیتداری، لەم سی ساڵەی کۆتایی، پیتداری لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات دابەزی، ئەوەش بەهۆی فەراهەمبوونی خزمەتگوزارییەکانی لەباربردن.

حکوومەتەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات هەوڵیاندا هانی هاوسەرەکان بدەن تا منداڵی زیاتریان ببێ بۆ ئەوەی بونیادنانی سیاسەتی هاندەرانەی منداڵخستنەوە قبووڵبکرێ، لەو وڵاتانە بونیادێکی ئاڵوگۆڕی بەرنامە و سیاسەتگەلی وا هەن کە بە ڕێگای ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لە هەوڵی کەمکردنەوەی بارگرانی ماددی سەر خێزانە گەورەکانی وەك کرێی مۆڵەتی دایکایەتی و دانی مانگانەی ئەو خێزانانەی کە منداڵیان هەیە، هەروەها دانی خەرجی لەکاتی بوونی منداڵەکە، و پاڵپشتیکردنی نرخی کاڵای منداڵان و کەمکردنەوەی باجی دایك و باوکان و ڕێوشوێنی دیکە، ئەمەش وەکو هاندانی هاوسەرەکان بۆ خستنەوەی خێزانی گەورە بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەنجامە خوازراوەکەی وەدی نایە.

بۆ ئەوەی لە ئاراستەکانی پیتداری لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات بەر لە جەنگی سارد تێبگەین، دەبێ لە ڕەوشی ژنانی ئەو وڵاتە سۆسیالیستیانەی پێشوو ئاگادار بین،

وێڕای ئەوەی ئایدیۆلۆژیەتی مارکسی پێگەیەکی هاوشانی پیاو دەدات بە ژن، بەڵام ڕاستییەکەی بەو شێوەیە نەبوو. (دیڤید) تێبینی کردووە یاساکان ڕوانگەیەکی پیاوانەیان وەلا نەناوە و هەلومەرجی ئابوورییان نەگۆڕیوە و تاکو ئێستاش بارگرانییەکی قورسە بەسەر ژنانەوە، سەرباری ئەو پاڵنەرانەی کە حکومەت دایناوبوو.

شۆڕشە دیموگرافییە تازەکان لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات گۆڕانی گرنگی لە بونیادی سیاسی و ئابووری ئەو وڵاتە هێنایە ئارا. ئێستا پیتداری لەسەرجەم ئەو وڵاتانە نزمبۆتەوە، هەروەك لە ڕووسیا ڕوویدا.

### یاسا و سیاسەتی دانیشتوان

ئەو سیاسەتانەی کە بۆ کاریگەریخستنە سەر ئاڵوگۆڕە دیموگرافییەکان دادەڕێژرێن زۆر جار لە ڕووی سیاسەت و سۆزدارییەوە هەستیارییەکی دیاریکراویان هەیە، بڕێ جاریش گۆڕانە جیدییەکانیش لە یاسا باوەکان دەگرێتەوە، بەتایبەت ئەو یاسایانەی کە زاڵن بەسەر بڵاوبوونەوەی مەعریفەی پەیوەست بە ڕێگرییەکانی سکپڕی.

چاوەروان دەکرێ بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان تەشەنە بکات و بگاتە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان، ئەو یاسایانەی پابەندن بە فرۆشتنی ڕێگرییەکانی سکپڕی لەبەرژەوەندی زیاتر فەراهەمبوونی دەگۆڕێن، پاڵپشتی حکومەت بۆ بەرنامەی ڕێکخستنی خێزان بە ئامانجی کەمکردنەوەی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان زۆر دەبێ، ئەگەر کاروبارەکان بە شێوەیەکی باش بەڕێوە بچن، نزمبوونەوەی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان بەردەوام دەبێ، سەدەی تازە ژمارەیەکی دانیشتوانی قەبارە سەقامگیر بەخۆوە دەبینێ، بەڵام نەك بەر لەوەی بگاتە (١٠) ملیار کەس.



## بەشی هەشتەم

# کۆچ و جووڵەی دانیشتوان

## دەستپێك

ئـارەزووی کۆچـکردن یەکێکـە لـە تایبەتمەندییـە گرنگـەکانی مـرۆڤ، هـەروەها دانیشتوان لە جووڵەیەکی بەردەوامدان، جووڵەکەشیان لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنـەلۆژی و ئابووری خێراتربووە، بەتایبەت پێشکەوتن لە بواری گواستنەوە و گەیاندن، هەروەها توانستی پێکەوەلکانی کلتوورەکان وای کردووە مرۆڤ لـە میـانی خستنەگەری توانـا عەقڵییەکان و لێهاتوو تەکنەلۆژییەکان خۆی لەگەڵ گۆڕانـە ژینگەییـەکان بگـونجێنێ (parfit-1988) وای دەبینێ شەپۆلە یەك لـە دوای یەکـەکانی هـەزاران خـەڵك لـە فرۆکەخانە و بەندەر و وشکانییەکان و وێـستگەکانی شـەمەندەفەر و بەدرێـژایی ئـەو سنوورانەی بە دارستان داپۆشراون تەنانـەت سـنوورگەلی وا هـەن سـیمی دڕکـاوی و کارەبایی دانراون، کەچی ئەو هەزاران خەڵکە بەرەو شوێنی تازە کۆچ دەکەن و بەوەش جیهان دەگۆڕن.

**کۆچ لە چەند لایەکەوە لە پیتداری و مردن جیاوازە:**

**یەکەم:** رووداوە ژیارییەکانی وەك مردن و لـە دایکبـوون رووداوگـەلی تایبـەتن و تەنها یـەکجار لـە ژیـانی تاکەکانـدا روودەدەن. ژمارەیـەك خـەڵك لـەدایك دەبـن و لەبەرامبەردا ژمارەیەکی تر دەمرن، بەڵام ناتوانن جارێکی تـر بگەڕێنـەوە بـۆ ژیـان، هەروەها لەبەر ئەوەی کۆچ دیاردەیەکی نا بایۆلۆژییە بۆیـە پرۆسـەیەکی یـەك شـێوە نییە، رادەی بەرزی کۆچ بوونی نییـە بـەڵکو رادەی بـەرزی ئـەو منالانـە هەیـە کـە ئافرەتێك دەیانخاتەوە.

گۆڵدشیدر (١٩٧١) ئاماژەی بەوە داوە کۆچ گشتی کۆمەڵگا مرۆییـەکان، مـردن ناگرێتەوە بەڵکو کۆچکردنی خەڵکی بۆ ناوچـەیەکی تـر دەگرێتـەوە، بـۆ وێنـە شـارە وێرانەکانی رۆژئاوای ئەمریکا کاتێك دەرکەوتن کە دانیـشتوانەکانیان دوای نـەمانی کانزا گرانبەهاکان (زێڕ و زیو) لەو شارانە کۆچیان کرد و بەجێیان هێشت، چونکە لـە بنەڕەتدا ئەم کانزایانە خۆیان فاکتەری کێشکردنی دانیشتوان بوون.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی پرۆسەی کۆچ جێهێشتنی شوێنێك و گواستنەوە بۆ شوێنێکی تر دەگرێتەوە، بۆیە پێویستە دوو گرووپی دانیشتوان لەبەر چاو بگرین: دانیشتوانی ناوچە رەسەنەکان و دانیشتوانی تازە بۆ هاتووەکان. گۆڕان لە رادەی مردن و پیتداری بە شێوەیەکی سادە کار دەکەنە سەر شوێنێك، بەلاّم کۆچ هەمیشە بە شێوەیەکی بەردەوام کار دەکاتە سەر هەردوو ناوچەکە، تاکو لەو پرۆسەیەی کە روودەدات تێبگەین، پێویستە دیراسەی هەردوو ناوچەکە بکەین.

**سێیەم:** پیتداری و مردن دوو دیاردەی جیهانین، واتە پێویستە کۆمەڵگاکان منالّ بخەنەوە و خێزان رێك بخەن لە پێناو مانەوە، لەلایەکی ترەوە کۆچ دیاردەیەکی جیهانی نییە، مەرج نییە هەر کەسێك لەدایك دەبێ کۆچ بکات، لەگەڵ ئەوەی دانیشتوان لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان بە شێوەیەکی فراوان کۆچدەکەن، سەرباری ئەوەش کۆچ پرۆسەیەکی لە خۆوەکییە و سنووری نییە، هەندێ لە کۆمەڵگاکان جوولّەیەکی فراوانی کۆچ بە خۆوە دەبینن، بەلاّم هەندێ کۆمەڵگای تر هەن جوولّەی کۆچی سنوودار بەخۆوە دەبینن، سەرباری ئەوەش دەشێ کۆچ لەچەند جارێك زیاتر دووبارە بێتەوە و دەشێ پێچەوانەش بێتەوە.

## پێوەرەکانی کۆچ

وا دێتە بەرچاو پێناسەکردنی کۆچ پرۆسەیەکی تارادەیەك ئاسانە، بەلاّم دەکرێ هەندێ گرفتی پەیوەست بەو پێناسەیە دیاریبکەین، بۆ وێنە: ئەگەر کۆچمان ناسی کە گواستنەوە یا جوولّەی تاکێکە، ئەوە چەندین پرسیار دێنە گۆڕێ کە دەبێ وەلاّم بدرێنەوە، ئەو شتە چییە پروسەی کۆچ پێکدەهێنێ؟ ئایا جوولّە بەردەوامە یا ئەوانەی بە رێگای رەسمی (ترانزێت) شوێنی خۆیان دەگۆڕن دەکرێ بە کۆچبەریان وەسفبکەین؟

زۆرێك لە دانیشتوان وەك کڕیار و فرۆشیار و گەشتیارەکان شوێنی خۆیان دەگۆڕن، بەلاّم ئایا بە کۆچبەر دادەنرێن؟ لە راستیدا وەلاّمی روون و دیاریکراو بۆ تەواوی ئەو



پرسیارانە لە گۆڕێ دا نییە، بەقسەی زانای دیموگرافیست (راڵف تۆملسۆن – ١٩٧٦) دیموگرافیستەکان: هەر کەسێ شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی گۆڕی کە ماوەیەکی زۆر لەو شوێنە نیشتەجێ بووبێ و سنووری ئیداری و سیاسی تێپەرێنن بە کۆچبەر دادەنرێن.

جوگرافیناسان گوزارشتی (دابەشکردنی خولاوەیی چالاکییە ئابورییەکان) بەکار دەهێنن، وەك: بازاڕیکردن و گەڕیدە و گەشتیار، چونکە هەر یەك لەو چالاکییانە لە شوێنی نیشتەجێبوونی تاك دەستپێدەکەن و کۆتاییان پێدێ، هەروەها چەندین ئەدەبیات لەمەر بابەتی فرۆشیارانی گەڕیدە و گەشتکردن بۆ کار هەن.

دیموگرافیستەکان جیاوازی لە نێوان جێگۆڕکێکەرەکان و کۆچکەران دەکەن، ئەمەش بە پشت بەستن بە یەك پێوەر: جێگۆرکێکەرەکان ئەو کەسانەن شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان دەگۆڕن، بەلاّم کۆچکەران ئەو کەسانەن بەرەو یەکە ئیدارییە تازەکان کۆچ دەکەن تیایدا نیشتەجێن. هەموو کۆچبەرێك جێگۆڕکێکەرە، بەلاّم هەندێ لە جێگۆڕکێکەرەکان کۆچبەر نین، راستییەکەی ئەستەمە زانیاری لەمەر سەرجەم تاکەکان چنگ بخەین، هەموو پرۆسەکانی گواستنەوە بەبێ سیستەمێکی تۆمارکراوی نیشتیمانین، لەگەڵ ئەوەشدا قەبارەی جوولّەی ئەو دانیشتوانانەی کە سنووری ئیداری تێدەپەرێنن لە زانیارییەکانی سەرژمێری تۆمار دەکرێن، هەروەها دەکرێ زانیاری گرنگ لەمەر جوولّەی ئەو کۆچکەرانەی کە سنووری دەولّەت بەرەو دەولّەتێکی تر دەبڕن چنگ بکەوێ.

(رۆسمان -١٩٧١)ی جوگرافیناس رێگەیەکی جیاواز و گرنگی بۆ وەسفکردنی پرۆسەی کۆچ خستەروو، رۆسمان گواستنەوەی بەشەکی و گواستنەوەی گشتی کۆچبەرانی لێکجیاکردەوە، بۆ ئەوەش پشتی بە چالاکی شوێنی خێزان و گرووپی شوێنەکان بەست وەك قوتابخانە و کۆگا بازرگانییەکان و شوێنەکانی کات بەسەربردن کە خێزانەکان بە شێوەیەکی رێك و پێك دەوری کارلێك دەکەن، بەپشت بەستن بەوەش جوولّەکانی گواستنەوەی بەشەکی ئەو شتەیە کە هەندێك لە چالاکییە شوێنجێیەکانی

خێزان دەگۆڕن: بۆ وێنە: کاتێك خێزانێك لە ناو یەك شاردا، لە گەڕەکێکەوە دەگوازنەوە گەڕەکێکی تر و ژن و پیاوەکە شوێنی کارەکەی خۆیان ناگۆڕن، بەڵام منداڵەکانیان دەچنە قوتابخانەی گەڕەکە تازەکەیان، خێزانەکەش لە بازاڕێکی تازەدا بازاڕی دەکەن، لەبەرامبەردا جووڵەی گواستنەوەی گشتی، زۆرینەی جار گواستنەوەیەکی مەودا درێژە کە وا دەخوازێ سەرجەم چالاکییە شوێنجێیەکانی خێزان گۆڕانی بەسەردا بێ، وێڕای گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوون.

## هەندێ چەمك و هاوکێشەی بنەڕەتی کۆچ

لێرە بەدواوە کۆمەڵێك هاوکێشە و چەمکی کۆچ دەخەینەروو کە لە تاقیکردنەوەی هەندێ گریمانەی کۆچ بە کەڵکمان دێ، هەروەها هاوکار دەبێ لە ئاسانکردنی پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری و تێگەیشتنێکی باشتر لە لێکۆڵینەوەکانی کۆچ.

## کۆچی گشتگیر: gross migration

کۆمەڵە کەسێك کە ڕوودەکەنە ناوچەیەکی دیاریکراو یان بەجێی دەهێڵن، بەو شێوەیە قەبارەی گشتی کۆچی دانیشتوانمان لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا بۆ دەپێوێ.

## کۆچی پوخت: net migration

دەشێ هەرێمێکی دیاریکراو و لەماوەیەکی زەمەنی دیاریکراو پێشوازی لە کۆچبەرانی هەرێمێکی دیکە بکا، یا کۆچبەر لەم هەرێمەوە بەرەو هەرێمێکی تر کۆچبکا، جیاوازی لە نێوان ژمارەی هاتووەکان و ژمارەی ڕۆیشتووەکان پێیان دەوترێ کۆچی پوخت، کاتێك ژمارەی ئەو دانیشتوانانەی ناوچەیەك بەجێ دێڵن زۆرترە لە ژمارەی هاتووەکان، ئەوە کۆچی پوخت نێگەتیف دەبێ، لەبەرامبەردا کۆچی پوخت پۆزەتیف دەبێ، کاتێك کە ژمارەی ئەو کەسانەی دێن بۆ ناوچەیەك زیاتر بێ لە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ناوچەکە دەردەچن.



## کۆچی دەرەکی و کۆچی ناوخۆیی و شوێنی ڕەسەن و شوێنی بۆهاتوو

**هەموو دیاردەیەکی کۆچ دوو کردە لە خۆ دەگرێ:** جێهێشتنی شوێنێکی دیاریکراو و گەیشتن بە شوێنێکی دیکە. ئەو شوێنەی کە کۆچکەران جێی دەهێڵن پێی دەوترێ شوێنی ڕەسەن (place of origin)و ئەو شوێنەی کە خەڵکی بۆی دێن پێی دەوترێ شوێنی بۆ هاتوو (place of pesination)، هەروەها کۆچکردن لە شوێنی ڕەسەنەوە پێی دەوترێ کۆچی دەرەکی (out-migration)، کۆچکردن بەرەو شوێنێکی دیکە لەناو یەك وڵات پێی دەوترێ کۆچی ناوخۆیی (in-migration).

## هاوکێشەکانی کۆچکردن

کەبریتییە لە دووبارەبوونەوەی ڕێژەی پرۆسەی کۆچ، بەڵام ڕێژەی کۆچ بریتییە لە دابەشکراوی ژمارەی کۆچکەران بە سەر ژمارەی گشتی دانیشتوان ، چوار ڕێژەی کۆچ هەیە:

ڕێژەی کۆچی دەرەکی= (O) ÷ (P) × (K)

ڕێژەی کۆچی هاتوو = (I) ÷ (P) × (K)

ڕێژەی پوختی کۆچ = (I) - (O) ÷ (P)× (K).

ڕێژەی کۆچی گشتی= (I) × (O) ÷ (P) × (K).

O= ژمارەی کۆچبەرانی ڕۆیشتوو (دەرەکی).

I= ژمارەی کۆچبەرانی هاتوو (ناوخۆ).

P= ژمارەی دانیشتوان لە ناوەڕاستی ماوەی زەمەنی لە ناوچەیەکی دیاریکراو.

K= ژمارەی جێگیر (هەمیشە ١٠٠ یا ١٠٠٠)ە.

دەکرێ ڕێژەکانی کۆچ وەکو ڕێژەیەکی تایبەت هەژمار بکەین، ئەگەر هاتوو ژمارەی سەرە و ژێرە (البسط و **المقام**)، ژمارەی کۆچکردن لە سەرەوە بوو و ژمارەی ژێرەوەش بریتبوو لە هەمان ژمارەی دانیشتوانی ناوچەیەکی دیاریکراو یان بۆ کۆمەڵەیەکی دیاریکراوی دانیشتوان بگەڕێتەوە.

دەکرێ ڕێژەکان تایبەت بن بە تەمەن و پیشە و داهات و نەژاد و جۆر یا هەر دەستەیەکی دیکەی دانیشتوان ئەگەر زانیارییەکان فەراهەم بن.

## ماوەی کۆچ : Migration Interval

لەبەر ئەوەی پرۆسەی کۆچ تایبەتە بە کات، بۆیە پێویستە ئەو ماوە زەمەنییە دیاریبکرێ کە کۆچی تیادا روودەدات یا لەو ماوەیە ئەنجامدەدرێ، هەرچەندێ هەلومەرجەکان هاوشێوە بن، ئەگەر ماوە زەمەنییەکە درێژبوو ئەوە ناوەندی قەبارەی کۆچی سالآنە بچووك دەبێ، چونکە ژمارەیەکی زۆری کۆچکەران بەخێرایی دەگەڕێنەوە شوێنی رەسەنی خۆیان، هەرچەندە دەکرێ زانیارییەکانی کۆچ لەسەر بنەمای رێژەی سالآنەی هەردوو گرووپی کۆچکەران هەژمار بکەین، هەڵبەت ئەگەر ماوەی کۆچی هەردوو گرووپەکە هاوشێوە نەبن، ئەوە ناکرێ بەراورد بکرێن.

## تەوژمەکانی کۆچ و تەوژمە پێچەوانەکانی کۆچ:( migration streams conterstreasm).

ئەو کۆچکەرانەی کە لەناوچە رەسەنەکانی خۆیانەوە لەهەمان ماوەی زەمەنی بەرەو ناوچەیەکی تر کۆچدەکەن، دەکرێ بە بەشێك لە تەوژمی کۆچ دابنرێن، هەروەها ئەو کۆچکەرانەی کە لەهەمان ماوەی زەمەنی دەگەڕێنەوە بۆ ناوچە رەسەنەکانی خۆیان بەشێکن لە تەوژمی کۆچی پێچەوانە. شایانی باسە ئەگەر تەوژمی کۆچی نێوان دوو شوێنی هاوشێوەبوو لەرووی ژمارەوە لەگەڵ تەوژمی پێچەوانە، ئەوە پرۆسەی دەستەبژێری لە کۆچ رۆڵێکی گەورەی هەیە لە روودانی گۆڕانی گەورە لە هەردوو شوێنەکە (رەسەن و بۆهاتوو). بۆ وێنە دەکرێ ناوەندی تەمەنی تاك لە تەوژمی کۆچ بچووکتر بێ لە ناوەندی تەمەنی تاك لە تەژومی پێچەوانە، دەکرێ ئەو جیاوازییە تەمەنیانە کار بکەنە سەر پیتداری، مردن، ئاستەکانی کارکردن، داهات و کۆمەڵێ گۆڕانکاری دیکە لە هەردوو شوێنەکە.



## کۆچی گەڕانەوە: (return migration)

بەگشتی ئەستەمە زانیاری دەربارەی ژمارەی ئەو کەسانەی کە گەڕاونەتەوە بۆ شوێنە رەسەنەکانی خۆیان چنگ بخەین، کۆچی گەڕانەوە تارادەیەك ئاماژەیە بە قایل نەبوونی تاك بە پرۆسەی کۆچ، تەنانەت دەکرێ وەکو ئاماژەیەکیش بە شکستی کۆچ لە تاراوگە دابنرێ، لەبەر ئەوەی ئێمە بەشێوەیەکی گەورە پشت بەزانیارییەکانی سەرژمێری دەبەستین بۆیە ناتوانین جیاوازی لە نێوان ئەو کەسانە بکەین کە بۆ ناوچەیەك کۆچدەکەن، لەسەر بنەمای ئەوەی ئایا لەو ناوچەیە نیشتەجێ دەبن یا نا؟، بێگومان بەشێك لە تەوژمە پێچەوانەکان، کۆچکەرانی گەراوەن بۆ نیشتیمانە رەسەنەکەیان.

## جیاوازی لە کۆچ : (differential migration).

کۆچی دەستەبژێری و جیاوازی لە رێژەکانی کۆچی نێوان دەستە کۆمەڵایەتی و ئابوری و دیموگرافییەکان ، دەکرێ بە جیاوازی کۆچکردن ناوزەد بکرێن، ئەم چەمکە لەکاتی دیراسەکردنی جیاوازییەکانی نێوان پێکهاتەی دانیشتوان و تەوژمەکانی کۆچ بەکاردەهێنرێ.

## کۆچ لە دەوڵەتەوە و کۆچ بۆ دەوڵەت

ئەو کۆچبەرەی لە دەوڵەتەکەی خۆیەوە بەرەو دەوڵەتێکی تر کۆچ دەکات بە کۆچبەرێکی رۆیشتوو دادەنرێ (emigration)، پاشان پێی دەوترێ کۆچی دەوڵەت جێهێشتن (emigration)، بەلاّم ئەو کۆچکەرەی لە دەوڵەتێکی دیکەوە بۆ دەوڵەتێك کۆچدەکات بە کۆچبەرێکی هاتوو دادەنرێ (immigration) پێی دەوترێ کۆچی هاتوو (Immigraion).

## کۆچی نێودەوڵەتی و کۆچی ناوخۆیی

کۆچی نێودەوڵەتی (internantional migration) گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوون لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە دەگەڕێتەوە، کاتێك گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوون لە ناوچەیەکی ئیدارییەوە بەرەو ناوچەیەکی تر لە ناو یەك دەوڵەت ڕوودەدات پێی دەوترێ کۆچی ناوخۆیی (Internal migration)، بەگوێرەی زۆربەی کتێبەکانی کۆچ، ناکرێ کۆچ تەنها دابەشی سەر ناوخۆیی و دەرەکی بکەین، بەڵکو کۆچی ناوخۆیش دابەشی سەر کۆچ لە لادێ-وە بۆ شار و کۆچی نێوان شارەکان دەگرێتەوە، بێجگە لە کۆچی ناو یەك شار.

## شێوازەکانی کۆچ: (migration types)

دەکرێ کۆچ شێوەی جیاواز لەخۆ بگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە توێژەران پێیان وایە تەوژمەکانی کۆچ لەتاکەکان یا لەو خێزانانەی کە بە ئازادی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بار دەکەن، پێکدێ. ڕاستییەکەی ئەوە شێوازێکی تەقلیدیانەی ناسراوی کۆچ نییە، دەکرێ چەند جۆرێکی کۆچ دیاریبکەین: بەم شێوەیە:

١- کۆچی سەرەتایی primitive migration
٢- کۆچی بە کۆمەڵ: mass migration
٣- کۆچی تاکەکەسی: individual migration
٤- کۆچی سنوردار یا کۆت و پێوەندکراو : restricted migration
٥- کۆچی بەزۆرەملێ یا ناچاری : Impelled or forced

## کۆچی سەرەتایی

ئەم جۆرە کۆچە پەیوەستە بەو کەسانەی کەناتوانن مامەڵە لەگەڵ هێزە سروشتییەکانی ژینگە سروشتییەکەی خۆیان بکەن کە تیایدا دەژین، یەکێك لە گرنگترین ئەو ئامرازانەی کە ژینگەی سروشتی مرۆڤ خراپ دەکا، بریتییە لە



بەجێهێشتنی ژینگە. جێهێشتن ئەو کەسانە ئەنجامیدەدەن کە کاریان ڕاوچێتی و کۆکردنەوەی خۆراکە، کاتێك بەرهەمی زەوی و ژمارەی ئەو کەسانەی لەو شوێنە دەژین ناو هاوسەنگ دەبێت پرۆسەی کۆچی سەرەتایی دەست پێدەکات. دەشێ ئەمەش بەهۆی وشکەساڵی و هەڵکشانی کوللە یا بەهۆی فشاری بەردەوامی زۆربوونی خەڵك لەسەر ڕووبەرێکی دیاریکراو و پیتداری زەوییەك بە کتوپڕ ڕوویدا.

## کۆچی بە کۆمەڵ

زۆربەی جووڵە گەورەکانی دانیشتوان و بەشێوەیەکی تایبەت تا سەدەی هەڤدە بە شێوەیەکی سەرەکی لە گرووپەکانی دانیشتوان پێکدەهات، چەمکی کۆچی بەکۆمەڵ بەکۆچی بەکۆمەڵی خێڵ و هۆز یا هەر دەستەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە دەوترا، مێژوو باسی ئەو کۆمەڵگایانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە نیشتیمانی ڕەسەنی خۆیان بەجێ دەهێشت تا لەناوچەیەکی دیکە نیشتەجێ دەبوون یا داگیریان دەکرد، هەندێ جار سوپاکان ناوچەی دیکەیان داگیرکردووە، هەندێ لە سەربازەکان لەو ناوچانە نیشتەجێ دەبوون کە سوپاکەی داگیریان دەکرد. دوای پرۆسەی داگیرکردن، دانیشتوانە ڕەسەنەکانی وڵاتەکەش یا ئەوەتا لەگەڵ کۆمەڵگا تازەکە تێکەڵ دەبوون یا دوور دەخرانەوە یا خۆیان هەڵدەهاتن بۆ ناوچەیەکی تر، لێرەدا شێوازێکی تری کۆچکردن هەیە کە پێی دەوترێت داگیرکردنی ئیمپریالیزمی کە قۆناغی یەکەم: کۆچکردنی بە کۆمەڵی دەگرتەوە، بەلام لە قۆناغەکانی دواتر ئەم شێوازە کۆچکردنە بە شێوەی تاك و خێزان دەهاتنە ئەنجامدان.

## کۆچی تاکەکەسی خۆویستانە

کۆچی تاکەکەسی خۆویستانە وا دەناسرێ کە بریتییە لە کۆچی دانیشتوان بە شێوەیەکی تاکەکەسیانە یا خێزانی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە بەتەواوی خواستی خۆیان و بەبێ دەستێوەردانی ڕەسمی دەوڵەت و بەبێ هیچ فشار و تۆقاندنێك لەلایەن دەوڵەتەوە ئەمە لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی نیشتەجێبوونی کاتی.

لەگەڵ دامەزراندنی کۆلۆنیاڵە سەرەتاییەکان کۆچ لە ئەوروپاوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گرنگییەکی زۆری پێدرا، کە پرۆسەیەکی کۆچ (٣٠-٤٠) ملیۆن خەڵکی لە خۆ دەگرت، گەشەکردنی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ئەو کۆچە ئەوروپاییە دەگەڕێتەوە.

(Gibson – 1970) وای دەبینێ (٤٨٪) دانیشتوانی ئەمریکا ڕچەڵەکێکی ئەوروپییان هەیە، کە لە ساڵی (١٧٩٠-١٩٧٠) پوختەی کۆچ بۆ ئەمریکا (٣٥,٥) ملیۆن خەڵك بووە، لەماوەی (١٩٨٠-١٩٩٠)، هەمان ڕێژە بووە (٣٥,٥)، پەلەکردن لە پرۆسەکانی کۆچکردنی ناوخۆیی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دەیەکانی دوایی بووە هۆی گەشەی دانیشتوان زیاتر لە دەیەکانی ڕابردوو.

## کۆچی سنووردار

کۆچی ئارەزوومەندانە وردە وردە دێتە گۆڕان و کۆچی سنوردار یا کۆت و بەندکراو جێگەی گرتۆتەوە، لەسەرەتای سەدەی بیست، چەندین وڵات یاسا و ڕێسایان دارشت بۆ دیاریکردن یا ڕێکخستنی کۆچی دانیشتوان، هەندێ جار پرۆسەی کۆنترۆڵکردن یا کۆت و بەندکراو و ڕێگرییەکی تەواو دەخاتە سەر کۆچی هەندێ کەس، بەلام لە وڵاتانی دیکە سیستەمی پشك بە سەر کۆچدا جێبەجێدەکرێ.

هەندێ لە توێژەران ئەو کۆت و بەندانەی کە ئەمریکا لە سەدەی بیست خستییە سەر کۆچی نێودەوڵەتی لە ئەنجامی زۆربوونی ژمارەی ئەو خەڵکانە بوو کە دەیانویست لە وڵاتەکانی خۆیانەوە بەرەو ئەمریکا کۆچبکەن، هەمان هەلومەرج لە وڵاتانی دیکە وەك کەنەدا و ئوسترالیا هاتە ئارا، هەڵبەت ئەو وڵاتانە دەرگایان بۆ پێشوازی کۆچکەران لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیست خستەسەر پشت، لە ئەنجامی ئەو سیاسەتانەی کە ئەو وڵاتانە بۆ سنووردارکردنی کۆچ گرتیانە بەر هەندێ لە کۆچکەران ڕێگای نایاساییان گرتەبەر.



جیاوازی و ناهاوسەنگی لە دابەشکردنی دانیشتوان و خۆراك و ئاستەکانی گوزەران هەمیشە هۆکاری فشاری خستۆتەسەر جووڵەکانی کۆچی نێودەوڵەتی، بەتایبەت لە وڵاتانی پێشکەوتوو ڕێژەی گەشەکردنی دانیشتوانیان نزمە، بەلام وڵاتانی تازە پێگەیشتوو بەردەوامن لە ڕێژەی گەشەی ناوەند، بەرزی دانیشتوان، لەو کاتەی کە تێکڕای داهاتی تاك بە شێوەیەکی فراوان لە وڵاتانی پێشکەوتوو بەرز دەبێتەوە، بەشێکی کەمی دانیشتوانەکەیان پاشەکشە دەکات.

## کۆچی زۆرەملێ و کۆچی ناچاری

کاتێك دەوڵەتێك یا هەر دامەزراوەیەکی سیاسی (حزبی دەسەلاتدار) یا کۆمەلایەتی دەبێتە هاندەرێك بۆ کۆچ، ئەو کۆچە پێی دەوترێ کۆچی زۆرەملێ یا ناچارکردن، هەڵبەتە جیاوازییەکی بچووك لە نێوان زۆرەملێ و ناچارکردن هەیە، بەم شێوەیە:

**لەحاڵەتی یەکەمدا (زۆرەملێ):** کۆچبەر مافی مانەوە یا کۆچکردنی هەیە، بەلام ئەگەر ویستی بمێنێتەوە دەبێ ملکەچی سیستەمی دەوڵەتەکە بێت، بەلام لە **حاڵەتی دووەمدا: کۆچی ناچارکردن:** کۆچکەر هیچ مافێکی نییە و خاوەنی هیچ هەڵبژاردنێك نییە هەر دەبێ کۆچ بکا، بۆ وێنە کۆچی پەنابەرە فەلەستینییەکانی ساڵی (١٩٤٨) و ساڵی (١٩٦٧)، لەئەنجامی داگیرکاری ئیسرایلی، زۆرێك لەوان کۆچیان کرد. بەلام هەندێکیان کۆچیان نەکرد بەتایبەت دوای ساڵی (١٩٦٧) و لە ژێر سایەی داگیرکەر مانەوە، بەلام هەندێ یاسا و ڕێسا و هەڵسوکەوتەکانی ئیسرایل ناچاری کۆچکردنی کردن، هەڵبەتە کۆچی ناچاری چەند جۆرێکی دیکەش دەگرێتەوە. بڕێ جار دەوڵەت دەیەوێ کۆمەڵێکی دیاریکراوی تاکەکەسەکانی دووربخاتەوە، چونکە وا هەستدەکات ئەو خەڵکانە مەترسین بۆ سەر وڵات، بۆیە دووریاندەخاتەوە کە پێی دەوترێ کۆچی دوورخستنەوە یا نەفیکردن. شێوازێکی دیکەی کۆچی ناچارکردن هەیە ئەویش گواستنەوەی زۆرەملێی کرێکارانی نا بەهرەدارە بۆ ناوچەیەکی دیاریکراو، وەکو چۆن

لە بازرگانی کۆیلەکان کاتێك ئەوروپاییەکان نزیکەی (٢٠) ملیۆن کۆیلەیان لە رۆژئاوایی ئەفریقیا بەرەو جیهانی تازە گواستەوە، کۆچی پەنابەران بۆتە بەربلاًوترین جۆری کۆچی زۆرەملێ لە نیوەی دووەمی سەدەی بیست، وەك کۆچی پەنابەران لە ئەفغانستان و پاکستان و سودان و یوگسلاڤیای پێشوو.

## راڤەی کۆچ

جوگرافیا یەکێکە لەو بابەتانەی کە بەشدارە لەراڤە و تاوتوێکردنی جۆرەکانی کۆچ، لەروانگەی ئابوورییەوە جەخت دەکرێتە سەر رۆڵی کرێکار و بازاڕی کار، بەلاًم کۆمەڵناسی تیشك دەخاتە سەر گۆڕانە دامەزراوەییەکان، زانستی جوگرافیاش جەخت دەکاتە سەر جیاوازییە شوێنجێییەکانی پرۆسەی کۆچکردن، سەرجەمی ئەو زانستانەش لەکاتی راڤەکردنی پرۆسەی کۆچ بەتایبەت مەسەلەی فەراهەمکردنی زانیاری ورد و تەواو رووبەرووی ئاستەنگ و بەربەست بوونەتەوە.

گرفتگەلێکی زۆری میتۆدی رووبەرووی کەڵك وەرگرتن لە لێکۆڵینەوەکانی تر بۆ پێواندنی فاکتەرە کاریگەرەکانی کۆچ لە هەلومەرجێکی دیاریکراو دەبێتەوە. ئەو گرفتانەش بەربەستێکە لەبەردەم پەرەسەندنی تیۆرەکانی کۆچ، ئەوەش پشت بەو هەلومەرجە دەبەستێ کە کۆچ تیایدا روودەدات، هەروەها پشت بە رادەی فەراهەمبوونی زانیاری لەسەر ئەو فاکتەرانەی لەراڤەکردنی کۆچدا بەکار دەهێنرێن، دەبەستێ.

تەواوی کۆچکردنەکان، بەتایبەت کۆچی نێودەوڵەتی بە گرنگترین گۆڕان دادەنرێت کە دەشێ لە ژیانی مرۆڤدا رووبدات، تەنانەت لە ژێر سایەی هەندێ هەلومەرجی دژواری هەنووکەیدا خەڵکی هەمیشە لە جووڵە و کۆچدان، لە ئێستادا خەڵکێکی زۆر زیاتر لە جاران کۆچدەکەن، دوارۆژیشدا چاوەڕوان دەکرێت جیهان رێژەیەکی زیاتری کۆچ بەخۆوە دەبینێ.



### (راڤنستین) و (لی) راکێشان و وەدەرنان:( revenstien, lee and thepush-pull model):

ئەو هۆکارانەی کە لە پشت کۆچکردنی خەڵکەوەن زۆر و هەمەجۆرن، چەندین تیۆر بۆ راڤەکردنی جۆرەکانی کۆچ پەرەیان سەند، پێشەوای تویژەری بواری تیۆرەکانی کۆچ (ravenstein)ی بەریتانییە، (یاساکانی کۆچ)، راڤنستین لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە (یاساکانی کۆچ)ی دارشت، لەو هەوڵەدا راڤنستین بزاوتەکانی دانیشتوانی لەبەریتانی مەزنی خستە ژێر لێکۆڵینەوە، ئەنجام ژمارەیەکی کەمی تۆمارەکانی کۆچی لە ئینگلتەرا بەدەستهێنا، بەلاًم لەکاتێکی کورت و مەعقولدا لەو تۆمارانە هەندێ بنەمای بەرهەمهێنا و کۆمەڵێك گشتاندنی بلاًوکردەوە و تاکو ئێستاش بەرادەیەکی زۆر بەکاردەهێنرێن، لێرەوە هەندێ لەو یاسیانە دەخەینەروو کە راڤنستین دایڕشتووە:

١- زۆربەی جووڵەکانی کۆچ مەودایەکی دیاریکراو دەگرێتەوە.
٢- ژنان زیاتر لە پیاوان کۆچی کورت مەودا دەکەن.
٣- هەموو تەوژمێکی کۆچ، تەوژمێکی دیکەی پێچەوانەی هەیە.
٤- کۆچ لەناوچە دوورەکانەوە بۆ شار زۆر جار بە قۆناغ روودەدات.
٥- پاڵنەری سەرەکی کۆچ ئابوورییە.

سەبارەت بەو پێنچ یاسایە راڤنستین (١٨٨٩) دەڵێ: "یاسا خراپەکان، باجی زۆر، سروشتی نائاسایی (وشکەساڵی)، ژینگەی کۆمەلاًیەتی نەگونجاو، هەموویان تەوژمی کۆچیان بەرهەمهێناوە و تاکو ئێستاش بەرهەمدەهێنن، بەلاًم لە نێو ئەو تەوژمانەدا تەوژمێك نییە بەو تەوژمە بەراورد بکرێ کە زادەی خواستی هەموو تاکێکە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی ماددی"، جێگای سەرسوڕمانە لەو کاتەوەی راڤنستین ئەو وتارەی نووسیوە و تاکو ئێستاش هەوڵی کەم دراوە بۆ تاوتوێکردنی ئەو یاسایە بە شێوەیەکی فراوانتر یا خستنەرووی یاسایەکی دیکەی سەربارخراو یا بەلای کەمەوە کۆکردنەوەی یاساکانی راڤنستین و خستنەرووی لە چوارچێوەیەکی تیۆریدا، ئەوەش

نەبۆتە رێگر لەبوونی هەندێ هەوڵ لە لێکۆڵینەوەکانی توێژەران سەبارەت بە کۆچ بۆ تێگەیشتن بە گشتاندنی نوێ.

(لی) (LEE) (1966) چوارچێوەیەکی گرنگی خستەروو کە کۆمەڵێك گریمانەی لەسەر قەبارە و تەوژم و تایبەتمەندییەکانی کۆچ لە خۆ گرت، سەرەتا بە پۆلینکردنی ئەو توخمانە دەستی پێکرد کەکاریگەربوون بەسەر کۆچەوە، بەم شێوەیە:

١- ئەو فاکتەرانەی پەیوەستن بە شوێنی رەسەنی کۆچکەران.

٢- ئەو فاکتەرانەی پەیوەستن بە شوێنی بۆ هاتووی (شوێنی دووەمی) کۆچکەران.

٣- ئەو بەربەستانەی نێوان شوێنی رەسەن و شوێنی بۆ هاتوو کە دەبێ کۆچبەر بیانبڕێ و پێیان دەوترێ بەربەستە مەوداییەکان (واتە ئەو بەربەستانەی کە دەکەونە نێوان هەردوو وڵاتەکە) (inter veing obstacles).

٤- فاکتەرە شەخسییەکان:

دانیشتوان بەهۆی چەندین فاکتەرەوە کۆچدەکەن، وەك: گۆڕینی ئەرك و پیشە (لەشێوەی ژمارە (١-٨) ئەو دوو بازنەیە شوێنی رەسەن و شوێنی کۆچ بۆکراو دەردەخا و هێمای سالب و موجب و سفریان تێدایە: هێما موجەبەکان ئەو فاکتەرانەن کەتاك بە باشیان دەزانێ کۆچدەکا و بە پۆزەتیڤ مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، بەڵام ئاماژە سالبەکان ئاماژەن بەو فاکتەرانەی کە لەلای خەڵکی نێگەتیڤن، وەلێ سفرەکان ئاماژەی ئەو توخمانەن کە تاکەکان هیچ گرنگیان پێ نادەن، بەکورتی ئەو کەسەی کۆچدەکا لایەنە ئیجابی و سلبییەکانی شوێنەکەی خۆی و ئەو شوێنەی بۆی دەچێ لێکدەداتەوە و پاشان ئەگەر هاوسەنگی سلبیات و ئیجابییەکان رێگای پێدا بڕیاری کۆچکردن یان مانەوە دەدەن.

تێبینی دەکرێ هەندێ فاکتەر لە شوێنی رەسەن پاڵ بە خەڵکەوە دەنێن، کۆچبکەن، بەڵام لەو ناوچەیەی کە خەڵکی کۆچی بۆ دەکەن فاکتەر هەیە



رایاندەکێشێ، لەگەڵ ئەوەشدا کۆچکەر بەر لەوەی بریار بدات دەبێ هەندێ هەلومەرجی دیکە لەبەرچاو بگرێ وەك بەربەستەکانی نێوان هەردوو لا. ئەو بەربەستانەش ئەمانە دەگرێتەوە: خەرجی گواستنەوە و رێگا، ئەرکی دەروونی وەك دابڕان و غەریبی و دوورکەوتنەوە لە خزم و کەس و کار و کۆمەڵگا بەتایبەت ئەگەر کۆچێکی دوور مەودا بێت. هەروەها بەهۆی هاوسەرگیری و تەلاق و تەواوکردنی خوێندن و خانەنشین و گرفتە یاساییەکان، رەنگە دانیشتوان بەهۆی هەندێ هەلومەرجی دیاریکراوی ناوچەکەی خۆی یا هەلومەرجی ئەو ناوچەی کۆچی بۆ دەکات کۆچبکات، بەهۆی فاکتەرە پێوەندەکانی نێوان هەردوو ناوچەکە. راستییەکەی دانیشتوانی ناوچەیەك هەموویان بەهەمان فاکتەر و هەلومەرج کاریگەر نابن، واتە هەر یەکە وەلامدانەوەی هەمەجۆر و جیاوازیان بۆ هەلومەرجەکان هەیە. (لی) دەریخست هەلومەرج و رەوتی باش هەمیشە راکێشەرە، بەلام کەش و هەوای خراپ خوازراو نییە و هەمیشە وەدەرنەری دانیشتوانە، لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ تەواو لەگەڵ ئەوەدا کۆك بین کە شتێك بەتەواوی خوازراوە یا شتێك بەتەواوی نەخوازراوە، هەندێ لە توێژەران جەخت دەکەنە سەر رۆڵی فاکتەرە ژینگەییەکان لە جۆرەکانی کۆچ.

سەرباری ئەوەش چەندین فاکتەری شەخسی هەن دەشێ کاربکەنە سەر بریاری کۆچکردن، وەك: ئەو کەسەی بریاری کۆچکردن دەدات دەبێ لایەنی تەندروستی، تەمەن، باری هاوسەرداری، ژمارەی منداڵ، لە بەرچاو بگرێ. ئاشکرایە بریاری کۆچ پشت بە چەند شتێك دەبەستێ کە دەبێ هەندێکیان زیاتر روون بکەینەوە.

جێ بەجێکردنی مۆدیلی کێشکردن و وەردەنان دژوارترە لەوەی پێشبینی دەکەین، پێویستە توێژەران ئەو گۆڕانانە لەبەرچاو بگرن کەدەبێ لە ناوچەی رەسەن و ناوچەکەی دیکە بخەنە ژێر پشکنین و پێواندن، ئایا ئەو ماوە زەمەنییە چەندە کە ئەو گۆڕانانەی تیا دەپێورێ، هەروەها چۆن هەندێ پێوەر بخەینە ناو بەربەستە مەوداییەکانەوە.

زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی پەیوەست بە کۆچ کەرتین (cross-sectional) ئەو لێکۆڵینەوانە گۆڕاوەکانی ناوچەی رەسەن و ناوچەی کۆچ بۆکراو بەکار دەهێنن بۆ

روونکردنەوەی سەرهەڵدانی کۆچ لە ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراو (بۆ وێنە لەنێوان دوو سەرژمێری)، زۆربەی مۆدیلە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان تەنها هەندێ باری تایبەتن لە گشتاندنی مۆدیلەکانی کێشکردن و پاڵنەر.

## هەندێ لە هۆکارەکانی کۆچ

کۆچ لە روانگەی تیۆری ئابوورییەوە بریتییە لەو میکانیزمەی کە بەهۆیەوە سامانە مرۆییەکان بۆ باڵاترین پلەی بەکارهێنان دەگوازرێتەوە.

دیاریکەرە سەرەکییەکانی کۆچ: مەودا، جیاوازی لە داهات، بڵاوبوونەوەی زانیاری، جارێکی دیکە زۆربەی کۆچەکان مەودا کورتن یا مەودای نێوان وڵاتە رەسەنەکە و وڵاتەکەی دیکە کورتە، لەگەڵ ئەوەشدا خودی ئەو مەودایە پەیوەستە بە فاکتەرگەلێکی دیکە، بۆ وێنە پەیوەستە بە هەردوو خەرجی ئابووری و دەروونی جووڵە، سەرباری ئەوەش دەشێ مەودا بتوانێ رادەی ئاسانی یا دژواری توانستی کۆکردنەوەی زانیاری لەمەر شوێنە جیاوازەکانی کۆچ بۆکراو دیاریبکات. لێکۆڵینەوەگەلێکی زۆر جەختیان لەسەر ئەوە دەکەن کە باری دەروونی دوورکەوتنەوە لە هاورێیان و دۆستان شتگەلی گرنگن لەگەڵ ئەوەی پێوانەکردنی دژوارە.

هەرچەندە ئەو هۆکارانەی وا دەکەن تاکەکان شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان بگۆڕن زۆر و هەمە جۆرن، بەڵام توێژەران بە شێوەیەکی گشتی کۆکن لەسەر ئەوەی رەفتاری کۆچ دەبێ جەخت لەسەر دوو بڕیاری سەرەکی بکات:

١- بڕیاری گەڕان بەدوای شوێنێکی تازەی نیشتەجێبوون.
٢- گۆڕان و هەڵبژاردنی شوێنێك.

**پاشان دەبێ بڕیاری کۆچکردن و بڕیاری ئەوەی تاك بۆ کوێ کۆچ دەکات، لێکجیا بکەینەوە.**



## رۆڵی زانیارییەکان لە کۆچ

چیتر جیاوازییەکانی داهات ناتوانێ بە شێوەیەکی فراوان زۆربەی جۆرەکانی کۆچ راڤە بکات، هەرچەندە پێشبینی دەکرێ کۆچ زادەی فاکتەری ئابووری بێت. هەروەها زانیارییش رۆڵی هەیە لە بڕیاردانی کۆچ بەتایبەت زانیاری لەبارەی شوێنی کۆچ بۆکراو. خەڵکی نیگەرانن کۆچ بۆ شوێنێك بکەن کە هیچ زانیاریان لەبارەی ئەو شوێنەوە نەبێ یا کەمێکی لێ بزانن. (بیلسۆن) (١٩٥٩) دەریخست ئەو هاورێ و کەس و کارانەی پێشتر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە کۆچیان کردووە سەرچاوەی باشن بۆ زانیاری لەبارەی شوێنە تازەکانی خۆیانەوە. زۆرجار کاریگەری هاورێ و دۆستەکان دەبێتە هۆی خاوکردنەوەی تەوژمی کۆچ بە پێچەوانەی ئەوەی پێشوو. ئێمە دەبینین دابەشبوونی کۆچبەرانی کۆن لاپەرەسەنگە، چونکە ئاماژەیەکی باشە بۆ جۆرەکانی کۆچ لەدوارۆژدا، تەوژمەکانی کۆچ لە سەرەتادا نزیکبوون، چونکە نیمچە بەردەوام و بۆماوەیەکی دوور و درێژبوو. هەر یەك لە (Goss – Lindquist)(1995) دەڵێن: سەبارەت بەکۆچی نێودەوڵەتی پێویستە بڵاوبونەوەی زانیاری و رۆڵی کۆچبەران کە پێشتر کۆچیان کردووە لە پێکهێنانی تۆڕی زانیاری لە بەرچاوبگرین، ئەوەش بەمەبەستی دیاریکردن و دەرخستنی رۆڵی جیاوازییەکانی داهات لە راڤەکردنی پرۆسەی کۆچ.

## کۆچی رەگەز: (جێندەر)

تا ئەم دواییەش زۆربەی لێکۆڵینەوەکان جەختیان لەسەر کۆچی ناوخۆی و نێونەتەوەیی هێزی کار دەکرد. لێکۆڵینەوەکان بە شێوەیەکی سەرپێی گرنگیان بە کۆچی جۆر دەدا، هەر یەك لە (Gastles –Miller) دەریانخست بابەتی جۆر بزربووە، هەروەها بەهۆی رۆڵی تەقلیدی لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکان بەتایبەت بۆ ژنان و دایکان کرێی کەمتریان لە پیاو پێدەدرا، وا تەماشای ژنان دەکرا کە ئاسانتر لە پیاوان کۆنترۆڵ دەکرێن.

مەسەلەکە تەنها ئەوە نییە کارپێکردنی ژنانی پەنابەر لە وڵاتانی پێشکەوتوو تارادەیەك داهاتیان گونجاوترە، وەك پیشەسازی رستن و چنین و خزمەتگوزاری میوانخانەکان و خزمەتکاری و دایەن، بەڵکو لەرووی سێکسییەوە بەکار دەهێنران، لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەبارەی ئەو ژنە کۆچبەرە فلیپینیانەی کە لە یانە شەوانییەکاندا کار دەکەن (tyner -1996) دەڵێ: ئەو کەش و هەوایەی لە پشت هۆکار و پاڵنەرەکانی کۆچەوەیە دەکرێ بە چەند شێوەیەکی زەینی گوزارشی لێبکرێ کە نیاز و ئامانج و پاڵنەرەکانی توێژەر پێچەوانەوە بکاتەوە، هەروەها بۆ رووبەرووبوونەوەی ئەو سیاسەتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەی کە دەکرێ لەوەوە سەرچاوە بگرێ.

## هەڵبژاردنی کۆچ: (یا بریاری کۆچکردن)

کۆچ بە پرۆسەیەکی خۆویستانە (ئنتیقائی) دادەنرێ، (trewatha-1969) بەم شێوەیە باسی کۆچی خۆویستانە (ئینتیقائی) کردووە: گریمان کۆمەڵگا هەیە دانیشتوانەکەی جێگیرە، لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزووی کۆچکردن، هەندێ کەس کۆچدەکەن و ئەوانی تر لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە. ئەو کەسانەی کۆچدەکەن دابەشکردنێکی هەرەمەکی تایبەتمەندییە بایۆلۆژی و کلتوورییەکانی مرۆڤ نانوێنێ، چ لەهەرێمە رەسەنەکە بێت یا ئەو هەرێمەی کۆچی بۆ دەکرێ. ئەوەش لەبەر ئەوەی فاکتەری زیاتر هەیە پاڵ بەو کەسانەوە دەنێت کە دەیانەوێ کۆچ بکەن زیاتر لەوانەی کەنایانەوێ کۆچبکەن، ئەمەیە پێی دەوترێ هەڵبژاردنی کۆچ یا (بریاری کۆچکردن).

راستییەکەی گرنگترین و شیاوترین فاکتەر تەمەنە، کە لە هاتوچۆی ناو یەك وڵات و تەنانەت بزاوتەکانی نێوان وڵاتانیش، زیاتر گەنجان و گەورەکان دەگرێتەوە و ئەوان زیاتر شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان دەگۆرن، گەنجان بە شێوەیەکی گشتی دەتوانن زیاتر لەگەڵ هەلومەرجە تازەکان بگونجێن، چونکە تازە چوونەتەوە ناو بازارەکانی کار و ئاسانتر دەتوانن هەلومەرجی خۆیان بگۆرن، بەهۆی کاریگەری تەمەن بەسەر کۆچکردنەوە دەبینین ئەو ناوچانەی کە ژمارەیەکی زۆری کۆچبەران



روویان تێکردووە، دەبینن پێکهاتەی دانیشتوانیان بەگشتی گەنجن. بەڵام ئەو ناوچانەی کۆچی لێوەکراوە، بەگشتی پێکهاتەی دانیشتوانیان گەورە تەمەنەکانن.

باری خێزاندار: ئەمەش کاریگەری خۆی هەیە بەسەر بریاری کۆچکردن، لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو کۆچ لەناو گەنجە سەڵتەکاندا شوێن خۆی دەکاتەوە. ئەم دیاردەیە پێشتر لە وڵاتانی پێشکەوتوو بەرچاو دەکەوت، لەگەڵ ئەوەشدا لە وڵاتانی پێشکەوتوو هاوسەردارەکان زیاتر لە گەنجان کۆچدەکەن. هەروەها حەقیقەتێکی دیکەی کۆچ هەیە ئەوەش (هەڵبژاردنی رەگەزە) بەلام بوونی تەوژمی کۆچ لە نێوان نێرینەکان و مێینەکان پشت بەچەند فاکتەرێك دەبەستێ: بۆ وێنە: لە ئەورووپا لەسەدەی نۆزدە خەڵکی لە کێڵگەکانەوە بەرەو شار کۆچیان دەکرد، هەڵبەت بە هاورێیەتی ئەو کچە لادێیانەی بە نیازی کارکردن لە شار کۆچیان دەکرد، لەلایەکی دیکەوە کۆچکردن بۆ شارە سنوورییەکانی ئەمریکا تەنها نێرینەکانی دەگرتەوە.

هەروەها پیشە و خوێندەواری دوو توخمی گرنگن لە هەڵبژاردنی کۆچ، کرێکارە نابەهرەدارەکان کەمتر لە کرێکارە بەهرەدار و نیمچە بەهرەدارەکان کۆچیان دەکرد، خەڵکە تەکنیککارەکان بەهرەدارترین پیشەوەر بوون. شایانی باسە لێکۆڵینەوەی زۆر کراوە لەمەر پەیوەندی نێوان خوێندەواری و هەڵبژاردنی کۆچ، ئەو لێکۆڵینەوانەش جەختیان لەسەر لێکچوون و جیاوازی نێوان خوێندەوارەکان و نە خوێندەوارەکان سەبارەت بە مەودا و رێژە و ئاراستەی کۆچ، لێکۆڵینەوەکانی دیکە ئاستی خوێندەواری لە شوێنی رەسەن و شوێنی کۆچ بۆکراو تاوتوێ دەکات. بە شێوەیەکی گشتی کۆچکەران ئاستی خوێندەواریان بەرزترە لەو کەسانەی کۆچ ناکەن، بەتایبەت ئەگەر کۆچەکەر دوور مەودا بێت.

هەڵبەت سەبارەت بە هەڵبژاردنی خوێندەواری جیاوازی لە نێوان کۆچی نێودەوڵەتی و کۆچی ناوخۆییش هەیە. ئەوکۆچکەرانەی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە کۆچ دەکەن هۆشیارتر و خوێندەوارترن لەوکەسانەی هەر لەناو یەك وڵاتدا کۆچ دەکەن. هەروەها کۆچی عەقڵەکان (هجرە العقول) بە شێوەیەکی پێچەوانە کار ناکاتە

سەر ولاّتانی هەژار. بۆ وێنە پێشکەوتنی ناوچەیەك کەڵکی بۆ چەندین ناوچەی دیکە هەیە، ئەو ناوچانەی کە زانایان و توێژەران بۆ خۆی رادەکێشێ بەرهەمهێنترن، رەنگە ئەمە تارادەیەکی زۆر بەکەڵك بێ، بەلاّم راستییەکەی ولاّتانی تازە پێگەیشتوو پێویستییەکی زۆریان بەو شارەزایی و لێهاتوییە تەکنیککارانە هەیە کە دەتوانن بەشدار بن لە پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەلاّیەتی ولاّتەکانیان.

شایانی باسە هەرچەند ئابووری جیهانی بە جیهانیتر بێ کۆچ لە نێوان ولاّتانی پێشکەوتوو زیاتر دەبێ، تەنانەت کۆچ لە ولاّتانی هەژارەکان بەرەو ولاّتە دەوڵەمەندەکان زیاتر دەبێ.

## ئەنجامە کەڵەکەبووەکانی کۆچ

کۆچ چەندین بابەت بۆ لێکۆڵینەوەی جوگرافی دەردەخسێنێ، تاکو ئێستا جوگرافیناسان بە شێوەیەکی سەرەکی تیشك دەخەنە سەر پاڵنەرەکانی کۆچ و ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی دەرپەڕینی کۆچ لە نێوان ناوچە جیاوازەکان. لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ کۆچ لە هەلومەرجە دیموگرافی و کۆمەلاّیەتی و ئابوورییەکانی ناو کۆمەڵگاش بگۆڕێ، هەروەها لەبەر ئەوەی کۆچ پرۆسەیەکی ئارەزوومەندانەیە و گۆڕانکاری لە شوێنی رەسەن و شوێنی کۆچ بۆکراو دروستدەکات، کاریگەری ئەو گۆڕانانەش پشت بە چەند فاکتەرێك دەبەستێ، بۆ نموونە: لەبەر ئەوەی زۆربەی کۆچکەران گەنجن بۆیە کۆمەڵگای رەسەن کاریگەرە بە دیاردەی بەساڵاچوان و بوونی گەورە تەمەنەکان، لە ناوچە دەشتاییە فراوانەکانی ئەمریکا کاریگەری ئەو گۆڕانانە بە روونی بەرچاو دەکەوێ، لە ژێر سایەی ئەوەشدا پێکهاتەی دانیشتوانی گەورەتر دەبێ و رێژەی مردن بەرز دەبێتەوە و لەدایکبوون کەم دەبێتەوە، بەلاّم لەو ناوچانەی پێشوازی لە کۆچکەران دەکرێ کاریگەرییەکە پێچەوانەیە، بۆیە کاریگەری کۆچ تەنها مەسەلەی ژمارە نییە، بەڵکو هەڵبژاردنی تەمەن و رەگەز و نەژاد و هۆشیاری و داهات و تەنانەت بیروباوەریشە.



کۆچ و ئەو شتانەی پابەندن بە کۆچەوە تێکەڵەیەکی مرۆیین و چەندین ئەنجامیان هەیە. شێوازێکی ئاڵۆزی تێکەلاّوبوونی نێوان فاکتەرە جوگرافی و دیموگرافی و کۆمەلاّیەتییەکان هەیە کە ئەویش کاریگەری هەمەجۆری لێدەکەوێتەوە. گرنگترین بابەتی جوگرافیناسەکان: ئەو کاریگەرییە کە کۆچ بەسەر شوێن و ژمارەی دانیشتوانەوە جێی دەهێڵێ، ئەویش بە دوو شێوە:

**یەکەم:** ئەگەر شوێنی کۆچ بۆکراو ژمارەیەکی زۆر کۆچبەری بۆ خۆی راکێشا، ئەوە شار و شارۆچکەکانی و تەنانەت لادێکانیشی فراوان دەبن، وێڕای ئەوەش ناوچەی تازەش دروستدەبێ و ئەوەش کار دەکاتە سەر دابەشبوونی دانیشتوانی و چڕی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە.

**دووەم:** بە پێچەوانەوە ناوچە رەسەنەکانی ئەو کۆچبەرانە کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان و نزمبوونەوەی چڕی بەخۆیانەوە دەبینن، گەشەکردن و کەمبوونەوەی دانیشتوان ئاڵوگۆڕی ئابووری و کۆمەلاّیەتی بەرچاویان لێدەکەوێتەوە. جوانترین نموونەش بۆ ئەمە: ئەو کاریگەرییە کە کۆچ بەسەر هەر یەك لە ئیرلەندا و ویلایەتە یەکگرتووەکان لە سێ بەشی دەیەی سەدەی نۆزدە بە جێیهێشت.

لە ئێرلەندا زیاتر لە ولاّتانی دیکە کۆچکرا، ژمارەی دانیشتوانی ئەو ولاّتە لە (٨) ملیۆنەوە لە ساڵی (١٨٤١) دابەزی بۆ (٤) ملیۆن کەس. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە نزیکەی (٥) ملیۆن کەس بەرەو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆچیانکرد، چەند ملیۆنێکی دیکەش بەرەو ئوسترالیا و کەنەدا و ئینگلتەرا کۆچیانکرد.

زۆرێك لە توێژەران پێیان وایە کۆچکردن لە ولاّتانی پڕ دانیشتوان شتێکی ئیجابییە، لەناوچە هەژارنیشینییەکانی ئیتاڵیا راستەوخۆ دوای جەنگی دووەمی جیهانی ژمارەیەکی زۆری کۆچبەر بەرەو دەرەوە کۆچیان کرد، ئەو کۆچکردنە بووە هۆی کەمبوونەوەی فشاری سەر دەرامەت و سامانەکانی ئەو ناوچەیە، ئیدی ئەو ناوچانە بوونە ناوچەی داهاتی بەرز. هۆکارێکی دیکە کە بووە هۆی ئەوەی رەوشی کۆچکردن لە ئیتاڵیا بکەوێتە ژێر لێکۆڵینەوە ئەوەبوو ئەو ئیتاڵیایانەی لە دەرەوە

دەژیان ماڵ و سامانەکانی خۆیان بۆ وڵاتەکانیان دەناردەوە و بەمەش بارگرانی سەر تەرازووی (المدفوعات) دەرەکییەکانی سەر ئیتاڵیایان سووك دەکرد. هەندێ وڵاتی دیکەش ئەو هەلومەرجەی ئیتاڵیایان بەخۆوە بینی، جوانترین نموونەش میسر و ئوردنە، لە ساڵانی (١٩٨٦) ناردنەوەی پارەی ئوردنییەکان لەدەرەوە بۆ ئوردن (٣٢٪) تەرازووی (المدفوعات)ی دەرەکی ئوردنی پڕ دەکردەوە.

دەکرێ کاریگەرییە کەڵەکەبووەکانی سەر کۆچ لە چەند لایەنی جیاوازەوە لێك بدەینەوە لەبارەی ئەو گۆڕانەوە بکرێ کە بەسەر دەوروبەری شارە گەورەکاندا هاتووە. لە ئەنجامی پرۆسەی کۆچ چەندین شارۆچکە لە دەوروبەری شارەکان و پایتەختەکاندا دروستبوون و ئەو شارۆچکانەش بوونەتە شوێنی کۆبوونەوەی نەژادی و ئیتنی و شێوەی دیاریکراو و تایبەتیان بەخۆوە گرتووە. ئەم جۆرە پەیوەندیانەی نێوان کۆچی ناوخۆیی بۆ دەوڵەت و ئاڵوگۆرە ناوخۆییەکانی پێکهاتەی دانیشتوان شایانی گرنگیپێدانێکی زیاترە.

لەسەر ئاستی خێزانیش توێژەران لەو کاریگەریانەیان کۆڵیەوە کە بەسەر خێزاندا دێت کاتێك سەرۆکی خێزان یا ئەندامێکی خێزانەکە کۆچدەکات، ئەو کەسانە چییان بەسەر دێت کاتێك خێزانەکەی خۆی لە وڵاتەکەی خۆی جێدەهێڵێت؟ زۆربەی جاریش نێرینەکان کۆچدەکەن و ئەو ژنانە بەجێدەهێڵن و ژنان دەبنە سەرۆکی خێزان، راستییەکەی ئێمە ئەگەر جەخت بکەینە سەر خێزان لە وڵاتانی تازەپێگەشتوو کە نێرینەکان لێیانەوە کۆچدەکەن تا لە وڵاتانی پێشکەوتوو کەڵك لە هەلی کار وەربگرن. یا ئەگەر تیشك بخەینەسەر خێزان لە ناوچە شارنشینییە گەورەکاندا، دەبینین رۆڵی ژنان و مناڵان گۆڕانیان بەسەردا دێت. ئەگەر لەلایەن ئەندامەکانی خێزانەکەیانەوە کە کۆچی کردووە پارەیان بۆ نەیەتەوە رەنگە داهاتی ئەو خێزانە کەمبێتەوە. هەروەها هەلومەرجی مناڵانی ئەو خێزانە شپرزە دەبێت، لەسەرجەم کۆمەڵگا هەژار و دەوڵەمەندەکاندا دەبینین مناڵان بڕینی رێگای خۆیان بەرەو گەنجایەتی و پێگەیشتن زۆر بە دژواری دەبڕن و بەرێدەکەن.



## کۆچی نێودەوڵەتی

بۆ پۆلینکردنی جوولە هەمەجۆر و ئاڵۆزەکانی دانیشتوان رێگا و شێوازی هەمەجۆر هەیە، رەنگبێ بڵاوترین پۆلینیش دابەشکردنی جوولەکانی دانیشتوان بێ بەسەر دوو شێوازی سەرەکیدا: کۆچی نێودەوڵەتی و کۆچی ناوخۆیی.

## سروشتی ناجێگیری کۆچی نێودەوڵەتی

هەرچەندە کۆچە نێودەوڵەتییەکان بەکۆنی مێژوو کۆنە، کەچی زانیاری لەمەر قەبارە و سروشتی ئەم جۆرە کۆچانەی بەر لەسەدەی نۆزدە زۆر کەمە. بەڵگە شوێنەوارییەکان ئاماژە بەوە دەدەن باو وباپیرانمان ماڵ بە کۆڵ بوون، مرۆڤ لە چینەوە بەرەو ئەفریقیا و ئەوروپا و جاوە کۆچی کردووە، دەشێ ئەمریکاییە رەسەنەکان لە کۆتاییەکانی چەرخی پلایستۆسین بە رێگای پردی زەمینی لە سیبیریاوە بەرەو ئالاسکا کۆچیان کردبێت.

کۆچکردن لە ئەوروپا بە گەورەترین کۆچ دادەنرێ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. کەلە سەدەی شانزەوە دەستی پێکردووە و تا نیوەی یەکەمی سەدەی بیست بەردەوام بوو. خەملاندنەکان ئاماژە بەوە دەدەن نزیکەی (٦٠) ملیۆن ئەوروپایی ئەوروپایان بەجێهێشتووە. سەرەکیترین ناوچە کە کۆچبەران کۆچیان لێوەی کردووە: ئەڵمانیا، روسیا، پۆڵەندا، ئیسپانیا، ئیتاڵیا، نەمسا، هەنگاریا، پورتوگال، سوید، هۆڵەندا و دورگەی بەریتانیا بووە. بەڵام ئەو وڵاتانەی کۆچیان بۆکردووە: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەنەدا، ئوستralیا، نیوزلەندە، بەرازیل، ئەرجەنتین، هیندی رۆژئاوایی بەریتانیا و باشووری ئەفریقیایە. کۆچکردن لە ئەوروپا تا سەرەتایی سەدەی نۆزدە تارادەیەك لەسەرخۆ بوو، بەڵام دوای ئەوە فاکتەرگەلی زۆر هاوکاربوون لە تەشەنەکردنی کۆچکردن، بە تایبەت: نزمبوونەوەی مردن لە سەرەتای سەدەی نۆزدە کە بووە هۆی زۆربوونی دانیشتوان لە ئەوروپا. هەروەها ئەوروپاییەکان هەستیان دەکرد لە دەرەوە ژیانی باشتر هەیە و ئەو زەوییانەی ئەودیو دەریا زیاتر سەرنجی

رادەکێشان. هاوکات پەرەسەندنێکی تەکنەلۆژی بەسەر بەکارهێنانی کەشتی بازرگانی هات کە پرۆسەی کۆچکردنی بەرەو جیهانی نوێ ئاسانتر کرد.

کۆچکردنی نێودەوڵەتی لە ئاسیا کەم بوو بە بەراورد بەو کۆچە بە کۆمەڵە گەورەیەی کەلە ئەوروپاوە دەکرا. بۆ وێنە لە چینەوە نزیکەی (١٢) ملیۆن کۆچبەر بەرەو باشووری رۆژهەلاّتی ئاسیا (تایلاند و ڤێتنام و مالیزیا و فلیپین و ژاپۆن و کەمبۆدیا و کۆریا و پاکستان و سەیلان) کۆچیان کردووە. (هەڵبەت بەهۆی فاکتەری مەودای جوگرافیاوە)، بەلاّم کۆچکردن لە چینەوە بەرەو دەرەوەی کیشوەری ئاسیا هەر ملیۆنێك کەس دەبوو، وەلێ کۆچ لە ئەفریقیا جیاوازبوو لە کۆچی ناوچەکانی دیکەی جیهان، زۆربەی کۆچی ئەفریقیاییەکان بە زۆرەملێ بوو، لەماوەی نێوان هەردوو سەدەی شانزە و نۆزدە نزیکەی (٢٠) ملیۆن کۆیلە لە ئەفریقیاوە گوێزرانەوە بۆ جیهانی نوێ.

شایانی باسە چوار یەکی ئەو کۆیلانە لە میانی گواستنەوەیان لە زەریای ئەتڵەسی مردن، ئەو کۆچەش لە رووی قەبارە و رووبەرەوە گەورەترین و درێژترین کۆچی کۆیلە بوو لە مێژوودا.

## کۆچە نێودەوڵەتییەکان لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانییەوە:

کۆچی نێودەوڵەتی هاوچەرخ شێوەی هەمەجۆری بەخۆوە دەبینێ، جووڵەی پەنابەران روخسارێکی سەرەکی جووڵەکانی کۆچ بوو لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی، هەڵبەت دوو جووڵەی سەرەکی هەیە:

**یەکەم:** راگواستنی دانیشتوان لە نێوان هیندستان و پاکستان لە نیمچە دوورگەی هیندی.

**دووەم:** هەڵکەندنی ئەوروپاییەکان لە رۆژهەلاّت و ناوەڕاستی ئەوروپا، کە بە خاڵێکی چارەسەر بۆ گرفتی کەمایەتییەکان لەم هەرێمانەدا لە پێش جەنگی دووەمی جیهان دادەنرێت.



ئەوەکۆچکردنانە زۆرەملێ بوون، چونکە کۆمەڵگاکان بەتەواوەتی لە دانیشتوانەکانیان پاك دەکرانەوە، سەرجەمی کۆچەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی وەکو کۆچە زۆرەملێیەکانی رۆژهەلاّت و ناوەڕاستی ئەوروپا توندوتیژ و تراژیدی بوون، نزیکەی (٧) ملیۆن ئەوروپایی لە نێوان (١٩٥٦-١٩٧٠) بەرەو نیوزلەندە و کەنەدا و ویلایەتە یەکگرتووەکان و باشووری ئەفریقیا و ئەمریکای لاتین کۆچیان کرد. لە ئوستراليا و باشووری ئەفریقیا ئەو هەولّە فراوانە دەردەکەوێ کە ئەو ولاّتانە خستیانە گەر بۆ بەلای خۆداراکێشانی ئەوروپاییەکان و ئەو دوو دەوڵەتە سیاسەتێکی دیاریکراویان هەبوو بەرامبەر بە کۆچ ئەویش سیاسەتی نەژادی سپیی بوو. پاشەکشەی کۆچبەرانی ئەوروپی بەرەو ئەمریکای لاتین دەگەڕایەوە بۆ زۆربوونی هەلی کار لە ولاّتانی باشووری ئەوروپا کە لە رووی جوگرافییەوە. نزیك بوون لە ولاّتانی دیکەی ئەوروپا. وێڕای ئەو رێوشوێنانەی کە هەندێ ولاّتی ئەمریکای لاتین دەیانگرتەبەر بۆ کەمکردنەوەی کۆچ بۆ ولاّتەکەیان. زانیارییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە زیاتر لە دوو ملیۆن ئەوروپی لە باشووری ئەوروپا بۆ باکوور و رۆژئاوایی ئەوروپا کۆچیان کردووە، هەڵبەت لە شەستەکانی سەدەی بیست. لە شەستەکان کۆچ تەنها بە ئاراستەی ئەمریکای باکوور و ئوستراليا بوو. بەلاّم قەبارەی کۆچی ئەوروپا لە حەفتاکانی سەدەی رابردوو لە کورتی دا.

لەم دەیانەی دوای لە ئاسیا گرنگی کۆچی هێزی کار پەرەی سەند، هەروەها لە باشووری رۆژهەلاّتی ئاسیا بۆ رۆژهەلاّتی ناوەڕاستیش هەمان شت بوو، پەرەسەندنی خێرایی ئابووری لەو هەرێمانە (باشووری رۆژهەلاّتی ئاسیا و رۆژهەلاّتی ناوەڕاست)، بووە هۆی داواکردنی هێزی کار، ئەوەش هانی کۆچی نێودەوڵەتی کرێکارانی ولاّتە هەژارەکانی بۆ ولاّتە دەوڵەمەندەکاندا، پێکهاتەی تەوژمەکانی کۆچ بۆ ئەو ناوچانە بە درێژایی کات دەگۆڕێ، زۆربەی پرۆژە بیناسازیی و بونیادنانەوەییەکان لە قۆناغی سەرەتای پەرەسەندندا بوو و بەوەش نێرینەکانی زیاتر لە مێینەکان بەلای خۆدا رادەکێشا. بەلاّم لەگەڵ زۆربوونی سامانەکانی ئەو ناوچانە و پەرەسەندنی پرۆژە خزمەتگوزارییەکان بە شداریکردنی ژنان

زۆرتر بوو و ئەو هەرێمانە دەستیانکرد بە راکێشانی کۆچبەرانی ژن. لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە تەوژمەکانی کۆچکردن لە ماوەیەکی دووروودرێژدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە رێژەی رەگەز بە درێژایی کات لەبەرژەوەندی مێینەکان دەگۆڕێ، تەنانەت ئەگەر ژمارەی کۆچکەران هەروەك خۆی بمێنێتەوە.

## کۆچی پەنابەران (جۆرێکی تایبەتی کۆچ)

پرۆتۆکۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٦٧) بەم شێوەیە پێناسەی پەنابەرانی کردووە: پەنابەر ئەو کەسەیە کە لە ترسی چەوساندنەوە لە دەرەوەی وڵاتە رەسەنەکەی خۆی نیشتەجێیە، ئەو کەسە بەهۆی ئەو ترسەوە ناتوانێ کەڵك لەو پارێزگارییە وەربگرێ کە دەبێ دەوڵەتەکەی پێی بەخشێ".

ئەو پەنابەرانەی کە سنووری وڵاتەکانی خۆیان بەرەو وڵاتگەلی تر بڕیوە، نزیکەی (٢٥) بۆ (٣٠) ملیۆن دەخەملێنرێن، وێڕای ئەوەش نزیکەی (٢٥) ملیۆن پەنابەر هەر لەناو سنووری وڵاتەکانی خۆیان بوونەتە پەنابەر و باریان کردووە، کە پێیان دەوترێ هەڵاتووەکان.

ئاشکرایە لە ئەنجامی جەنگ و قات و قڕی و ئاشوب ژمارەی پەنابەران لە ناوچەگەلی وەك (بۆسنە و رواندا) زیادیکردووە، لەم ساڵانەی دوایی جوگرافیناسان زیاتر گرنگیان بەو مەسەلەیە داوە.

(kloit -1987) تیشکی خستۆتە سەر ئەوەی لەسەرەتای سەدەی بیستەوە جیهان کۆچکردنی (١٠٠) ملیۆن پەنابەری بەخۆوە بینیووە.

پەنابەرانیش وەکو کۆچکەرانی دیکە کاریگەریان بەسەر هەر یەك لەو ناوچانەی کە بۆی دەچن و ئەو ناوچانەی لێوەی دەڕۆن بەجێ دەهێڵن، زۆرجار پەنابەران لە ناوچەیەك بەهۆی ململانێوە کۆچدەکەن تا لە شوێنێکی دیکە دووچاری ململانێ نەبنەوە. هەروەها (kloit -1987) تیشکی خستۆتە سەر گرنگترین هۆکارە سەرەکییەکانی جووڵەی پەنابەران:



١- گرفتگەلی ئیتنی و ئایینی و نەژادی ناو وڵاتێك.

٢- جەنگە ناوخۆیی و ئیقلیمییەکان: رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، باشووری ئەفریقیا، یوگسلاڤیای جاران.

٣- ئاڵوگۆڕی سیاسەتی نەژادپەرستی چەندین حکوومەت لە ئاسیا و ئەفریقیا گرنگترین ئەو لێکۆڵینەوانەی مەسەلەی پەنابەرانیان تاوتوێکردووە. ( zolberg et al-1989) کە ئاماژەی بە گرنگی هەڵبژاردنی پێناسەیەك بۆ پەنابەران کردووە لەکاتی دیراسەکردنی ئەو بابەتە. پێناسەکردنی پەنابەران هەندێ مەترسی سیاسی لە خۆگرتووە، چونکە کار دەکاتە سەر رێرەوی لێکۆڵینەوەکە.

توێژەران پێیان وایە پێویستە چاوبە پێناسەی پەنابەر بخشێنرێتەوە کە کێ (پەنابەر)ە، ئەوەش بەهۆی گۆڕینی سیستەمی جیهانی، هەروەها توێژەران دەڵێن لەکاتی دیراسەکردنی پەنابەران پێویستە تیشك بخرێتە سەر رەگ و ریشە سەرەکییەکانی پەنابەربوون، وەك برسیەتی و ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنی ئەو سیاسەتانەی کە ئازاری پەنابەران کەم دەکاتەوە.

## کۆچ بەرەو ئەمریکا (وڵاتی کۆچکردووان)

لەماوەی هەردوو سەدەی نۆزدە و سەرەتایی سەدەی بیست کۆچ رۆڵێکی بنەڕەتی گێڕا لە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەگەر ئەو کۆچکردنە نەبوایە گەشەکردنی دانیشتوانی ئەمریکا زۆر لەسەرخۆ دەبوو. هەروەها لەوانەبوو پێکهاتەی تەمەنی و ئەتنۆگرافی و نەژادی و رەگەزی دانیشتوان جیاواز دەبوو لەوەی ئێستا.

دەکرێ مێژووی کۆچکردن بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان دابەشی سەر چوار قۆناغ بکەین:

١- قۆناغی نیشتەجێبوون

٢- قۆناغی کۆچی کۆن

٣- کۆچی تازە
٤- کۆچی کۆت و بەندکراو.

لە سێ قۆناغی یەکەمدا خەڵکی بە ئازادی دەهاتن و دەچوون بەڵام قۆناغی کۆتایی کۆت و بەندی فراوان خرایە سەر کۆچکردن. ئەو کۆچبەرانەی لە ماوەی قۆناغی کۆلۆنیالیزمدا بەرەو ئەمریکا کۆچیان دەکرد رووبەرووی رەوشێکی زۆر جیاواز دەبوونەوە لەو کەسانەی کە پێشتر گەیشتبوونە ئەمریکا، زۆربەی ئەو کۆچبەرانەی سەردەمی زووتر گەیشتبوونە ئەمریکا بە رەگ و رچەڵەك بەریتانی بوون، سەرباری کۆمەڵی ئەڵمانی و سویدی و فەرەنسی و ئیسپانی. لە (١٨٠٠-١٨٨٠) کۆچ بەردەوام بوو، زۆربەی کۆچبەرانیش (٩٥٪) یان لەبەشی باکوور و باکووری رۆژئاوای ئەوروپاوە هاتبوون، گەورەترین ئەو رێژەیەش بەریتانی بوون، بەڵام کۆچی نوێ دوای ساڵی (١٨٨٠) دەستیپێکرد. لەو مێژووە بەدواوە زیاتر لەبەشی رۆژهەڵات و باشووری ئەوروپاوە کۆچ دەکرا و کە بەرادەیەکی زۆر زیاتر بوو لە کۆچی کۆن. لەسەرەتای بیستەکان نزیکەی (٩) ملیۆن کۆچبەر بەرەو ئەمریکا کۆچیان کرد. دوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانی قۆناغی کۆچی کۆت و بەندکراو، دەستیپێکرد، ئەمریکا کۆت و بەندی خستەسەر ژمارە و تایبەتمەندی ئەو کۆچبەرانەی وەریدەگرتن و بۆ ئەوەش سیستەمی پشکی بەکارهێنا، ویلایەتە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی زیاتر لە ئاسیا و ئەمریکای لاتین کۆچبەران بەلای خۆیدا رادەکێشا.

## کۆچی نایاسایی بەرەو ویلایەتە یەکگرتووەکان

دوای ئەوەی یاسای کۆچکردن دانرا چیتر گرنگی بەو کۆچبەرانە نەدەدرا کە بە یاسایی دەگەیشتنە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵکو تیشك خرایە سەر ئەو کۆچبەرانەی بە رێگای نایاسایی دەگەیشتنە ئەمریکا، زۆرێك لەو فاکتەرانەی کۆچی یاسایی راڤە دەکەن خودی ئەو فاکتەرانەن کە دەکرێ کۆچی نایاساییمان بۆ



روونبکاتەوە جگە لە جیاوازییەکی جوگرافی بچووك نەبێ کە خۆی لە مەودا دەنوێنێ. فاکتەرە راکێشەر و دەرەکییەکان لە شوێنە رەسەن و کۆچبۆکراو تاکو ئێستا گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ کۆچبەرە یاسایی و نایاساییەکان، کۆچبەری نایاسایی لە نیشتیمانی خۆیدا رووبەرووی هەلومەرجی دژوار دەبێتەوە و هەوڵدەدا لە رێگای کۆچەوە بە سەریاندا زاڵبێت، کێشەی کۆچبەرانی نایاسایی تەنها پەیوەست نییە بە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، بەڵکو هەندێ لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین و ئاسیا و ئەوروپاش رووبەرووی ئەم گرفتە بوونەتەوە. فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئوستڕالیا رووبەرووی ئالۆزی و پشێوی سیاسی راستەوخۆ بوونەتەوە، سەربژاردەکانی ئەو وڵاتانە نیگەرانن بەبوونی کۆچبەرانی بۆ هاتوو بۆ وڵاتەکانیان، بە تایبەت ئەوانەی بە شێوەی نایاسایی دەچنە ژوورە، ئەوروپا کۆت و بەندی توندوتۆڵی خستۆتە سەر کۆچی نایاسایی، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ راپۆرت ئاماژە بەوە دەدەن نزیکەی نیو ملیۆن کۆچبەری نایاسایی لە دروستکردنی رێگاوبان و باڵەخانە و کشتوکاڵ و میوانخانەکان و خزمەتگوزاری گشتی لە ئەوروپادا کار دەکەن. گرنگی بە کۆچی نایاسایی بۆ ئەوروپا لە بەستنی کۆنگرەی سەرۆکی وڵاتانی ئەوروپا لە حوزەیرانی (٢٠٠٢) بۆ چارەسەرکردنی ئەو بابەتە، رەنگیدایەوە.

ویلایەتە یەکگرتووەکان ژمارەیەکی زۆری کۆچبەری نایاسایی بەلای خۆیدا راکێشاوە. هیچ راپۆرتێکی رەسمی لە بارەی ژمارەی کۆچبەرانی نایاساییەوە نییە، بەڵام خەمڵاندنە نا رەسمییەکان ژمارەی ئەو کۆچبەرە نایاساییانە بە (١٠) ملیۆن کۆچبەر دەخەمڵێنێ. زۆرترین رێژەی کۆچبەری نایاسایی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە مەکسیکەوە دێن، وێڕای خراپی رەوشی ئابووری مەکسیك کورتی مەودای نێوان ئەو دوو وڵاتەش رۆڵی گرنگی هەیە لە دروستبوونی ئەو حاڵەتە.

## کۆچی ناوخۆیی

رێژەیەکی زۆری کۆچبەران سنووری وڵاتانی خۆیان نابڕن بۆ ئەوەی بچنە وڵاتێکی دیکە، تەنها لەناو سنووری وڵاتەکانی خۆیان کۆچدەکەن، نموونەی ئەو جۆرە

کۆچکردنەش بە ئەستەم پێوانە دەکرێ، مەگەر لەو وڵاتانە نەبێ کە سەرجەم جووڵەکانی دانیشتوان بە وردی تۆمار دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان زانیاری سەرژمێری دانیشتوان و رووپێوی خولیانە و دەستەبەری کۆمەلایەتی و مۆڵەتی شۆفێری بە دەست بخەین، هەندێ وڵاتی ئەوروپیش هەن (وەك وڵاتە ئەسکەندەناڤییەکان) شوێنی نیشتەجێبوونی سەرجەم هاوڵاتیان تۆمار دەکەن و شوێنی تازەی کۆچبەرانیش تۆمار دەکەن.



## جۆرە گشتییەکانی کۆچی ناوخۆیی

دەکرێ هەندێ گشتاندن لەمەر جۆرە جوگرافییەکانی کۆچی ناوخۆیی دابرێژین، بۆ وێنە دەبینین یەکێك لە جووڵە سەرەکییەکانی هەنووکە: بریتییە لە کۆچی دانیشتوان لە لادێ-وە بۆ ناوچە شارنشینییەکان، ئەو جووڵەیەش لە ئەنجامی تێکەڵبوون و چوونە ناویەکی چەندین فاکتەرن، بەتایبەت ئاڵوگۆڕی چالاکی ئابووری لە کاری کشتوکاڵییەوە بەرەو چالاکی خزمەتگوزاری و پیشەسازی لە شارەکان. (zelinsky-1971) ئاماژە بەوە دەدات ئاراستەی یەك لایەنە بەرەو شار زەمین لەرزەیەکی گەورەی لەگەڵ خۆی هێناوە، کە بۆتە هۆی زیانگەیاندنێکی زۆر بەو کۆچبەرانەی کە لە لادێ-وە دەچن بۆ شار، ئاوەدانکردنەوەی ناوچەیەکی نوێ، هێزێکی سەرەکی بوو لە جێ نشینکردنی ژمارەیەکی زۆر لە شارەکان، جووڵەی سەرکێشەکان (المغامرين) لە کۆلۆنیاڵە یەکەمەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ئاراستەی رۆژئاوایی ئەمریکا و تەنانەت تا کەنارەکانی زەریای هێمن، هاوشێوەیە لەگەڵ هەرێمەکانی دیکەی وەك رۆژئاوایی بەرازیل، و گواستنەوە بۆ باشووری رۆژئاوایی کەنەدا و باکووری ئوسترالیا و گواستنەوە لە چیای ئەندێزەوە بۆ کەنارەکان و دارستانە ناوخۆییەکانی ئەمریکای لاتین، هەروەها لە یەکێتی سۆڤیەتی جارانیش کۆچی ناوخۆیی لە رۆژئاواوە بەرەو رۆژهەلاّت بە ئاراستەی سیبیریا بوو.

### کۆچ لە لادێ-وە بۆ شار و بەشارنیشنیبوون: بەراوردکردنی هەرێمی:

کۆچ لە لادێ-وە بۆ شار بۆتە هۆی پرۆسەیەکی بەشارستانیبوون لە جیهان، دانیشتوانی جیهان بەگشتی زۆر بەخێرایی زیاد دەکەن، هەرچەندە زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی شارەکان لەم سالأنەی دوایی زۆر زیاترە لە رێژەی گشتی دانیشتوان. (northam)ی جوگرافیناس دەڵێ: دەکرێ لە رووی مێژووییەوە لە میانی سێ قۆناغەوە لە پرۆسەی شارنشینی بروانین:

١- **قۆناغی یەکەم:** دانیشتوان بە شێوەیەکی بەربلاّو لە کشتوکاڵدا کاریان دەکرد.

٢- **قۆناغی دووەم:** قۆناغی خێرابوون، لەم قۆناغەدا بەشێکی گەورەی دانیشتوانی لە شار نیشتەجێبوون. لە میانی ئەم قۆناغەدا پرۆسەی گۆڕان دابەشبوونی دانیشتوان لە جیهان دەستیپێکرد. هاورێ لەگەڵ زۆربوونی دانیشتوانی شارەکان لە (٢٥٪)ەوە بۆ (٧٠٪). ئەم قۆناغە دووبارە بونیادنانەوەی ئابووری و ئاڵوگۆڕی خێرای کشتوکاڵ بۆ پیشەسازی لەگەڵ خەستبوونەوەیەکی ئاشکرای چالاکییە ئابوورییەکانی شار لە خۆ دەگرێ، زۆرێك لە دانیشتوان لە پیشەسازی بەرهەمهێنان و خزمەتگوزاری و چالاکی بازرگانیدا کار دەکەن.

٣- **بەلاّم قۆناغی سێیەم:** قۆناغی کۆتاییە و لەم قۆناغەدا دانیشتوانی شار گەیشتە نزیکەی (٦٠-٧٠٪) لە کۆی دانیشتوان، لە هەندێ حاڵەتدا دەگاتە (٨٠٪)، کاتێك چەماوەکە (المنحنى) دەگاتە زیاتر لە (٧٠٪) بەرەو پانبوونەوە (**التفلطح**) (واتە فراوانبوونی دەرەکی) لار دەبێتەوە بۆ وێنە ژماوەی (منحنى) شارنشینی لە ئینگلتەرا و وێڵز لە ساڵی (١٩٠٠) بەرەو (**التفلطح**) رۆیشتن دوای ئەوەی ژمارەی دانیشتوانی شار گەیشتە (٨٠٪) لە تێکڕای دانیشتوان.

لەکاتی ئێستادا دەکرێ قۆناغێکی دیکە سەربار بخەین کە تیایدا دانیشتوان لەناوچە ئابوورییە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان بلاّودەبێتەوە. (berry-1980) تێبینی کردووە: شارنشینی و پرۆسەی چڕبوونەوەی دانیشتوان، پرۆسەی دژە

شارنشینی بە دوادا دێ، واتە قۆناغی دووبارە دابەشبوونەوەی چڕی دانیشتوان یا دووبارە بلاوبوونەوەی چڕی دانیشتوان.

وەکو ڕێسایەکی گشتی وڵاتە پێشکەوتووەکان بە قۆناغی کۆتایی شارنشینیدا تێپەڕیوون، لەبەرامبەردا وڵاتە تازە پێگەشتووەکان تاکو ئێستا بە قۆناغی خێرابووندا تێدەپەڕن، لەگەڵ ئەوەی دەکرێ بوترێ هەندێ وڵات تاکو ئێستا لە قۆناغی یەکەمدان، چونکە بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە کشتوکاڵ دەبەستن.

## شارنشینی لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو

گەشەکردنی شارە گەورەکان تایبەتمەندییەکی دیاری وڵاتە تازە پێگەشتووەکانە، بەلاّم شارنشینی پرۆسەیەکی بەردەوامە لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو، سەدەی بیست بەسەدەی ئاڵوگۆڕی شارنشینی دادەنرێ، لە کۆتایی سەدەی بیست نزیکەی سێ ملیار خەڵك (نزیکەی نیوەی دانیشتوانی جیهان) لە شارەکاندا دەژین، سێ بەشی ئەوانیش لە وڵاتانی تازە پێگەیشتووی ئەفریقیا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین، لە قاهیرە و شاری مەکسیك و ریۆدی جانیرۆ و مۆمبا و پەکین، هەروەها شارە هەزارە پڕ دانیشتوانەکانی دیکە، هەڵبەتە ئەو شارانە لێوانلێون لەو گرفتانەی کە باس ناکرێن.

بەراستی لە هەندێ ناوچە گرفتی سەرسوڕهێنەر ڕوویداوە، بۆ وێنە (کلکتا) خەڵکی بەیانیان زوو دەچوون بۆ سەر جادەکان تا ئەو مردییانە بشارنەوە کە شەوانە نەیانتوانیوە بمێننەوە و گیانیان لە دەست دابوو.

جووڵەی دانیشتوان لە کێڵگە و لادێکان بۆ شارەکان کاردانەوەی خراپی لێکەوتەوە، هۆکاری فشاری دانیشتوان و بێکاری لە ناوچە لادێیەکان کۆچی بە خێزانە لادێیە هەژارنشینەکان کرد تا کۆچبکەن، ئەوەش بە هیوای بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەرانیان لە شارەکان، بۆ بەدبەختیش لەشارەکان کار بەدەست نەدەکەوت و لە ئەنجامیشدا بەرزبوونەوەی بێکاری و ئەوەش لە ئەنجامدا بووە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی بێکاری و گەشەی هەرەمەکی دانیشتوان لە شارەکان. بێگومان شارنشینی



خێرا بەشێوەیەکی بەشەکی زادەی گەشەی خێرایی دانیشتوانە لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان. شیکردنەوەیەکی گەشەی دانیشتوان دەریخستووە وێڕای قەبارەی گشتی دانیشتوان لەو وڵاتانە بەرێژەی (٢,٥٪) گەشەی کردووە، ڕێژەی گەشەی دانیشتوانی ناوچە شارنشینییەکان دووجای ڕێژەی گەشەی گشتی دانیشتوانە.

چونکە نزیکەی نیوەی گەشەی دانیشتوانی شارەکان دەگەڕێتەوە بۆ کۆچکردن لە لادێ-وە بۆ شارەکان و ئەوی تریش دەگەڕێتەوە بۆ زۆربوونی گەشەی سروشتی.

## جۆرەکانی ئێستای شارنشینی

بەر لە ساڵی (١٩٧٥) زۆرینەی شارنشینییەکان کەوتبوونە وڵاتە پێشکەوتووەکان. لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە بە گوێرەی خەملاندنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاڵوگۆڕێکی گەورە ڕوویداوە، بەجۆرێك زۆرینەی دانیشتوانی شار لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان دەژین.

لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-٢٠٠٠) شارنشینی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان هەشت ئەوەندەی لێهاتووە، بەلاّم لەبەرامبەردا ئەو ڕێژەیە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان دوو ئەوەندە بۆتەوە، کەوایە لە کۆتایی سەدەی بیست، سێ بەشی دانیشتوانی شار (شارنشینی) کە زیاتر لە (٣) ملیارە لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو دەژین بەبەراورد بە دانیشتوانی ساڵی (١٩٥٠) کە سێ بەشی دانیشتوانی شار لەو وڵاتانە دەژین.

پرۆسەی شارنشینی لە وڵاتانی پێشکەوتوو تارادەیەك بەرزە، هەڵبەت لەو وڵاتانە لەسەرەتای پرۆسەی پەرەسەندن، شارنشینی بەهێواشی بەرێوەدەچوو، پاشان لەگەڵ دەستپێکردنی پرۆسەی بەپیشەسازیبوون بە شێوەیەکی توند بەرزبۆوە، دواجار کاتێك گەیشتە قۆناغی تێربوون جارێکی تر هێواش بووەوە، هەروەها بەهۆی نزمی ڕێژەی شارنشینی لە ئەوروپا دامەزراوەی سیاسی و ئابووری و کۆمەلاّیەتی دەرکەوتوون کە بە شێوەیەکی بەرچاو لە ناوچە شارنشینییەکان تەشەنەیان کردووە، لەبەرامبەردا گەشەی شارنشینی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان لە ژێر سایەی ڕەوشێکی زۆر

نالەباردا روویداوە، (beier-1976) کۆمەڵێك فاکتەری تاوتوێکردووە کە بەهۆیەوە گەشەی خێرایی شارنشینی گەشەی درامی لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکان پێ لێکتر جیا کردۆتەوە:

**یەکەم:** زۆربوونی گەشەی دانیشتوان لەسەدەی بیست تاکە فاکتەری گرنگە لە شارنشینی لە رابردوو و ئێستادا لێکترجیادەکاتەوە، رێژەی گەشەی دانیشتوان لە ئەوروپا لەمیانی شارنشینبوونیاندا سالانە نزیکەی (٥,٠٪) بوو، بەلام ئێستا رێژەی گەشەی دانیشتوان لە ولاتانی تازە پێگەیشتوو گەیشتۆتە (٣٪) و زیاتریش، لە ئەفریقیا رێژەی گەشەی سروشتی گەیشتۆتە (٢,٥٪). هەروەها رێژەی گەشەی دانیشتوانی بەرز واتە ولاتانی تازە پێگەیشتوو زیادبوونێکی سروشتی بەرزیان هەیە لە شارەکان و کۆچکردنی دانیشتوانیش زیاتر بەرەو شارەکانە، پاشان زیادبوونی سروشتی و کۆچ، فشاری زیاتریان خستۆتە سەر شارەکانی جیهانی سێ.

**دووەم:** بلاوبوونەوەی ئامرازەکانی پەیوەندی هاوکاربووە لە پێدانی زانیاری و ئاسانکاری و هەلی رەخساو لە شارەکان بە دانیشتوانی ولاتانی تازە پێگەیشتوو، وێرای راکێشانی دانیشتوانی لادێکانی بەرەو شار، هاوکات ئەگەر ئامرازە نوێیەکانی گواستنەوە لەبەر چاو بگیرێن تێچووی کۆچکردن کەمە.

**سێیەم:** بە پێچەوانەی پرۆسەی شارنشینی لە ولاتە پێشکەوتووەکان شارنشینی لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکان لەناو سنورێکی ئیداری جێگیر قەتیس بووە، هەروەها دانیشتوان بواری کەمیان بۆ دەرەخسێ بەرەو ولاتانی دیکە کۆچبکەن.

پێدەچێ ولاتانی تازە گەشەسەندوو لە پرۆسەی شارنشینبوون دووچاری دژوارییەکی زۆر ببنەوە، بەبەراورد لەگەڵ ولاتە پێشکەوتووەکان.

کەوایە لە نێوان هەموو ولاتێك و یەکێکی دیکە جیاوازی هەیە، نزیکەی نیوەی دانیشتوانی شار لە شار لەدایك دەبن، بەلام نیوەی دیکە کۆچبەری هاتوون، ئەو شارنشینییە تازانە بە گشتی نا بەهرەدار و هەژار و کەم هۆشیار و نەخوێندەوارن، منالان و ژنانیش زیاتر ئازار دەچێژن، تەنها دەکرێ پێشبینی نزمبوونەوەی پیتداری



ئەو کەسانە بکرێ ئەگەر هاتوو سوودیان لە ئەزموونی شارنشینی خۆیان وەرگرت، ئەو نزمبوونەوەیەش لە زۆربەی ولاتانی جیهانی سێیەم شتێکی زەرووره، ئەگەر ئەو ولاتانە بیانەوێ خۆیان لە رێژەی بەرزی مردن بپارێزن، هیندستان نموونەیەکی باشە بۆ بەراوردکردنی شارنشینی ولاتە تازە پێگەیشتووەکان لەگەڵ ئەزموونی شارنشینی ولاتانی ئەوروپی لە قۆناغی یەکەم.

لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیست رێژەی شارنشینی لە هیند (١١٪) بوو، بەلام لە ولاتانی ئەوروپی لە ماوەی (١٨٥٠-١٩٠٠) گەیشتە ئەو رێژەیی شارنشینی، وێرای ئەو ئاستەی شارنشینی کەچی (٥٠٪) ی دانیشتوانی ولاتانی ئەوروپی بۆ گوزەرانی خۆیان پشتیان بە کشتوکاڵ دەبەست، لەبەرامبەردا (٦٠-٧٠٪)ی دانیشتوانی هیند لە هەمان ئاست جوتیاربوون، هەروەها لە (١٠٪) ئەوروپییەکان لە پیشەسازیدا کاریان دەکرد، لەبەرامبەردا (٢٥٪) ئەوروپییەکان لە پیشەسازیدا کاریان دەکرد.

هەروەها ولاتانی تازە پێگەیشتوو گەشەکردنێکی خێرای شارنشینیان بەخۆوە بینیوە لەگەڵ جیاوازییەکی گەورە لە فراوانبوونی شارنشینی و لەدەرامەتی پێویست بۆ ئەو فراوانبوونە.

لە ولاتانی تازە پێگەیشتوو زیاتر لە یەك ملیار کەس لە شار و شارۆچکەکان نیشتەجێن، ژمارەشیان زۆر بە خێرایی زیاد دەکات، لەگەڵ کۆتایی سەدەی بیست (١٧) پایتەخت لەکۆی (٢٣) پایتەخت زیاتر لە دە ملیۆن خەڵکیان لێ دەژیت، ئەو (١٧) پایتەختەش هەموویان لە ولاتانی تازە پێگەیشتوون. هەر شارێکی ئاسایی لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکان زۆر زەبەلاحترە لە هەر شارێکی سەرەکی لە ولاتانی پێشکەوتوو، لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا زۆر گەورەتر دەبن.

بەرواروردکردنی هەندێ شار بۆ ئێمە بە کەڵك دەبێ: بۆ وێنە: شاری مەکسیك گەورەترین کۆبوونەوەی شارنشینە لە ولاتە تازە گەشەسەندووەکان لە ساڵی (٢٠٠٠) ژمارەی دانیشتوانی مەکسیك بووە بە (٢٥) ملیۆن خەڵك. کەچی لە ساڵی (١٩٥٠)

(٤) ملیۆن کەس بووە و قەبارەی دانیشتوانەکەی چارەگی دانیشتوانی نیویۆرك بووە. یەکەم شاری شارنشینی لە ساڵی (٢٠٠٠) تۆکیۆ بوو کە ژمارەی دانیشتوانەکەی گەیشتە (٢٦) ملیۆن کەس، دوای ئەویش شاری (ساوپاولو) دێ کە دانیشتوانەکەی (٢٣,٩) ملیۆن کەس بوو، هەر لە ساڵی (٢٠٠٠) چڕی دانیشتوان لە شارە گەورەکان لەولاتانی پێشکەوتوو و تازە پێگەیشتووەکان لە یەك ئاستدا بوو. ئەو شارەی زیاتر لە (٥) ملیۆن کەس لێی دەژین زۆرترین زۆربوونی دانیشتوان بەخۆوە دەبینێ بەتایبەت لە ولاتانی تازە پێگەیشتووی ئاسیا و ئەمریکای لاتین.

زۆربەی زیادبوونی دانیشتوانی شار لە میانی فراوانبوونی شارەکانی ئێستا دەردەکەون، شار هەیە زۆر تازەنیە و دروستبوونی پشت بەمەوادی فەراهەمبوونی دەرامەتی تازە دۆزراوە دەبەستێ. هەروەها لەبەر ئەوەی زۆربەی پێگە شارنشینەکان بوون بە سەنتەری شارنشینی، هەروەها لەبەر ئەوەی تێچوونی فراوانبوونی ئەو ناوچانە کەمترە لە دروستکردنی سەنتەرێکی شارنشینی تازە، چاوەڕوان ناکرێ سەنتەری شارنشینی نوێ دەربکەوێ.

## ڕۆڵی کۆچ لە شار

وەکو پێشتر تێبینیمان کرد کۆچ لە دێ-وە بۆ شار فاکتەرێکی کاریگەر و سەرەکییە لە گەشەی شارنشینی، هەروەها کۆچ بەهێزێکی پاڵنەر دادەنرێ لەزۆربەی ولاتان، هەروەك چۆن ڕێژەی پیتداری بەرز و بێکاری بەرز وا لە ناوچە لادێ-یەکان دەکات نەویستراو بن، گرنگی کۆچ لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی دیکە و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە دەگۆڕێ، لە ئەمریکای لاتین و ناوچەکانی دیکە ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوانەکانیان لەناوچە شارنشینییەکاندان و ئەمەش وایکردووە لە کۆتایی سەدەی بیست، کۆچ لە لادێ-وە بۆ شار کەمبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کۆمەڵگایانەی ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوانیان کشتوکاڵین وەك ئەفریقیای پشت بیابان، کۆچ هەمیشە ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ لە گەشەی شارنشینی و جۆرەکانی دابەشکردن بۆ ماوەیەکی درێژ.



هۆکارەکانی پشت کۆچی خەڵك زۆر و هەمەجۆرن، بەڵام فاکتەری ئابووری و خواستی گوزەرانی بەرزی تاکەکان و خێزانەکان وەکو فاکتەری باو دەمێننەوە، زۆربەی جارەکان دەرچوونی کۆچبەران بۆ باشترکردنی ئاستی ئابوورییان دێتە دی، کۆچبەران لە ژینگەی ئابووری وکۆمەڵایەتی و کلتووری هەمە جۆر کۆچ دەکەن و بەر لە کۆچ و دوای کۆچیش پێکهاتەیەکی فراوانی هەمەجۆری کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن، پێشبینییەکانی کۆچ گرنگن بۆ ڕاڤەکردنی هۆکارە شوێنییەکانی پشت گەشەی خێرای شارە گەورەکان و شارە بچووك و مامناوەندییەکان لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکان.

کۆچ زۆرجار لەسەر شێوەی قۆناغ بە قۆناغ دەردەکەوێ، لەلادێ-وە بۆ شارۆچکە بچووکەکان و پاشان بۆ شارە گەورەکان لە قۆناغی یەکەمی قۆناغی شارنشینی (shaw-1975) بەڵگەکان جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کۆچبەران کاتێك لە شارە بچووکەکانەوە دەچن بۆ شارە گەورەکان زیاد دەکەن، هەڵبەت چەند هۆکارێك هەیە بۆ ئەو شوێن گۆڕینە وەك هەلی ئابووری و باشتربوونی ئامرازەکانی پەیوەندی و گواستنەوە لە شارە گەورەکاندا.

## ئاراستەکانی کۆچ لە ئایندەدا

سروشت و مەودای کۆچ لە دوارۆژدا بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە فاکتەری ژینگەیی و گەشەی دانیشتوان دەبەستێ.

هەروەها هیچ ناوچەیەکی فراوانی کراوەی ڕەخساو نییە تا کۆچی بۆ بکرێ. لەگەڵ زیاتر کەمبوونەوەی دەرامەتەکان و زۆربوونی فشاری دانیشتوان پێشبینی دەکرێت بەرێژەیەکی زۆر کۆچکردن بەردەوام بێ، بۆ گەڕان بەدوای پەناگە و خۆراك و ئاستی باشتری گوزەران، لەسەر ئاستی کۆچی نێودەوڵەتی کۆچی ئارەزوومەندانە بەهۆی ململانێی نێوان پێداویستییەکانی کۆمەڵگا و مافەکانی تاك دژوارتر دەبێ. هەروەها گەشەی بەردەوامی دانیشتوان و بەفیڕۆچوونی دەرامەتەکان بەرێژەیەکی بێ وێنە و جیاوازی هەمەجۆری ئاستەکانی گوزەران لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە و

ناسەقامگیری سیاسی ئەمانە سەرجەمیان پەیوەستن بە پرۆسەکانی کۆچەوە، هەروەها جوولەی بەردەوامی دانیشتوان لەسەر هەموو پێوەرەکان بەردەوام دەبێ، ئەگەر چی تاکەکان بەدوای باشترین ڕێگادا دەگەڕێن بۆ باشترکردنی ژیانیان لەم جیهانە پان وبەرینەی تیایدا دەژین و ئاڵۆزی و تێکچڕژانییەکان زیاتر دەبێ.

سیستەمی گواستنەوە و پەیوەندی باشتر هەمیشە کاریگەرە بەسەر قەبارە و ئاراستە و تەوژمەکانی کۆچ، یەکێك لە نوێترین تەکنەلۆژییەکانی پەیوەندی ئینتەرنێت و ئەو پێگانەیە کە کاریگەرترین شتن بەسەر جوولەکان و کۆچی کرێکارانی نێودەوڵەتی.



## بەشی نۆیەم

# دانیشتوان و ژینگە

تاكو ئێستا لێكۆڵینەوەكەمان لایەنی دیموگرافی جوگرافیای دانیشتوانی تاوتوێ كردووە، بۆیە لەم بەشە و بەشی دواتریش پەیوەندی نێوان سیستەمی دیموگرافی (بەتایبەت گەشە) و هەردوو سیستەمەكەی دیكە: سیستەمی ژینگە و فەراهەمبوونی خۆراك دەخەینە بەرباس كە تا رادەیەك تێكەڵ بەیەكتربوونە. تەندروستی ئەو دوو سیستەمە كار لەسەر هەموویان دەكا، هەروەها زۆر گرنگیشن ئەگەر بمانەوێ رەگەزی مرۆڤ بەردەوام بێ.

پەیوەندی هەمبەری نێوان گەشەی دانیشتوان و نەمانی دەرامەت و ژینگە بۆتە جێگای گرنگیپێدانی چەندین زانا بە جوگرافیناسانیشەوە.

هەندێ لەو زانایانە پێیان وایە هۆكاری زۆربەی كێشە ژینگەییەكان گەشەی دانیشتوانە، ئەو زانایانە مالتۆسییە تازەكان بەرابەرایەتی (پۆڵ ئارلخ)، گفتوگۆی ئەوەیان كردووە گەشەی دانیشتوان فاكتەری سەرەكییە لە داروخانی ژینگە بەتایبەت كاتێك گەشەكردنی دانیشتوان دەوڵەمەندیشی لەگەڵدا بێت، لەدایكبوویەك لە هیندستان بەدرێژایی ژیانی زیانێكی كەم بە ژینگە دەگەیەنێ بەبەراورد بە لەدایكبوویەك لە ویلایەتە یەكگرتووەكان.

## گەشەی دانیشتوان و داروخانی ژینگە

زۆربەی بەڵگەكان ئاماژە بەوە دەدەن گەشەی دانیشتوان و زۆری پیسبوون لەسەرەتای شارستانیەتەكانەوە شان بەشانی یەك رۆیشتوون، هەروەها لەگەڵ زۆبوونی ژمارەی دانیشتوان و زۆربوونی چڕی جۆگرافیان، ئەگەری داروخانی سیستەمی ژینگە زۆرتر دەكا.

## چەند رەهەندێكی گرفتەكە

دەشێ داروخانی ژینگە بۆ كۆمەڵێ فاكتەر بگەڕێتەوە، وەك: پیسبوون، قەرەباڵغی و توندوتیژی، بڕینەوەی دارستانەكان، بەرزبوونەوەی گەرمی زەوی و كونبونی ئۆزۆن، لەوەڕاندنی بێ بەزەییانە، هەروەك لەم بەشەدا ئەو فاكتەرانە و كۆمەڵێ ئەنجامی

کەڵەکەبووی سەر چالاکییە مرۆییەکان بە درێژایی هەزاران ساڵ دەبینین کە هەندێکیان لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و پیشەسازی زیاتر لاسەنگ دەبن.

## پیسبوون

یەکێك لە ئەرکە گرنگ و سروشتییەکانی سیستەمی ژینگە، هەڵمژینی پاشەڕۆکەکانە، لەگەڵ ئەوەی دەکرێ پاشەڕۆك وەکو بوونەوەرێکی زیندوو بچێتە ناو بوونەوەرێکی دیکە، بەڵام کاتێك پاشەڕۆ دەگاتە ئەو خاڵەی کە سیستەمی ژینگە ناتوانێ هەڵیمژێ، دەبێتە پیسی.

ئێمەی مرۆڤیش بەرێژەیەکی بێ وێنە زەوی پیس دەکەین، هەڵبەت هۆکاری زۆر هەن بۆ ئەو پیسبوونە کە دەکرێ دابەشی سەر دوو بەش بکەین: بایۆلۆژی و کیمیاوی (لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ ژاوەژاو و هەژێنەکانی دیکە بە پیسبوون دابنرێن)، زۆرجار چڕی دانیشتوان دەبێتە هۆی زۆربوونی پیسبوونی بایۆلۆژی، ئاپۆڕە و قەرەباڵغی زۆری مرۆڤ لە شوێنە بچووکەکان دەبێتە هۆی زۆربوونی پیسی لە هەموو شوێنێك، لەگەڵ زۆربوونی دانیشتوان پاشەڕۆ ئۆرگانییەکانی مرۆڤ زۆرتر دەبن، دەکرێ ئاوی شارێك پیس بێ کاتێك ناکرێ خۆمان لە بڕێکی زۆری پاشەڕۆ رزگار بکەین.

پیسبوونی کیمیاوی کە بەرهەمێکی لاوەکی گەشەی دانیشتوانە، هاوکات لەگەڵ تەکنەلۆژیای تازە، ژمارەیەکی زۆری رووبار و دەریاچەکان لە ئەنجامی پاشەڕۆ کیمیاوییە ژەهراوییەکان پیس دەبن، بۆ نموونە — نموونەیەکی زۆر دڵهەژێنە- ئەوەی لە کەنداوی (مناماتا)ی ژاپۆن روویدا کە پاشەڕۆ پیشەسازییەکان کە هەڵگری (جیوە)ن فڕێدەدرێنە ناو ئاوی راوکردنی ماسی، راوچییەکانیش بەردەوامن لە خواردنی ماسی، دواجار هەزاران حاڵەتی نەخۆشی لێکەوتەوە، ئێستا بەو نەخۆشییە دەوترێ (نەخۆشی میناتاما)، ئەو نەخۆشییە جۆرێکە لە ژەهراویبوونی جیوەیی.

پیسبوونی هەواش کاریگەرە بە گەشەی دانیشتوان و چڕی جوگرافی دانیشتوان، یەکێك لە هۆکارەکانی گۆڕانی کەش و هەوا چڕبوونەوەی مرۆییەکانە لە ناو



سەنتەرەکانی شارنشینی، ئەو کۆمەڵبوونە مرۆییانەش هەڵگری ملیۆنان بوونەوەری زیندووی مایکرۆسکۆپی و گازی وەك دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئۆکسیداتی نایترۆجین و چەندین جۆری دیکەی پێکهاتەی کیمیاوین، بە دووەم ئۆکسیدی کبریتیشەوە.

مەودای بینین کاریگەرە بە تەمی دووکەڵاوی، ئەو پیسبوونانە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر مرۆڤەوە هەیە کە دەشێ ببێتە هۆی هەڵگلۆفینی چاو و هەلومەرجی مەترسیدار، شایانی باسە ساڵانە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئەنجامی پیسبوون (٥٠٠٠٠) مرۆڤ دەمرن، کەدەکاتە (٢٪) لە مردنی ساڵانە.

زۆربوونی ژمارەی مرۆڤ و دەرهاویشتە پیشەسازییەکانی سەدەی رابردوو بوونە هۆی پیسبوونی ژینگە کە ئێستا بۆتە گرفتێکی جیهانی. بەردەوامبوونی گەشەی دانیشتوان و زۆربوونی داخوازی لەسەر خۆراك و پەناگە و کالاکانی دیکە و خزمەتگوزارییەکان وای لێهاتووە کەمکردنەوەی پیسی ببێتە کارێکی ئەستەم.

## قەرەباڵغی و توندوتیژی

گەشەی دانیشتوان کاردەکاتە سەر زۆربوونی گرفتەکانی قەرەباڵغی و توندوتیژی لەگەڵ زیاتربووونی فشارخستنە سەر دەرامەتەکان. هەوڵی زۆر دراوە بۆ بەستنەوەی رێژەکانی تاوان بە چڕی دانیشتوان، زانایان تێبینیان کردووە توندوتیژی لەگەڵ زۆربوونی قەرەباڵغی زیاتر دەبێ. ئەوەش بەروونی لەوەدا دەردەکەوێ کە رێژەی تاوان لە ناوچە شارنشینییەکان بەرزترە وەك لە ناو لادێ-نشینەکان.

بەبێ لەبەرچاوگرتنی سروشتی کاریگەری قەرەباڵغی بەسەر رەفتارەکانی مرۆڤەوە، بەڵام بەڵگەی زۆر هەن ئاماژە بەوە دەدەن کە شێوازی ژیانی خەڵك لە زۆربەی ناوچەکان بەهۆی گەشەی انیشتوان و چڕی بەرز، خراپ بووە. هەروەها کار دەکاتە سەر شێوازی ژیان لە شوێنە قەرەباڵغەکان، چونکە گەشەی دانیشتوان کار دەکاتە سەر بەرزکردنەوەی ئاستی توندوتیژی بەرێگای دیکە، وەك زۆربوونی دانیشتوان لەچەندین وڵاتی تازەپێگەیشتوو بەهۆی کەمی دەرامەتەکانەوە.

له روانگەیەکی فراوانتر بۆ جیهان سێ (بەشەکانی دیکەی جیهان) دەردەکەوێ رایەڵەی کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆمەڵگاکان بەهۆی زۆربوونی دانیشتوان و کەمی دەرامەت، زۆربوونی رێژەی تاوان و بڵاوبوونەوەی خێرایی نەخۆشییە تەشەنەسەندووەکانی وەکو ئایدز و ئەو رایەڵە پچڕاوە. شەوانە شەقامە نائارامەکان شتێکی ئاساییە لە زۆربەی شارەکانی ئەمریکا، بەڵام بەراورد ناکرێ بەوەی کە لە شەقامی شارەکانی رۆژئاوایی ئەفریقیا لە دوای رۆژئاوابوون روودەدەن.

## بەرزبوونەوەی گەرمی گەردوون و کونبوونی چینی ئۆزۆن

بەڵگەکان لە زیادبووندان لەسەر ئەوەی مرۆڤ کەش و هەوای چەندین ناوچەی جیهانی گۆڕیوە، ئەو گۆڕانە کەش و هەواییەش کار دەکاتە سەر بەرهەمی خۆراك و تەندروستی مرۆڤ و شێوازی ژیان. ئەگەری ئەوەش هەیە کە کار بکاتە سەر گۆڕینی رێڕەوی پەرەسەندنی ئایندە.

تۆزی بە ئاسماندا چووی ناوچە شارنشینییەکان و زۆربوونی هەڵچوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە ئەنجامی سووتاندنی سووتەمەنییەکان، کار دەکەنە سەر گۆڕینی جۆری باران بارینە خۆجێیەکان و پلەی گەرما. ئەو وردە تۆزەش کە کەش و هەوا وەکو فاکتەرێکی چڕ کاریگەری هەیە، بەوەش باران بارین زۆرتر دەبێ چونکە کاریگەرییەکی ساردکەرەوەش هەیە. هاوکات دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کاریگەرییەکی گەرمکەرەوەی هەیە، چونکە رێ لە چوونە دەرەوەی گەرمی زەوی دەگرێت، وێڕای گازەکانی دیکە.

یەکێك لەو مەسەلە ژینگەییانەی کە لەم ساڵانەی دواییدا گرنگی زۆری پێدراوە بریتییە لە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی گەردوون، بەرزبوونەوەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بە هەوادا، ئەوەش هاوکاتە لەگەڵ زیاتر هەڵچوونی گازەکانی دیکە، هەروەها وێڕای ناتەبابوونی زانایان بەڵام هاوڕاییبوونێك هەیە لەسەر ئەوەی لەسەدەی بیست و یەك پلەی گەرمی گەردوون بەرێژەی (١,٥) بۆ (٤,٥) سەدی بەرز دەبێتەوە.



ئەنجامی بەرزبوونەوەی بێ وێنەی گەرمی گەردوون کارەساتهێنە، هەندێ لەو گۆڕانکارییانەش کە دێنە کایەوە ئەمانەن:

١- بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی زەریاکان و ئەگەری ژێر ئاوکەوتنی ناوچە نزمەکان لە چەندین ناوچەی جیهان (بەتایبەت لەو وڵاتە تازە پێگەیشتووانەی کە ناتوانن خەرجی دروستکردنی رێگر و بەرگە دابینبکەن).

٢- ئاڵوگۆڕ لە بەرهەمە کشتوکاڵییەکان کە پابەندن بە گۆڕانی جۆرەکانی کەش و هەوا.

زاڵبوون بەسەر گەشەی دانیشتوان ئەگەری زۆری هەیە کار بکاتە سەر بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەران و نزمکردنەوەی گرفتە ژینگەییەکانی وەك بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی گەردوون.

زۆرجار بەرزبوونەوەی گەرمی گەردوون و کونبوونی ئۆزۆن تێکەڵ بە یەکتر دەکەین کە لەبنەڕەتدا دوو بابەتی جیاوازن، هەرچەندە هۆکارەکانی کونبوونی ئۆزۆن کاردەکاتە سەر بەرزکردنەوەی گەرمی گەردوون. چینی ئۆزۆن دەکەوێتە ناو بەرگەی گازی، کە زەوی لە چەندین تیشکی سەروو وەنەوشەیی دەپارێزێ کە دەگەنە بەرگەی هەوای سەرەوە. گازی کلۆرین لە کلۆرۆفلۆرد و کاربۆندایە و لەگەڵ ئۆزۆن کارلێك دەکەن و ئۆزۆن تێکدەشکێنن و دەیکەن بە وردە ئۆکسجینی ئاسایی و پێکهاتەی کلۆرین — ئۆکسجینی نا سەقامگیر.

(٩٣) وڵات رێککەوتنامەیەکیان مۆرکردووە بەناوی رێککەوتنامەی (مرۆنتریال)، لەو رێککەوتنامەیەدا جەخت کراوەتە سەر کەمکردنەوەی بڕی کلۆرۆفلۆرد کاربۆن و دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤی دیکە بۆی.

## بڕینەوەی دارستانەکان

زۆربوونی دانیشتوان بەدرێژایی سەدەکانی رابردوو هاوکات بووە لەگەڵ نزمبوونەوەی رووبەری دارستانەکان، دار و درەخت بۆ چەندین مەبەست دەبڕدرێتەوە

وەك دروستكردنی خانوو و بەكارهێنانی وەك سوتەمەنی. هۆكاری یەكەمی بڕینەوەی دارستانەكان پاككردنەوەی زەوییە بۆ كشتوكاڵكردن و كۆكردنەوەی سووتەمەنی، ئەوەش هەر پەیوەستە بە گەشەی دانیشتوان، لە ناوچەكانی جیهان وەكو لە جەزائیر و تونس و مەغریب، دارستانەكان لە (٣٠٪) لەكۆی رووبەرەكەیان داپۆشیوە كەچی ئێستا ناگاتە (١٠٪).

ئەمڕۆ داماڵینی دارستانەكان زۆر خێراترە لە دووبارە چاندنەوەی درەختەكان، وەكو دەشزانین داماڵینی درەختەكان دەبێتە هۆی لافاو و گۆڕینی كەش و هەوای ناوچەی داماڵینی (انجراف) خاك. داماڵینی دارستانەكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆر لەمێژە كاری لەسەر كراوە، هەروەها كشتوكاڵی ناجێگیر لە ناوچە ئیستیوائییەكان بۆتە هۆی لەناوچوونی چەندین دارستان، كاریگەری كشتوكاڵ و بڕینەوەی درەختەكان بۆ دار و پەروەردەكردنی مەڕ و ماڵات هەڕەشەن بۆ لەناوچوونی دارستانە ئیستیوائییەكان كە سەرچاوەیەكی سەرەكین بۆ ئۆكسجین لەجیهان. خەملاندنەكانی ئێستا ئاماژە بەوە دەدەن نزیكەی سێ بەش و نیوی دارستانە ئیستیوائییەكان لەناوچوون، ئەوەش كەماوتەوە هێندەی رووبەری ویلایەتە یەكگرتووەكان دەبێ. لایەنی سەرەكی مەسەلەی داماڵینی دارستانەكان ئێمەی مرۆڤین، ئەگەر نیازی چاك زۆر بێ دەتوانین ئاراستەكە پێچەوانە بكەینەوە و زیانەكان سووكتر بكەین، ئەوەش بە دووبارە چاندنەوەی درەختەكان چ لە شوێنی خۆیان یا لە شوێنی دیكە.

## لەوەڕاندنی دڵڕەقانە

كاریگەری لەوەڕاندنی دڵڕەقانە لەسەر مرۆڤ زۆرتر بووە و تارادەیەكی زۆر لە كاریگەری بڕینەوەی دارستانەكان دەچێ، لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی مرۆڤ بەتایبەت لە ولاتە زۆر هەژارەكان داخوازی لەسەر مەڕ و ماڵات زۆرتر بووە، ئاژەڵەكان سەرچاوەی خۆراك و ئاسایش و هێمای دەوڵەمەندی خێزانن، هەروەها ئاژەڵ وەكو هێزێكە بۆ بەگەڕخستنی كەلوپەلە كشتوكاڵییەكان، زۆربوونی ژمارەی مەڕ و ماڵات وەك مانگا



و بزن دەتوانن ناوچەیەك گیاو گژی سروشتی بڕوتێننەوە، روتاندنەوەی ناوچەكان دەبنە هۆی چۆڕاوگەكردنی زیاتری باران و پرۆسەی داماڵینی خاكیش خێراتر دەكا و رێژەی قوڕ و لیتەش زۆرتر دەكا، نموونەش لەسەر ئەمە زۆرە وەك باكووری ئەفریقیا و ناوچەی كەوانەی پیتی (الهلال الخصیب) و .....هتد.

## لێكۆڵینەوەیەكی جیهانی ساڵی (٢٠٠٠)

لەو لێكۆڵینەوە جیددیانەی بۆ دیراسەكردنی گرفتەكانی دانیشتوان و دەرامەت و ژینگە كراون، لێكۆڵینەوەی جیهانییەكەی ساڵی (٢٠٠٠)ە، ئەم لێكۆڵینەوەیە لەسەر داوای كارتەری سەرۆكی ئەمریكی ئامادەكراوە، لەو لێكۆڵینەوەیەدا چەندین شێوازی هونەری و نموونەیی كۆمپیوتەری بەكارهاتوون بۆ جەختكردنە سەر ئەو ئاراستە و گۆڕاوانەی كە دەشێ تا كۆتایی سەدەی بیست لەدانیشتوانی جیهان و دەرامەتە سروشتییەكان رووبدەن.

ئەو لێكۆڵینەوەیە ئەم ئەنجامانەی لێدەكەوێتەوە ئەگەر ئاراستەكانی هەنووكە بەردەوام بێ:

– ساڵی (٢٠٠٠) زۆر قەرەباڵغتر دەبێ، كەمتر لەرووی ژینگەییەوە سەقامگیر دەبێ و جیهان زیاتر رووبەرووی لێكترازان دەبێتەوە و فشاری زیاتر دەكەوێتە سەر دانیشتوان و دەرامەت و ژینگە، وێڕای فەراهەمبوونی چەندین دەرهاویشتەی ماددی، بەڵام دانیشتوانی جیهان هەژارتر دەبن.

– بەڵام سەبارەت بەسەدان ملیۆن هەژاری بێ ئومێد، رەوشی خۆراك و پێداویستییەكانی دیكە لە ئێستا باشتر نابێ، بگرە خراپتریش دەبێ، ئەگەر پەرەسەندنە شۆڕشییەكانی تەكنەلۆژیا هەڵاوێری بكەین ژیانی زۆربەی دانیشتوانی جیهان لە ئێستا خراپتر دەبێ — كاتی نوسینی ئەم كتێبە- مەگەر جیهان دڵسۆزانە كار بۆ گۆڕینی ئاراستەكانی ئێستا بكەین.

لە نێو زانایان و سیاسەتمەداران خواستێکی زۆرتر لەسەر مەسەلەی گەشەی بەردەوام هەیە، نەتەوە یەکگرتووەکان لیژنەی گەشەی بەردەوامی دامەزراندووە، ئەم چەمکە مانای چییە؟ بەکورتی واتە گەیشتنی جیهان بە گەشەیەکی ئابووری بەبێ داڕووخانی ژینگە یا بەبێ برسیکردنی بە شێکی زۆری مرۆڤایەتی. هەروەك (تۆماس و لبانگس)ی جوگرافیناسان دەڵێن: "ئاشکرایە بیرۆکە لەمەر توانای ئێمەیە لە فەراهەمکردنی پێداویستییە بنەرەتییەکانی دانیشتوانی جیهان، بەتایبەت ئەگەر دانیشتوان لەگەشەکردن بەردەوام بن، بەبێ بەریەککەوتن لەگەڵ ژینگە، ناکرێ زۆربەی ئاراستەکانی ئێستا وا وەسفبکەین کە قابیلی مانەوەن، ئەگەر ئێمە نەتوانین شێوازی ژیانی خۆمان بگۆڕین، داڕووخانی ژینگە تارادەیەك دەبێتە هۆی گەشەسەندنی ئابووری؟

گەشەی هەمیشەیی یا درێژخایەن ئەویش بیرۆکەیەکی ئاڵۆزە، چونکە خۆی لەقەرەی چەندین مەسەلەی ناکۆك دەدا، لە کۆتایی ڕێگا بیرۆکە سیاسییە، گەشەکردن لەبەرامبەر پاراستنی ژینگە، ئازادییە زەرورییەکان لەبەرامبەر کۆنترۆڵکردن، ئەمە مەسەلە ناکۆکهێنەکانە، بەرەوپێشچوونی تەکنەلۆژیا گرنگە بۆ گەشەکردنی هەمیشەیی لە دوارۆژدا، بەبێ دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەو هەرەشانەی زادەی گەشەی دانیشتوانن، داروخانی ژینگە و کڵپەسەندنی ململانێکان، ژیان بەرەو هەڵدێر دەچێ.



# بەشی دەیەم

# دانیشتوان و دەرامەتەکان

## پێشەکی

فەراهەمبوونی خۆراك و دەرامەتەکانی دیکە بۆ مرۆڤ گرفتی تازە نین، لەسەر ئاستی خۆجێی جاری وا هەبووە هەلومەرجی بەرهەمی خۆراك بۆ نزمترین ئاست دابەزیوە، بەجۆرێك پێداویستییە سەرەکییەکانی خەڵکی پڕ نەکردۆتەوە، ئەوەش بۆتە هۆی کۆچکردنی دانیشتوان، وەك ئەوەی لەسەدەی نۆزدە لە ئێرلەندا روویدا، لە چلەکانی سەدەی نۆزدە بە هۆی سەرنەکەوتنی بەرهەمهێنانی پەتاتە لەماوەی پێنج ساڵدا نزیکەی (٨٠٠٠٠٠) کەسی ئیرلەندی کۆچیان کرد، جاری واش هەبووە هەزاران کەس لە برسا دەمردن وەکو ئەوەی لە حەبەشە (ئەسیوپیا) و هەندێ ولاّتی ئەفریقی دیکە روویدا.

هەر لە چوارچێوەی خۆراك و دانیشتوان (رۆبێرت ماڵتۆس) لە ساڵی (١٧٩٨) وتارێکی بەناوبانگی لەبارەی (پرەنسیپی دانیشتوان) نووسی، کە تاکو ئێستا جێگای گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەیە، (ماڵتۆس) دەڵێ: خۆراك بە شێوەیەکی ژمارەیی یەك لەدوای یەك زیاد دەکات (١,٢,٣,٤,٥........هتد)، بەلاّم گەشەی دانیشتوان بە شێوەیەکی یەك لەدوای یەکی ئەندازەیی زیاد دەکات (٢,٤,٨,١٦,٣٢.....هتد)، بۆیە هەر (٢٥) ساڵ جارێك ژمارەی دانیشتوان دووجا دەبێتەوە.

مەگەر هەندێ کۆت و بەند بسەپێنرێ، هەروەها دەڵێ: پێویستە ژمارەی دانیشتوان لەو ئاستە بمێنێتەوە کە دەکرێ خۆراکی تەواوی بۆ دابینبکرێ، هەر لەم بارەوە ماڵتۆس پێشنیاری "رێگری پۆزەتیڤ و ئەخلاقییەکان"ی کردووە وەك دواخستنی هاوسەرگیری تاکو ئەو کاتەی هاوسەرەکان دەتوانن خێزانەکەیان بەرێوە ببەن، ئەوەش دەبێتە هۆی دروستبوونی خێزانی قەبارە بچوك و پێویست ناکات رێگرییەکانی سکپڕی بەکاربهێنن.

(ماڵتۆس) پێی وایە رێگرییە پۆزەتیڤەکان ئەو هۆکارانەن کە دەبنە هۆی کورتکردنەوەی ناوەندی ژیانی مرۆڤ و خراپی باری گوزەران و خراپبوونی رەوشی

کار وا له مرۆڤ دەکات رووبەرووی نەخۆشی و جەنگی و برسیەتی بکاتەوە. ئاشکرایه ئاماژەی سیاسی روون له کتێبەکانی (مالتۆس)دا هەن که چەندین مشتومڕ و خراپ تەفسیرکردنی هێناوەته کایەوە.

ئاشکرایه خەملاندنی پەیوەندی ئایندەیی نێوان دانیشتوان و خۆراك و دەرامەتەکانی دیکه کارێکی دژواره، چونکه ئەو پەیوەندییه پشت به رێژەکانی بەکاربردن و خۆراك و گۆڕانه دانیشتوانییەکان دەبەستێ، لەو گفتوگۆیانەی که کراون، دەردەکەوێ سنورێك بۆ بەرهەمی خۆراکی له هەر ناوچەیەك هەیە، بۆیه بەردەوامبوونی گەشەی دانیشتوان کار لەسەر کەمکردنەوەی فەراهەمبوونی خۆراك بۆ تاك دەکات، تا دەگاته ئەو ئاستەی تاك ناتوانێ خۆراکی خۆی بەدەستبهێنێ، له ئەنجامدا ئەو تاکه دەمرێ جا چ به شێوەیەکی راستەوخۆ بێت یا له برسان یا بەهۆی ئەو نەخۆشیانەی زادەی ئاستی نزمی بەرگرین که بەهۆی بەدخۆراکییەوە دووچاری دەبن.

زۆربوونی رێژەی مردن بەهۆی ئەو هۆکارانەی باسمانکردن بەدوو شێوەیه کار دەکەنه سەر رێژەی پیتداری:

١- مردنی چەندین ژن لەتەمەنی منالبوندا یا هاوسەرەکانیان کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەیه بەسەر ژمارەی مردووانەوە، هەروەها مردنی گەنجان ئەو ژمارەیه بەرزدەکاتەوە که له دوارۆژدا دەبنه دایك و باوك.

٢- چاوەروان دەکرێ ئەم جۆره هەلومەرجه هانی کەمکردنەوەی ژمارەی منالانی لەدایکبوون کەمبکاتەوە، بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاری و زیاتر ئاگاداربوون لەو گرفتانەی که زادەی بەردەوامبوونی گەشەی دانیشتوانن، بەم شێوەیه دەشێ زنجیرەیەك رووداو بەم شێوەیه رووبدات:



زۆربوونی دانیشتوان ← زۆری داخوازی لەسەر خۆراك ←
کەمبوونەوەی پشکی خۆراکی تاك ← زۆربوونی مردن ←
نزمبوونەوەی پیتداری.

هەروەها زۆربوونی مردن و نزمبوونەوەی پیتداری ← نزمبوونەوەی رێژەی گەشەی دانیشتوان.

وێڕای ئەوەش دەکرێ کۆچ رۆڵێکی سەرەکی لەو نزمبوونەوەیەدا بگێڕێ، هەروەها دەکرێ لەحاڵەتی بەدخۆراکیدا بەهۆی لاوازی جەستەوە پیتداری نزمبێتەوە (وەك ئەوەی بەم دواییه له هەر یەك له ناوچەکانی بەنگلادیش و ئەفریقیا بەهۆی برسیەتی و قاتوقڕییەوە روویدا).

## سروشتی دەرامەتەکان و بەکارهێنانیان

گرنگیدان به دەرامەتی نەوەکانی داهاتوو هەمان ئەو گرنگیدانەیه که لەسەردەمی مالتۆس باوبوو، دەکرێ دەرامەتەکان دابەشی سەر دووبەش بکەین:

١- **دەرامەته مرۆییەکان:** لێهاتوویی و توانایی کۆمەڵەی دیاریکراوی خەڵك دەگرێتەوە، وێڕای ژمارەیان.

٢- **دەرامەته سروشتییەکان:** ئەو دەرامەتانەن که خەڵکی له ژینگەی سروشتی دەری دەهێنن وەك ئەو شتانه دەگرێتەوە که پێویستن یا به کەڵکن بۆ مرۆڤ.

## دەرامەته سروشتییەکانیش دابەش به سەردوو جۆر دەبن

١- **ئەو دەرامەتانەی نوێ نابنەوە:** واته دوای دەرهێنانیان دووباره دروستنابنەوە، ئەم جۆره سەرجەم ئەو کانزایانه دەگرێتەوە که بەهۆی تەکنەلۆژیای هاوچەرخ بەخێرایی لەزەوی دەردەهێنرێن، بەتایبەت له ئەنجامی ئەوەی ولاتانی پیشەسازی بەکاربەر داخوازی زۆریان لەسەر ئەو کانزایانه هەیە،

ئەی ئەگەر ولاتانی تازەپێگەیشتوو ببنە ولاتانی پیشەسازی و داوخوازیان لەسەر ئەو کانزایانە زیاد بکات چی ڕوودەدات.

**٢- ئەو دەرامەتانەی تازە دەبنەوە یا دروستدەبنەوە:** بەهەمان ئەو ڕێگایەی بەکارنایەن کە دەرامەتە تازەنەبووەکانی پێ بەکاردەهێنرێ، ئەم دەستەیە خاك و دەرامەتە زیندووەکان دەگرێتەوە (ئەو دەرامەتانەی ڕاستەوخۆ لە شتە زیندووەکانەوە بەکاردەهێنرێن)، هەروەها ئەو دەرامەتانەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ فەراهەم دەبن، زۆربەی خۆراکی جیهان و زۆرینەی دەرامەتە پیشەسازییە خاوەکانیش دەگرێتەوە، هەروەها ئەم جۆرە ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو و هەڵکشان و داکشانی زەریاکان و با و وزەی خۆریش دەگرێتەوە. بەهای ئەم دەرامەتەی ئابوورییەکان پابەندە بە ئاستی تەکنەلۆژی و لێهاتوویی کارگێڕی ئەو دەرامەتانە لەلایەن بەکارهێنەرانەوە. نموونەش بۆ دەرامەتە بایۆلۆژییەکان، بەفیڕۆدانی دارستانەکان وەك ئەوەی لە ئەمریکای باکوور ڕوویدا، یا وەك ڕاوکردنی بێ بەزەیی لە ڕادەبەدەر وەك ئەوەی ئەم دواییە لە دەریاری باکوور ڕوویدا، یا بڕینەوەی دارستانەکان بەمەبەستی کشتوکاڵکردن یا لەوەڕاندنی لەڕادەبەدەر کە دەبێتە هۆی بە بیابان بوون و لە دەستدانی خاك، وەزارەتی کشتوکاڵی ئەمریکی بە نزیکەی (٢٤) ملیار تەن ساڵانە، خەملاندوویەتی، هەروەها بەکارهێنانی ئاوی ژێرزەوی بەرێژەیەکی زۆر دەشێ کاربکاتە سەر فەراهەمبوونی ئەو دەرامەتانە.

## چەمکی قەبارەی نموونەیی دانیشتوان:

## :the concept of optimam population

سەرجەم ئەو گفتوگۆیانەی لەمەڕ پەیوەندی دانیشتوان بە دەرامەتەکانەوە ئەنجامدەدرێن دواجار دەچنەوە سەر ئەو ئاماژانەی کە پەیوەستن بە چەمکی قەبارەی نموونەیی دانیشتوان و زۆری و کەمی دانیشتوان.



بەکورتی ئەو چەمکە واتە ژمارەیەکی (نموونەیی دیاریکراو) هەیە دەکرێ لە شوێنێکی دیاریکراو بژین، ئەگەر ژمارەکە زیاد بکات هەڵاوسانێکی دانیشتوانی ڕوودەدات و ئەگەر ژمارەکە کەمبکات ناوچەکە لەڕووی دانیشتوانەوە کەم دەکات. ڕاستییەکەی ئەو چەمکە زۆر ئاڵۆزە، چونکە ئەستەمە پێناسەیەکی جیهانی دابڕێژین یا ژمارەیەکی دیاریکراو بۆ ناوچەیەکی دیاریکراو دابنێین و لە ژێر سایەی گۆڕانکارییە تەکنەلۆژییە هاوچەرخەکان بۆ دەرهێنانی گاز و نەوت و ئاو لە ناوچە بیابانییەکان کاری کردۆتە سەر زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان لەو ناوچەیە.

هەروەها پێوانەکردنی قەبارەی نموونەیی بنەمایەکی ئابووری هەیە و ڕاستییەکەی زۆرجار لە ڕوانگەیەکی ئابوورییەوە سەیری ئەم چەمکە دەکرێ، قەبارەی دانیشتوان لە ناوچەیەکی دیاریکراو ئاماژەیەکی نا دروستە بۆ توانای ئابووری ئەو کەسانە، چونکە تەندروستی تاکەکان و بونیادی تەمەنی بەرادەیەکی زۆر کاردەکاتە سەر توانای ئابووریان.

ئاشکرایە پێناسەیەکی سادە بۆ ئەو چەمکە نییە، چەمکەکانی وەك هەڵاوسانی دانیشتوان یا کەمبوونەوەی دانیشتوان، دەبێ بە وریاییەوە بەکاربهێنرێن یا هەر بەکار نەهێنرێن، ئەو چەمکانە زۆر ئاڵۆزن و دەبێ چەندین فاکتەر لەبەرچاو بگرین، زۆر بەشیان بە ئەستەم هەڵدەسێنگێندرێن و لەگەڵ زەمەن و بەهۆی پەرەسەندنی تەکنەلۆژیا و ڕۆشنبیرییەوە دەگۆڕێن، چونکە ڕۆشنبیری و پەرەسەندنی تەکنەلۆژیا ناکرێ پێشبینی بکرێن، بۆیە چەندین سیاسەتی دانیشتوانی لەسەر حوکمی قەبارەی نموونەیی دانیشتوان دارێژراون، هەروەها هەوڵی نزمکردنەوەی ڕێژەی لە دایکبوون لە چین، واتە چین وایدادەنێ لە دوارۆژدا دانیشتوانەکەی ژمارەیان زۆرتر دەبێ یا هەروەکو خۆی بمێنێتەوە، بەهەمان شێوەیە هەندێ وڵات دژی بەرنامەی ڕێکخستنی خێزانن، واتە ئەو وڵاتانە پێویستیان بە ژمارەی زیاتری دانیشتوانە.

هەر گفتوگۆی مەسەلەی پەیوەندی نێوان گەشەی دانیشتوان و خۆراك تەواو دەبێ، گوێبیستی زایەڵەی مشتومڕی مالتۆسی دەبین، مالتۆس پێی وایە هەمیشە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان و کەمێك خواردن هەیە.

مالتۆس سالی (١٧٩٨) ئەو بیرۆکەیەی بەم شێوەیە لە لێکۆڵینەوەیەکدا کورتکردۆتەوە:"هێزی دانیشتوان زۆر زیاترە لە هێزی زەوی لەبەرهەمهێنانی خۆراکی تەواو بۆ خەڵك". لەسەردەمی مالتۆس بەدواوە پەرەسەندنی بێ وێنە روویانداوە، بۆ وێنە: بەرهەمی جیهان دووجابۆتەوە، هەروەها تەکنەلۆژیای کشتوکاڵی پەرەی سەندووە و چوار هێندەی بەرهەمی کشتوکاڵی کۆن بەرهەم دەخاتەوە، هەروەها تۆڕەکانی بازرگانی جیهانی و پەیوەندییەکان بوونەتە هۆی ئالوگۆڕی هاوکارییەك لە نێوان ولاتان کە هیچ کەسێك لەسەدەی هەژدە پێشبینی ئەو هاوکارییەی نەدەکرد، مشتومڕەکە بەردەوامە، ئایا ژمارەیەکی زۆری خەڵك هەیە؟، ئایا ژمارەی دانیشتوان زۆرە؟، یا دەتوانین برسیەتی لەناو ببەین؟.

بەهۆی ئەوەی دانیشتوان بەرادەیەکی زۆر خێرا توانیان گوزەرانی خۆیان لە ژینگەکانیان بەدەستبهێنن، بۆیە زۆر خێرا گەشەیان کرد، لەگەڵ ئەوەی رێژەی گەشەکردن زۆر کەمتر بوو لەوەی ئەمڕۆ دەیبینین، لەبەرامبەردا گەشەی دانیشتوان لە پێناو بەرهەمهێنانی زیاتری خۆراك فشاری زۆریان دروستکرد، ئەمڕۆ لەگەڵ بوونی ئاماژە بەنزمبوونەوەی رێژەی گەشەی دانیشتوانی جیهان، کەچی ژمارەی دەمی نوێ زۆر بەخێرایی زیاد دەکا و هەموو ساڵێك نزیکەی (٨٤) ملیۆن کەس دێنە سەر ئەم گۆی زەوییە و زۆربەی دەرامەتە سروشتییەکان — زەوی، ئاوی پاك، هەوای پاك، سنووردارە.

گەشەی دانیشتوان و زۆربوونی دەوڵەمەنی سەبارەت بە ژمارەی دانیشتوانی جیهان داخوازییەکی زۆر لەسەر خۆراك دێنێتە ئارا.

ئەگەر بەرهەمهێنانی خۆراك بەردەوام بێ بۆ پڕکردنەوەی داخوازییەکان، هەڕەشەی گەورەمان رووبەروو دەبێتەوە، ئەوەی لەم بەشەدا، ئەوەی ماوە هەندێ

پێشبینییە بۆ زیادبوونی بەرهەمهێنانی خۆراك و هەندێ گرفتی پەیوەندیدار بەو مەسەلەیە و ئەنجامە کەڵەکەبووەکانی سەری، تاوتوێ دەکەین.

## ئاراستە هەنووکەییەکانی بەرهەمهێنانی خۆراك

لەم ساڵانەی دواییدا (١٢) ملیۆن دۆنم زەوی کراوەتە کشتوکاڵ، کەدەکاتە (١٪) رووبەری وشکانی، سێ بەشی ئەو کشتوکاڵکردنەش بۆ دانەوێڵەیە، هەڵبەتە دانەوێڵە نیوەی ئەو گەرمییە (السعرات)ی کە مرۆڤ لەخواردنی خۆراك چنگی دەکەوێت، لەسەرووی لیستی ئەو دانەوێلانەشەوە گەنم و برنج دێ، جیاوازی کولتووری (شارستانی) و تایبەتمەندییە ژینگەییەکان هاوکارن لە راڤەکردنی جیاوازی شێوە جوگرافییەکانی ئەو بەرهەمە بنەرەتیانە. شتێکی سەرەتاییە هەرچەندی داهات بەرز بێتەوە بڕی ئەو دانەوێڵە کەمدەبێتەوە کە تاك وەکو خۆراك دەیخوات، بەلاّم لە هەمان کاتدا بڕی ئەو گۆشتەی دەشیخوات زۆر دەبێ.

رێژەی رۆژانەی ئەو گەرمییە (السعرات)ی کە تاك بەدەستی دەهێنێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازییەکی گەورەی هەیە، فەراهەمبوونی رێژەی خۆراك لە کۆمەڵگا دەوڵەمەندەکان مانای چارەسەرکردنی کەموکوڕی خۆراك و برسیەتی نییە لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان.

لەماوەی ساڵانی (١٩٥٠-١٩٩٠) بەرهەمی خۆراك زیادی کرد، کە هەمیشەش بەبەرهەمی دانەوێڵە دەپێورێ بە نزیکەی (٢,٦)جار، بەمەش زۆربوونی ئەو دانیشتوانەی کە دەگاتە (٢,١) جار لە (٢,٥) ملیارن بۆ (٥,٣ ملیار)، ئەمڕۆ بەرهەمی خۆراکی تاك زۆر زیاترە لەبەرهەمی چڵ ساڵ لەمەوبەر.

ئەم ژمارانە تارادەیەك لێڵن، لە ساڵی (١٩٨٤) تێکڕای بەشە بەرهەمی دانەوێڵەی تاك نزمبۆوە، زۆربوونی بەرهەم هاوشان نەبوو لەگەڵ زۆربوونی دانیشتوان لە زۆربەی ناوچەکان، بەرهەمهێنانی دانەوێڵە لە کۆتایی هەشتاکان رووبەرووی چەندین شکست بۆوە.



بەشە بەرهەمی دانەوێڵەی تاك نەدەگەیشتە رادەی ساڵانی (١٩٨٤-١٩٨٥) سەرباری ئەوەش پێشکەوتنێکی رووکەش لە زیاتر فەراهەمبوونی خۆراك لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو دەگەڕێتەوە بۆ زۆربوونێکی گەورەی بەرهەم لە تەنها وڵاتێك.

چین (٣٥٪) خۆراکی جیهانی تازەپێگەیشتووەکان پێکدەهێنێ، لەکاتێکدا رێژەی دانیشتوانەکەی دەگاتە (٣٠٪)، ئەگەر چین لەم رێژەیە وەلا نێین دەبینین زۆربوونی خۆراك هاوشانی زۆربوونی دانیشتوان نییە.

لەناوەڕاستی نەوەدەکان و بەهۆی باشتربوونی ئابووری و گەشەی دانیشتوانەکەی، چین دانەوێڵەی هاوردە کرد، هەوڵی فەراهەمکردنی دانەوێڵە بۆ ئەو دێوە ئاسیاییە کار دەکاتە سەر نرخی دانەوێڵە و پەیوەندی کلاسیکی نێوان ئەو وڵاتانەی بەرهەمی دانەوێڵەی سەرباریان هەیە — ئوستراليا و کەنەدا و ئەمریکا— و وڵاتانی جیهانی سێ کە ناچارن بۆ رکابەری لەگەڵ چین، لە بازاڕی دانەوێڵەی جیهانی.

ئەمڕۆ وڵاتانی ئەفریقیای باشووری بیابان بەهۆی بەد خۆراك و زۆربوونی برسیەتی دەناڵێنن، ژمارە و رێژەی رەش و رووت و برسییەکان زیادی کردووە و لەزیادبووندایە، ئەفریقیا لە هەر ناوچەیەکی دیکە زیاتر نزمبوونەوەی بەرهەمی خۆراکی تاکی بەخۆوە بینیووە، لە کۆتایی سەدەی بیست ئەو وڵاتانەی کە رووبەرووی کەم خۆراکی بوونەوە بریتین لە :پیرۆ، چاد، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست، ئەنگۆلا، ئەسیوپیا و کینیا، ئەفغانستان و بەنگلادیش.

لە رووپێویەکی (٩٣) وڵات کە رێکخراوی خۆراك و کشتوکاڵی نێودەوڵەتی (فاو) ئەنجامیداوە، دەبینین لە پێناو پڕکردنەوەی داخوازی لەسەر خۆراك لە کۆتایی سەدەی بیست، جیهان پێویستی بە (٣٣٢) ملیۆن دۆنم زەوی شیاوە بۆ کشتوکاڵکردن.

لەگەڵ ئەوەی ئەو ژمارەیە بچووکە کەچی خاك لە زۆربەی ئەو ناوچانەی کە دەکرێ فراوان بکرێن وڵاتگەلی پەراوێزین و هەندێکی دیکەشیان دەکەونە ناوچەی وا پشت بە بارانەکەی نابەستێ.

ژمارەیەکی کەمی ولاتان دەتوانن زەوی تازە بخەنە بواری بەرهەمهێنان — بەرازیل- بەلاّم ئەمە بەس نییە، بۆیە پێویستە بەرهەمهێنانی زەوی بەرهەمهێن زیاد بکرێ، بەتایبەت لە ولاتانی تازە پێگەیشتوو لە پێناو زۆربوونی بەرهەمهێنانی خۆراک.

لە لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی رەوشی خۆراکی، یا ئەو برە خۆراکەی تاك رۆژانە دەیخوات بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکانی خۆی، بانکی نێودەوڵەتی ئاشکرایکرد سەدان ملیۆن کەس لە جیهان هەن ئەو خۆراکە ناخۆن کە بانکی نێودەوڵەتی بە ئاستی پێویستی دەزانێ.

ئەمڕۆ پێوەرێکی دیکەی گرنگ هەیە بۆ رەوشی خۆراکی جیهانی، ئەویش عەمبارکراوی فەراهەمبوونە بەر لەوەی بەرهەمهاتووی نوێ بگات و ئامادە بێت و پاشان ئامرازەکانی گواستنەوە فەراهەمبن بۆ گواستنەوەی بۆ ئەو ناوچانەی کە پێویستیان پێیەتی، هەموان دەیانەوێ عەمبارکراوێکی زۆریان هەبێ، بەلاّم بێ بەختی ژمارەیەکی کەمیان ئامادەیی کڕینیان هەیە، عەمبارکراوێکی واش بۆ بەرهەمهێنان هەلگرتنی خەرجییەکی زۆری دەوێ، زانیارییە هاوچەرخەکان ئاماژە بەوە دەدەن عەمبارکراوی تەواو هەیە، بەلاّم بەرز و نزمی فراوان لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی دیکە روودەدات کە دەبێتە هۆی بەفیڕۆچوونی عەمبارکراوەکان.

ماسی دەریاکان رۆڵێکی گرنگ لە خۆراکی مرۆڤ دەبینن، لەماوەی نێوان سالانی (١٩٤٠-١٩٩٠) راوکردنی ماسی چوار جار زیادی کردووە و چاوەڕوان ناکرێ لەوە زیاتر بێ، راوکردنی دەریایی کە (٩٠٪)ی کۆی راوکردنەکان پێکدەهێنێ گەیشتۆتە بەرزترین ئاست، ناوچەکانی راوچیانی ماسی لە سەرجەم جیهان بە شێوەیەکی یەکسان دابەش نەبووە. باشترین ناوچەی راوکردن بریتین لە چین و پیرۆ و چیلی و دوای ئەوانیش ژاپۆن و روسیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانە، بەهۆی مافی راوکردن و قڕکردنی چەندین جۆری ماسی وەك (سلمون وکد) گرفتی زۆری لەجیهان دروستکردووە.



مەسەلەی پەروەردەکردنی ماسی مەسەلەیەکی ئالۆزە، چونکە زۆربەی ناوچە کەنارییەکانی هەرێمە پڕ دانیشتوانییەکان پیس بوونە، پەروەدەکردنی ماسی پێویستی بە خۆراکپێدانی دانەوێڵە و خۆراکی دیکە هەیە کە لەسەرچاوە زەوییەکانەوە دێن کە دەشێ لەلایەن مرۆڤ یا ئاژەڵەوە بخورێن.

**زۆربوونی بەرهەمهێنان لە زەوییە بەکارهێنراوەکانی ئێستا**

**چوار شێوازی سەرەکی بۆ زۆربوونی بەرهەمهێنانی بەروبووم هەن:**

١- پەینی کیمیاوی
٢- (المبیدات) مار و مێری و المبیداتی رووەکە زیانمەندەکان.
٣- ئاودێری
٤- پەرەسەندنی بۆ ماوەیی رووەکەکان

ئەوانە پێشکەوتنی تازە نین، بەلاّم بەکارهێنانیان لە چەندین شوێن، بەتایبەت لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکان لەم دەیانەی داویی رویانداوە.

**١- پەین و بەرهەمهێنانی بەروبووم:**

بەکارهێنانی پەین بۆ بەرهەمهێنانی بەروبووم شتێکی تازە نییە، جوتیاران زۆر دەمێکە پاشماوەی ئاژەڵەکانیان بۆ کشتوکاڵ بەکارهێناوە، تەنانەت هەندێکیان پاشماوەی مرۆڤیان بەکارهێناوە،کەلە رۆژهەلاتی ئاسیا پێی دەوترێ (خۆڵی شەوانە — night soil) بەکارهێنانی زیاتری پەینی کیمیاوی لە دەیەی چلەکانی سەدەی رابردوو دەستیپێکرد، بەتایبەتیش لە ولاتانی پێشکەوتوو.

پەینی کیمیاوی لە ژێر سایەی هەلومەرجێکی گونجاودا بە شێوەیەکی خێرا کار دەکاتە سەر باشترکردنی بەرهەمهێنان. لەماوەی نێوان سالانی (١٩٥٠-١٩٨٩) بەکارهێنانی ئەو پەینە لە (١٤) ملیۆن تەنەوە بەرزبۆتەوە بۆ (١٤٦) ملیۆن تەن، لە

ساڵی (١٩٨٠) ڕێژەی بەکارهێنانی پەین کەمبۆتەوە، لە حەفتاکان جیهانی سێ بە شێوەی پاڵپشتیکردن دەستیکرد بە بەکارهێنانی پەینی کیمیاوی، بەڵام دواجار ئەو پاڵپشتییە کەمکرایەوە یا ڕەتکرایەوە و نەما، نرخی پەین بە شێوەیەکی بەرچاو لەو وڵاتانە لەم دوو دەیەی دوایی بەرزبووەوە، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی نەتوانرێ لە وڵاتانی جیهانی سێ بەکار بهێنرێ.

جوتیارانی وڵاتانی تازە پێگەیشتوو دەتوانن کەڵك لە بەکارهێنانی پەین وەرگرن، بەڵام ناتوانن خەرجییەکەی دابینبکەن، بۆیە بەرهەمهێنانی بەروبووم لەو وڵاتانە زۆر کەمترە لە وڵاتانی پێشکەوتوو.

پشت بەستن بە پەینی کیمیاوی بۆ ماوەیەکی دوور یا نزیك کاریگەری ژینگەیی دەبێ، ئەمەش لە چەندین لێکۆڵینەوەدا سەلمێنراوە، بەتایبەت ئەگەر بە شێوەیەکی زۆر بەکار بهێندرێت، چاوەڕوانیش ناکرێ ڕێژەی بەکارهێنانی پەین لە ئایندەدا لە ژێر سایەی زۆربوونی دانیشتوان چاوەڕوانکراو، نزمببێتەوە.

### ٢- دەرمانی دژە مێش و مەگەز و دەرمانی دژە ڕووەکی زیانبەخشەکان:

هەندێ لە خەمڵاندنەکان ئاماژە بەوە دەدەن نیوەی بەرهەمی خۆراکی لە جیهان بەهۆی ئاژەڵ و مار و مێری برسییەوە لە ناو دەچن، کۆنترۆڵکردنی مار و مێری بەبەکارهێنانی دەرمانی کیمیاوی لەناوچونی بەرهەم کەمدەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەرمانی دژە مار و مێری قەیرانی ژینگەی لێدەکەوێتەوە، چونکە زۆرێك لە شتە کیمیاوییانە لە ژینگەدا دەمێننەوە، هەندێکیشیان بەهۆی تێپەڕبوونیان بە زنجیرەی خۆراکیدا چڕتر دەبێتەوە وەك: DDT.

ڕووەکە زیانبەخشەکان مەترسییەکی دیکەن لە ڕووی باشتربوونی بەرهەمهێنانی بەروبووم، چونکە ڕکابەری بەروبوومەکان دەکەن لە خۆراك و تیشکی خۆردا، بۆیە کۆنترۆڵکردنی ئەو ڕووەکە زیانبەخشانە ڕێگایەکی دیکەیە بۆ باشترکردنی بەروبوومەکان، کۆنترۆڵکردنیشی پێویستی بە بەکارهێنانی دەرمانی کیمیاوی هەیە و



ئەوەش بە ڕۆڵی خۆی هەرەشەیە بۆ سەر ژینگە، لە وڵاتانی تازە گەشەسەندوو ئاڵوگۆڕ پێویستە، چونکە زۆربوونی بەرهەمهێنانی خۆراك شتێکی پێویستە، بۆیە دەبێ هەندێ سەرەڕۆیی بکرێ.

### ٣- ئاودێری:

وێڕای بوونی ڕووبەرێکی فراوان لە جیهان کە بارانی تەواویان لەسەردا دەبارێ بۆ بەرهەمهێنانی خۆراك، کەچی زۆربەی ئەو وڵاتانەی پڕ دانیشتوانترن لەو ناوچانەن کە وشکن، زۆربەی ئەو وڵاتانەش هەژارن و هیچ دەرامەتێکیان نییە بۆ کڕینی دەرامەتی خۆراکی لە ناوچەکانی دیکە، لێرەوە گرنگی ئاودێری لەو وڵاتانە دەردەکەوێ، هەزاران ساڵە بەکارهێنانی ئاودێری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بۆ ناوچەکانی دیکەی جیهان بڵاوبۆتەوە، زۆربەی فراوانبووەکانی ئاودێری زەوییەکان لەم چوار دەیەی کۆتایی ڕابردوو ئەنجامدراون، لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٨٥) ڕووبەری زەوییە بەراوەکان سێ جار زیادی کردووە و ئەوەش فاکتەرێکی سەرەکیی بەرپرسە لە زۆربوونی بەرچاوی بەرهەمهێنانی خۆراك.

کشتوکاڵی بەراو ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە تێرکردنی مرۆڤەکان و فەراهەمکردنی سەرچاوەی ڕزقی لادێ-نشینەکان، بۆ وێنە: دەبینین (٦٥٪) زەوییە کشتکوکاڵییەکان لە پاکستان بەراون و لە (٨٠٪) خۆراك لەو وڵاتانە بەرهەمدێ، لە هیندستان (٣٠٪) زەوییەکانی بەراوە و (٥٥٪) بەرهەمهێنانی خۆراك فەراهەم دەکات و (٥٠٪) زەوییەکانی چین بەراوە و (٧٠٪) خۆراکی بەرهەمهێنراو لە چین بەرهەم دێ.

لەو کاتەوەی کە ڕووبەرە بەراوەکان زیاد دەبن هەمان ڕووبەری هاوشێوەی بەرهەمهێنان دەڕۆنە دەرەوە، ئەوەش بەهۆی وەکو ڕێکخراوی خۆراك و کشتوکاڵی نێودەوڵەتی (فاو) پێی دەڵێ : "دوژمنە بێ دەنگەکان": تاڵبوون، بەخوێبوون، تێر ئاوبوون. لە ئەفریقیا ئەو ڕووبەرانەی دەبنە زەوی بەراو و ئەو ڕووبەرانەی مەرجەکانی بەراوبوونیان لە دەست دەدەن یەکسانن.

رووبەری زەوییە بەراوەکان لە جیهان (١٢٪)ی رووبەری زەوییە کشتوکاڵکراوەکانە، نیوەی بەرهەمی خۆراکی جیهان لەو زەوییانەوە بەرهەم دێت. لێرەوە پێویستی فراوانبوونی بەراو و ئاودێری دەردەکەوێ، بەڵام ئەو فراوانبوونە بەهۆی فراوانبوونی نادادپەروەرانەی سەرچاوە ئاوییەکان و خەرجی زۆری پرۆژەکانی ئاودێری گەورەی وەك بەنداو و وێستگەکان سنووری هەیە.

### ٤- بنچینە تازەکانی رووەك و شۆڕشی سەوز:

لە سەرەتای شۆڕشی کشتوکاڵی (١٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر مرۆڤ هەوڵی داوە جۆری ئەو بەروبووم و ئاژەڵانە باشتر بکات کە بەشداریان کردووە لە زیادکردنی بڕی بەروبووم و لەمەشدا سەرکەوتن و پاشان بووە هۆی بەرەو پێشچوونی ئاستی خۆراکی مرۆڤ، لەو کاتەی کە مرۆڤ هەندێ جۆری خۆراکی هێنایە ئارا خۆراکگەلێکی دیکە لە ناوچوون و بزربوون، لەو کاتەوە و تاکو ئەمڕۆ چەندین شۆڕش روویانداوە، وەك ئاڵوگۆڕی بەروبوومەکانی نێوان جیهانی نوێ و جیهانی کۆن کە نزیکەی (٥٠٠) ساڵ لەمەوبەر دەستی پێکردووە و تاکو ئەمڕۆ بەردەوامە، ئەوەش بێگومان بووەتە هۆی زۆربوونی توانای جیهانی لە بەرهەمهێنانی خۆراك.

بەم دواییە هەندێ شۆڕش روویاندا کە بوونە هۆی دۆزینەوەی پەرەسەندنی بۆماوەیی چەندین رووەك کە کاریگەرییان هەبوو لە زیادکردنی بەرهەمهێنانی چەندین دانەوێڵە، بەمەبەستی بەرگەگرتنی دۆخی سارد و وشکایی، جۆرە باشەکانی گەنمەشامی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر کاریگەربوو بە پەین و رەوشی کەش و هەوایی کە زیاتر لە ناوچە ساردەکاندا دەچێنرا.

"شۆڕشی سەوز" بەهۆی پەرەسەندنی ئەو شتەی پێی دەوترێ (جۆرە سەرسوڕهێنەرەکان)ی گەنم و برنج کە لە ناوەڕاستی شەستەکان پەرەی سەند، سەرنجی جیهانی بەلای خۆیدا راکێشا.



ئەو جۆرە رووەکانە قەدێکی کورتتر و بەهێزتری لە جۆرە رووەکە تەقلیدییەکانی دیکە هەیە و وەڵامدەرێکی چالاکتری پەینی کیمیاوییە و بەدرێژایی رۆژ کەمتر گۆڕانی بەسەردا دێ، (واتە بەرامبەر بە کەش و هەوا زۆر هەستیار نییە— و.ك)، ئەو تایبەتمەندیەش بۆتە هۆی ئەوەی لە ساڵێکدا ژمارەیەك بەروبووم بەرهەمبهێنرێ، لە پاکستان لەماوەی (١٤) مانگدا دەکرێ (٣) جۆری بەروبووم بەرهەمبهێنرێ.

ئەو جۆرانە زۆر بەخێرایی بلاّوبونەوە، هیندستان و پاکستان و فلیپین و ئەندۆنوزیا و مەکسیك بە شێوەیەکی سەرەکی کەڵکی لێوەردەگرت، هەندێ ولاّتیش بوونەتە سەرچاوەی ئەو جۆرانە کە پێشتر هاوردەیان دەکرد. بلاّوبوونەوەی ئەو جۆرانە گەیشتە سەرجەم ناوچەکانی جیهان، نزیکەی سێ بەشی بەروبوومی بەرهەمهاتووی ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان لەو جۆرە باشانە بەکار دەهێنن، هەروەها رێژەی بەکارهێنانی ئەو جۆرانە بەگوێرەی هەرێمەکان جیاواز دەبێ (ئەفریقیا ١٪، ئەمریکای لاتین ٢٢٪، ئاسیا و رۆژهەلاّتی ناوەڕاست ٣٦٪).

ئەگەر بمانەوێ بەرهەم زیاد بکەین دەبێ کار لەسەر راهێنانی جوتیارانی کلاسیکی بکەین و هانیان بدەین بۆ بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای تازە: چۆن وکەی کشتوکاڵ و تۆوداری نوێ ئەنجامدەدرێ، چۆنیەتی کۆنترۆڵکردنی گژو گیا زیانمندەکان، مار و مێری، نەخۆشییەکان، چۆنیەتی پاراستنی ئاو و بەڕێوەبردنی. بەرنامەی راهێنان نالێهاتوانە و کۆمەك نەکردنیشی کەموکورتی تێدەکەوێ، هەڵبەت پاڵنەری کەم هەیە بۆ هاندانی جوتیارە بچووکەکان لە بەکارهێنانی جۆرە باشەکان.

شۆڕشی سەوز یارمەتیدەرە لە جەنگی دژی برسیەتی، بەڵام چارەسەرێکی شفادەرانە نییە بۆ گرفتی خۆراك لە ولاّتانی تازەپێگەیشتوو، شالاّوی گرفتی گەشەی خێرایی دانیشتوان لە ئەنجامی پێشکەوتنی بەرهەمی کشتوکاڵییەوە هاتە ئاراوە، بەم شێوەیە دانیشتوان لە گەشەکردن بەردەوام دەبن و کەڵك لەو پێشکەوتنە وەرناگرن کە بەدەست هاتووە، ئەمە بەرەو لای بیروباوەڕەکانی ماڵتۆس دەمانگەڕێنێتەوە کاتێك قسەی لەسەر دانیشتوان لەبەرامبەر بەرهەمی خۆراکی دەکرد، زانایان بە شێوەیەکی

گشتی کۆکن لەسەر نزمکردنەوەی گەشەی دانیشتوان، ئەگەر زۆر پێویست نەبێ ڕێگایەکە بۆ هێواشکردنەوەی گەشەی دانیشتوان بەمەبەستی کەمکردنەوەی ڕادەی چەندین گرفت.

بەگەیشتنمان بە کۆتایی سەدەی بیست و سەدەیەکی تازەمان دەستپێکرد و ژمارەی دانیشتوانی جیهان گەیشتە زیاتر لە شەش ملیار خەڵك و نزیکەی ملیارێکیشیان خۆراکی پێویستیان بۆ خواردن نییە، زۆرینەشیان بە هەژاری و دەردەسەری ژیان بەسەر دەبەن.

## خۆراك و دانیشتوان

وێڕای زۆربوونی بەرچاوی بەرهەمی کشتوکاڵی کە ڕادەی پەرەسەندنی کیمیاوی تەکنەلۆژیا و ئاودێری و ئەندازیاری جینات و پەینی کیمیاوییە، کەچی تاکو ئێستا لە نێوان لێکۆڵەران و زانایان ترسێکی زۆر لەسەر بیروباوەڕە ماڵتۆسییە تازەکان لە ئارادایە، لەبەرامبەردا زانای دیکە هەن هەستدەکەن بەردەوامی پێشکەوتن گەشەی بەرهەمهێنانی خۆراك لەسەرووی گەشەی دانیشتوان دەهێڵێتەوە، هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن نزمبوونەوەی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان فشاری سەر دەرامەتەکان سووك دەکات و زەمینەی فەراهەمبوونی خۆراکی باشتر بۆ ژمارەیەکی زۆرتری دانیشتوان خۆشدەکات.

**ئێستا هەندێ لەو بیروباوەڕانە دەخەینە بەر باس:**

**بیروڕای یەکەم:**

نزیکەی دوو دەیە لەمەوبەر (ولیەم پۆڵ باوۆك) لە چاپێکی نوێی کتێبەکانیدا نووسی: شەمەنەفەر کە زۆر خێراتر لە ڕێگا ئاسنیەکە دەڕوا، لەلای پێچاوپێچەکانی خزینی زەوی ڕێگائاسنیەکە بزر دەبێ، هیچ شتێك ناتوانێ شەمەنەفەرەکە لە کاتێکی



گونجاو بوەستێنێ، کارەساتەکە حەتمییە، دەکرێ شەمەنەفەرەکە بوەستێنرێ بەر لەوەی بگاتە پێچەکە، یا ڕێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر بۆ ڕێگەگرتن لە خزین.

شەمەنەفەرەکە گەشەی دانیشتوانە، خزینی زەمینیش لەسەر ڕێگائاسنینەکە بەرهەمی وەستاوی کشتوکاڵە، لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو کە بەدەست زۆربوونی دانیشتوانەوە دەناڵێنن.

پێکدادان شتێکی حەتمییە، برسیەتی و قات و قڕیش شتێکی حەتمییە.

نووسەرانی بیرۆکەی سەرباری: بریندارانی جەنگیان دابەشی سەر سێ دەستە کرد ئەوەش بۆ ڕاپۆرتی چارەسەری: واتە بۆ ئەوەی کێ یەکەمجار چارەسەری بدرێتی.

ئەو دەستانەش ئەمانەن:

١- بریندارانی سەخت کە هەر دەمرن ئەگەر چارەسەریشیان بۆ بکرێت.

٢- ئەو بریندارانەی بەبێ چارەسەریش دەمێنن.

٣- ئەو بریندارانەی ئەگەر بە شێوەیەکی دروست چارەسەر بکرێن دەمێنن.

کەل و پەلە پزیشکییەکان سنووردارن، بە پزیشکەکانیشەوە، دەکرێ دابەش بکرێن بۆ چارەسەرکردنی بریندارانی دەستەی سێیەم، بەم شێوەیە پزیشکان دەتوانن زۆرترین گیان ڕزگار بکەن، (باوۆك) ئەو سیستەمەی بۆ پۆلینکردنی وڵاتانی برسی لە جیهان بۆ سەر سێ دەستە:

١- ئەو وڵاتانەی بەهۆی گەشەی دانیشتوان و نەشیانی کشتوکاڵکردن و توانای سەرکردایەتیکردن ناکرێ ڕزگار بکرێن.

٢- ئەو وڵاتانەی دەرامەتی تەواویان لە کشتوکاڵ و دراوی بیانی هەیە و دەتوانن ڕووبەڕووی گەشەی دانیشتوان بن.

٣- ئەو وڵاتانەی گەشەی دانیشتوان و فەراهەمبوونی خۆراکیان لاسەنگە و دەکرێ چارەسەر بکرێن ئەگەر پشتگیری تەواو بکرێن.

**بیروباری دووەم:**

(گاریس هاردن)ی زیندەوەرناس بەراوردێکی نێوان وڵاتانی دەوڵەمەند و وڵاتانی هەژاری کردووە بەبەکارهێنانی بەلەمی دەربازبوون.

وڵاتانی دەوڵەمەند بەلەمی رزگارکەرن تا سنوورێکی دوور سەربارکردنی سەرنشینی زیاتر بەلەمەکە رووبەرووی هەڕەشەی نغرۆبوون دەبێ.

هەژاران هەوڵی سەرکەوتنی بەلەمی رزگاربوون دەدەن، ئەنجامی ئەمەش دەبێ دوور بخرێنەوە ئەگەر وڵاتانی دەوڵەمەند بیانەوێ بەدەوڵەمەندی بمێننەوە. بەمانایەکی دیکە و لەروانگەی (هاردنەوە) تێرکردنی خەڵکی وڵاتە برسییەکان هەڕەشەیەکە بۆ سەر بەلەمی دەربازبوون، ئەوەش کارێکی دروست نییە.

**هیچ هیوایەك هەیە؟؟**

هیچ کەس نکۆڵی لەوە ناکات ملیۆنان مرۆڤی برسی لە جیهان هەیە و بەدەست بەدخۆراکییەوە دەناڵێنن، هەزارانیش (بەتایبەت ژنان و منالاَن) ئەوانەن بەدەست ئەو دوو دەردەوە دەناڵێنن.

هیچ بیروبۆچوونێك لەبارەی ئەوەوە نییە کە چارەسەرکردنی گرفتەکانی خۆراك و دانیشتوان گرفتی ئاسان و ئۆتۆماتیکین، لە هەوڵێکدا بۆ بەرزکردنەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی (وولف) لە وتارێکیدا پێشنیاریکرد:"چیتر جیهان ناگاتە چارەسەری گرفتەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی، شێوازی تەقلیدی زۆربوونی بەرهەم بریتییە لە کۆکردنەوەی بەروبوومە نوێیەکان لەگەڵ بەکارهێنانی پەین و دەرمانی دژە رووەکە زیانمەندەکان و بەکارهێنانی چرۆپڕی وزە سەرکەوتوون لە زۆربوونی بەرهەمی خۆراك لە وڵاتە پیشەسازییەکان و هەندێ وڵاتی تازە پێگەیشتوو دێتە دی، بەڵام دەبێ چارەسەرێکی تازە بدۆزینەوە، چونکە زۆربەی جوتیاران ناتوانن خەرجی ئەو شێوازە دابینبکەن، هەروەها بۆ راستکردنەوەی کەموکورییەکان لە دابەشکردنی گرفتە ژینگەییەکان و تەواوکردنی شێوازە تەقلیدییەکان بە داهێنراوی بایۆلۆژی و تەکنەلۆژی دەتوانین بەرهەم زیاد بکەین.



چاوەڕوان ناکرێ برسیەتی و قات و قڕی لە چوارچێوەیەکی فراوان رووبدا، بەڵام بڵاوبوونەوەی برسیەتی و بەدخۆراکی لە زۆربەی بەشەکانی وڵاتە هەژارەکان دەمێنێتەوە، تارماییەکەی ماڵتۆس بزر نابێ، چونکە زۆربوونی خەڵك واتە زۆربوونی داخوازی سەر خۆراك، دەکرێ خۆراك زیاتر بەرهەم بهێنرێ، بەڵام نەك بەبێ کاریگەری لەسەر ژینگە.

زۆربوونی بەرهەمی کشتوکاڵی لە زەوییە بەکارهێنراوەکانی ئێستا باشترین رێگایە بۆ زۆربوونی بەرهەمی خۆراك لە ساڵانی ئایندە.

لەلایەنی زانستییەوە ئیمکانیەتی فەراهەمکردنی خۆراك بەبەکارهێنانی تەکنەلۆژیای رەخساو هەیە، بەڵام ئەو بەربەستانەی دێنە پێش سەرکەوتنی ئەو شێوازە، بەربەستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورین، دەبێ وەڵامی پرسیارە ئەخلاقییەکان بدرێنەوە نەك سیاسییەکان، بۆ وێنە ئایا وڵاتە پێشکەوتووەکان ناچارن وڵاتە هەژارەکان تێر بکەن؟ چۆن دەکرێ سیستەمی دادپەروەرانەی دابەشکردنی خۆراك پەرەی پێبدرێ؟ هەر تاکێك لە جیهان مافی بەدەستهێنانی خۆراکی هەیە؟ ناکرێ بەتەنها زانست وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە.

## ئایا دەتوانین ملیۆنان مرۆڤی تر تێر بکەین؟

رێکخراوی خۆراك و کشتوکاڵی نێودەوڵەتی (فاو) ژمارەی ئەو کەسانەی خۆراکی تەواویان چنگ ناکەوێ لە ساڵی (٢٠٠٠) بە (٨٠٠٠) ملیۆن کەس خەمڵاندووە، ئەو ژمارەیە یەکسانە بە ژمارەی دانیشتوانی جیهان لەو کاتەی ماڵتۆس وتارەکەی لە ساڵی (١٧٩٨) بڵاوکردەوە، تەماشاکە (٢٠) منالی ژێر تەمەنی پێنج ساڵی بەهۆی نەخۆشی پەیوەندیدار بە بەدخۆراکییەوە دەمرن و لەجێگای ئەوان (٢٧٥) منالی تازە لەدایکبوو جێگایان دەگرێتەوە، هەڵبەت هەندێ شتی دڵخۆشکەریش هەن وەك ئەوەی ئەو خەڵکانەی لە ساڵی (٢٠٠٠) خۆراکی تەواویان دەست نەدەکەوت کەمترە لە ساڵانی حەفتاکان.

ئەو شتانەی کە لێیان دڵنیا نین رادەی توانای ئێمەیە لە پاراستنی گەشەی خۆراکی تەواو نەك تەنها بۆ ئەو حەفتا ملیۆن کەسەی ساڵانە دێنە سەر دانیشتوانی جیهان، بەڵکو ئاستی باشترکردنی خۆراك بۆ تەواوی خەڵك، حەقیقەتێك هەیە ئێمە با بزانین ئایا ئێمە ئاوی شیرینی تەواومان هەیە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی ئەو خەڵکە؟ ئەوەش ئێمە بابزانین، چۆن دەکرێ بەو خاڵە بگەین، چۆن دەکرێ سوود لە رابردوو وەربگرین تاکو لەدوارۆژدا یارمەتیمان بدات؟

**ئەو ژمارەیە چەندە کە دەکرێ تێر بکرێن؟**

نزیکبوینەوە لە ئاستی بەکارهێنانی ئەو زەوی و ئاوانەی کە دەکرێ بەکاربهێنرێن، هەروەها توانیمان بەرهەمی یەکەی کشتوکاڵی زیاد بکەین و لە دەستچوون کەم بکەینەوە، ئایا دەتوانین خۆراکی پێویست بۆ (٩) یا (١٠) ملیار خەڵك دابینبکەین، ئەو رادەیەش هەمان ژمارەیە کە چاوەروان دەکرێ لە ناوەڕاستی سەدەی بیست و یەك پێی بگەین، ئێمە مەترسی ئەگەرە ئایندەییەکان دەزانین، بەلاّم بەهای هەوڵدان بریتییە لە توانستی داهێنانی دوارۆژ کە بتوانێ پێویستییەکانمان پڕبکاتەوە، لە ساڵی ١٩٦٨ (پۆڵ ئارلخ) لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (بۆمبی دانیشتوان) لە روونکردنەوەیەکدا دەڵێ: رەوشی دانیشتوانی جیهان لە یەك وشەدا کورت دەکەینەوە، ئەویش ئەوەیە خۆراکی تەواو بەدەستەوە نییە، ئەی بۆ بەیانی چەندمان هەیە؟، ئەمە مەسەلەیەکە دەکەوێتە بەر گفتوگۆ و مشتومڕ، ئەگەر گەشبینەکان راستی بۆچووبن، ئەوە ئاستی گوزەران بەلای کەمەوە بۆ دوو دەیە بەردەوام دەبێت، بەلاّم ئەگەر رەشبینەکان راستی بۆچووبن ئەوە برسیەتی و قاتوقڕیەکی فراوان روودەدات.

ئەوانی تر جاروبار هەوڵیاندەدا توانستی جیهان لە خۆ تێرکردن هەڵسەنگێنن.

(فاکلاف سمیل – VACLAV SMIL) ی جوگرافیناس لە ساڵی ١٩٩٤ بەهەموو ئەو خەملاّندنانەدا چووەوە کە لەسەدەی بیستەمدا ئەنجامدرابوون، کە دەکەوتنە نێوان خەملاّندنەکانی (پۆڵ ئارلخ) کە دەیوت جیهان دەتوانێ دوو ملیار



مرۆڤ تێر بکات و دەرئەنجامەکانی (سایمون) کە دەیوت سنوورێکی بەرز بۆ فەراهەمکردنی خۆراك نییە، زۆرینەی خەملاّندنەکان دەکەوتنە نێوان (٦) ملیار بۆ (٤٠٠) ملیار کەس.

(سمیل) هەندێ حیساباتی ئەنجامدا و وتی: بە باشتربوونی و نزمبوونەوەی لەدەستچوون و گەڕانەوە بۆ خۆراکی تەندروست، دەکرێ رەوشەکە بەرێژەی (٦٠٪) باشتر بکرێ، بەبێ بەکارهێنانی هیچ رووبەرێکی نوێ بۆ کاری کشتوکاڵ.

یەك لە دەرامەتە سروشتییە گرنگەکان، ئەو کەش و هەوایەیە کە کشتوکاڵ لەسەرجەم جیهان پشتی پێ دەبەستێ، زانیارییەکان پەیوەست بە چین و ئەوروپا ئاماژە بەوە دەدەن کە کەش و هەوای خراپ بەشدارە لە بەرهەمهێنانی بەروبوومی لاواز، بەرزبوونەوەی مردن دەبێتە هۆی هێواشکردنەوەی گەشەی دانیشتوان، لە کاتێکدا کەش وهەوای باش کاریگەری پێچەوانەی دەبێ. لە ناوچەی کەناری ئەفریقیای باشووری بیابانی گەورە،، دەبینین (وشکەساڵی) (ماوەیەکی درێژە لە رێژەی باران کەمتر لە ناوەڕاست) کاریگەری روخێنەرانەی هەیە، هەزاران ساڵە ئەو خەڵکانەی لەو ناوچانە دەژین فێربوونە بۆ بەرەنگاربوونەوەی وشکەساڵی و رێژەی مردن خێزانی قەبارە گەورە دروستبکەن.

یەکێك لەو فاکتەرانەی کە بەرهەمی خۆراك لە ئایندە دیاریدەکات و کار دەکاتە سەر تەندروستی مرۆڤیش داڕووخانی ژینگەیە، ئەو پەرەسەندنانەش کە لە ئەنجامی هەوڵەکانی مرۆڤەوە دێنە ئاراوە بریتین لە زۆربوونی بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازی و وزەی پێویستی بەرهەمهێنان، بەڵگەی زۆر هەن ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەگەر بە هەمان شێوە لە داروخاندنی ژینگە بەردەوام بین، توانای پاراستنی ئەم هەسارەیە کەمدەبێتەوە.

وەك (پۆڵ ئاریسۆن) دەڵێ: ئێمە لەناو جەرگەی داروخاندنی ژینگە داین، یا دەبێ لەسەر ئاستی جیهان کار بکەین بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە یا دەبێ

رووبەرووبوونەوەی کارەساتێکی ئابووری زەبەلاح بینەوە کە ئاستی ژیانی هەموومان نزم دەکاتەوە.

راپۆرتی بانکی نێونەتەوەیی لە بارەی رەوشی ئەفریقیا دەڵێ:" پێویستە ولاَتانی رۆژئاوایی ئەفریقیا کە ئابووریان پشت  بە بەرهەمی کشتوکاڵی دەبەستێ، کۆتایی بە بلاَوبوونەوەی هەژاری بهێنین لە میانی گەشەی بەردەوام ئاسایشی خۆراکی فەراهەم بکەن و پارێزگاری لە ژینگە بکەن. هەروەها پێویستە ئەمە لە ژێر سایەی بەرزبوونەوەی رێژەی نەخوێندەواری و گەشەی خێرای دانیشتوان و رێژەی کەمی باران و نارێك و پێك و خاکی بێ پیت و ئستراتیژیەتی گەشەی شار بەدی بهێنرێ، لە ژێر سایەی ئەو رەوشەشدا سیستەمی بەرهەمی کشتوکاڵی تەقلیدی ناتوانێ خۆراك بۆ دانیشتوان فەراهەم بکا، بەبێ روودانی ئاڵوگۆڕی بەرچاو، داروخانی زەوی زۆرتر دەبێ و بنکەی دەرامەتی سروشت دادەروخێ کە بەرهەمی کشتوکاڵی پشتی پێ دەبەستێ.
(بانکی نێونەتەوەیی: ١٩٩٨).



## المراجع

### المراجع بالعربية


١- موسى سمحة، (١٩٩٦)، جغرافية السكان، منشورات جامعة القدس المفتوحة، عمان.

٢- فتحي ابو عيانة، (١٩٩٣)، جغرافية السكان: اسس و تطبيقات، الطبعة الرابعة، دارة المعرفة الجامعية، الاسكندرية.

٣- عباس فاضل، (١٩٨٠) دراسات في جغرافية السكان، منشأة المعارف، الاسكندرية.

٤- محمد الشرنوبى، (١٩٧٨) جغرافية السكان، الطبعة الثانية، الانجلومصرية، القاهرة.

٥- صفوح الاخرس، (١٩٨٠) علم السكان و قضايا التنمية و التخطيط لها، وزارة الثقافة دمشق.

٦- فوزى سهاونة (١٩٩٩) مدخل الى علم السكان، مترجم، منشورات الجامعة الاردنية، عمان.

٧- موسى سمحة، (١٩٨٨) اساليب التحليل الديمغرافي، الطبعة الاولى، الشركة الجديدة للطباعة، عمان.

٨- محمد غلاب و صبحي عبدالحكيم (١٩٧٨) السكان ديموغرافيا و جغرافيا، الطبعة الرابعة، مكتبة الانجلو مصرية، القاهرة.

٩- علي فاعور، (٢٠٠٠) واقع النمو الحضري و التحديات المستقبلية للعواصم و المدن العربية، العدد ٩٨.

١٠- وديع، محمد وديع، (١٩٩٩)، قضايا السكان في الوطن العربي، قراءة في الواقع و التحديات، مجلة التنمية و السياسات الاقتصادية، المجلد ٢ العدد ١.

١١- انور العدل، (١٩٧٨)، السكان و التنمية، الاسكندرية، دارة المعرفة الجامعية.

١٢- يوندباس، (١٩٩٢) السياسات السكانية في الوطن العربي، مكتب اليونسكو الاقليمي للتربية في الدول العربية، عمان.

١٣- يحيى فرحان، موسى سمحة و عبدالفتاح لطفي، (١٩٩٥) البيئة و الموارد و السكان في الوطن العربي، منشورات جامعة القدس المفتوحة، عمان.

١٤- عصام الحناوى، (١٩٩٣) السكان و البيئة و التنمية في العالم العربي، بحث مقدم الى المؤتمر العربي للسكان، نظمهُ صندوق الامم المتحدة للسكان و جامعة الدول العربية و اللجنة الاقتصادية لغربي اسيا، عمان.

١٥- صندوق الامم المتحدة للسكان، (١٩٩٤)، تقرير المؤتمر الدولى للسكان و التنمية، ٣-١٩٩٤/٩/٥، القاهرة.

١٦- صندوق الامم المتحدة للسكان، حالة سكان العالم، (٢٠٠١)، بيويورك.




**المراجع بالانكليزية:**


1- beaujeu- garnier, Jacqueline, (1996) geography of population, nweyork; st, martins press.

2- Clarke, john i. (1984) geography and population: approaches and applications, oxford: pergamon press.

3- hornby, w. and jones, m. (1980) an introduction to population geography. Cambridge: Cambridge university press.

4- gary l. and Robert,p. (1999) population geography, sixth edition, Kendal/ hunt publishing company, iowa.

5- bogue, d. (1969) principles of demography, newyork, john wiley.

6- allen, j. and turner, e. (1998), we the people: an atlas of Americas ethnic diversity. Newyork: Macmillan.

7- boserup, e. (1981) population and technological change: a study of long-term trends. Chicago: the university of Chicago press.

8- erlich, p. and erlich, a. (1990) the population explosion new york: simon & Schuster.

9- castles, s. and miler, m. (1993) the age of migration: international population movements in modern world. New york, the Guilford press.

10- davis, k. and bernstam, m. (1991) resource, environment and population, new york, oxford university press.

11- lee, e. (1966) "a theory of migration" demography, 3: 47-57.

12- myres, n. (1997) "enviroment refugees", population and environment, 19 (2) 167-182.

13- ravenstien, e. (1889) "the laws of migration", journal of the royal statistical society, 52: 241-305.

14- trewartha, g (1969), a geography of population, new york: john wiely.

15- white, p. amd woods, r. (eds) (1980) the geographical impact of migration, London: Longman.